پرۆژەی کۆکردنەوەی کۆی بەرهەمە تیۆرییەکان بەرگی چوارەم




## بەختیار عەلی

# ئاورەکەی ئۆرفیۆس







پڕۆژەی کۆکردنەوەی کۆی بەرهەمە تیۆرییەکان

بەرگی چوارەم

# ئاورەکەی ئۆرفیۆس




بەختیارعەلی




ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: ئاوڕەکەی ئۆرفیۆس
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: کۆمەڵە وتار
ژمارەی چاپ: یەکەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
نرخ: (١٠٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٢٢٢٢)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە.

ISBN: 978-1-63068-960-5



ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

# پێرست

# دەربارەی ئاڵۆزییەکانی سادەیی

زۆر جار تێگەیشتن لە سادەترین و ڕوونترین ئایدیاکان،
لە هەر شتێکی دی سەختترە
فیۆدۆر دۆستۆفسکی

دەڵێن جارێک یەکێک لە مامۆستا ناسراوەکانی فەلسەفە لە ڤییەنا، سیمینارێک دەربارەی هایدگەر پێشکەشدەکات، لە کۆتایی سیمینارەکەدا قسەی ئامادەبووان دێتە سەر ئەوەی بابەتی سیمینار قورس بووە و کابرا بەزمانێکی ئاڵۆزی فەلسەفی بابەتەکەی باسکردوە و کەس هیچ تێنەگەیشتوە. مامۆستای سیمینارساز بۆ ئەوەی بەرگری لە خۆی بکات، ئاماژە بۆ کابرایەک دەکات کە لە ڕیزی پێشەوە بە جل و بەرگی جووتیارانەوە دانیشتووە و زوو زوو لە کاتی سیمینارەکەدا سەردەلەقێنێت و نیشانەی تێگەیشتن و حاڵیبوونی پێوە دیارە و دەڵێت: باوەڕناکەم من بە زمانێکی ئێجگار تەماوی و ئاڵۆز قسەم کردبێت، چونکی هەتا ئەو برا جووتیارەمان کە لە پێشەوە دانیشتووە، بەردەوام سەری بۆ قسەکانم دەلەقاند و دیاربوو باش لە هەموو شت حاڵییە. بەڵام دواتر دەردەکەوێت ئەو جووتیارەی لەوانی تر باشتر لە سیمینارەکە حاڵی بووە و بابەتەکەی زۆر بە دڵ بووە، کەسی هایدگەر خۆیەتی.

هەڵبەت لە سروشتی هایدگەردا بوو بەجلی جووتیارانەوە بگەڕێت.

ئەم چیرۆکە بچوکە لە ئاستە سادەکەیدا پێماندەڵێت کە باوەڕی مرۆڤ بە ڕوخساریی دەرەکی چەندە هەڵەیە و چ دەرەنجامگیرییەکی نادروستی لێدەکەوێتەوە. بەڵام لە ئاستێکی تردا تەعبیرە لە گومان لە سادەیی و فریوخواردنیش پێی، بۆ مرۆڤ ناتوانێت پێشبینی فەیلەسوفێکی گەورە بکات لە جلی جووتیاراندا بگەڕێت. ئایا ئاڵۆزی فەلسەفە لەگەڵ سادەیی جووتیاراندا تەبانایەتەوە؟. ئەم هەڵوێستە کۆمیدییە دەمانبات بەرەو بیرکردنەوە لە پەیوەندی «ئاڵۆزیی» و «سادەیی» لە ژیان و فیکر و سیاسەتدا.

پەیوەندی مرۆڤ بە سادەییەوە هەمیشە پەیوەندییەکی ئاڵۆز بووە، واتە تێگەیشتنی مرۆڤ لە سادەیی هەرگیز سادە نییە و سادەش نەبوو. مرۆڤ بەردەوام لە نێوان عەشقی سادەیی و گومانکردن لە سادەییدا لە هاتوچۆدا بووە. گرفتی ئینسان بەرقەرارنەبوونێتی لە نێوان سادەیی و گومانکردندا لێی، بەوەدا مرۆڤ لە گەردونێکی ئاڵۆزدا لە دایکدەبێت، بێ هیچ ڕێنماییەک دێتە دونیاوە، هیچ ڕوونکردنەوەیەکی باوەڕپێکراو و پێشوەخت بوونی نییە، هیچ کەسێک و هێزێک نییە وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە، لەجۆرە دۆخێکی وەهادا مرۆڤ جگە لەوەی خۆی بۆ وەڵام بگەڕێت، ڕێگایەکی تری نییە. بەڵام زۆرینەی وەڵامەکان کە مرۆڤ وە دەستی دەهێنێت هەمووی جێگای گومانن، هەندێجار جێگای گومانن لەبەرئەوەی سادەنین، کورتنابنەوە بۆ هەندێک یەقین و یەکەی باوەڕ پێکراو و بەڵگەنەویست، هەمیشە شتێک لە ئاڵۆزی دەمێنێتەوە کە جێگای پرسیار بێت، هەمیشە چاڵێکی مەعریفی جێ دەمێنێت کە وەڵام دەستی پێدا ڕاناگات. بەڵام هەندێجاریش گومانمان لە وەڵامەکان بە هۆی ئەوەوە نییە کە هێشتا زۆر ئاڵۆزن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، دەبنە جێگای گومان، لەبەرئەوەی زۆر سادەن. مرۆڤ بۆئەوەی لە دونیا تێبگات پێویستی بە گەشتێکی ئاڵۆز و قووڵە، بەڵام لە کۆتایی ئەو گەشتەدا

هەمیشە پێویستی بە حەقیقەتی سادە هەیە، بە دەرەنجامگیرییەک، کە یەقینێکی ڕۆشن و بێگەردی دەربارەی بوونی خۆی و مانای گەردون پێببەخشێت. دین لە جەوهەردا هەوڵە بۆ ئاسانکردنەوەی ئەو وەڵامە، تا دەگاتە سەر کورتکردنەوەی ژیان و جیهان بۆ چەند ڕوکنێک و چەند وێنەیەک. هەتا خودی زانست و فەلسەفەش بەردەوام یەک شت جولاندونی، ئەویش سادەکردنەوە و کورتکردنەوەی ئاڵۆزییەکانی گەردونە بۆ سەر چەند یەکەیەکی بەڵگەنەویست و بنەڕەتی «چەند ئەکسیۆمێک». سادەیی سیحرێکی قووڵی هەیە، بە جۆرێک ئەو فەلسەفانەی کە کورتدەبنەوە بۆ چەند یەقینێکی سەرەتایی و سادە «وەک مارکسیزم و فرۆیدییەت» زۆر ساناتر لە فەیلەسوفە ئاڵۆزەکان بڵاودەبنەوە. لێرەوە سەیر نییە کە هەتا قورسترین و ئاڵۆزترین فەلسەفەکانیش بەرهەمی گەڕانن بەدوای سادەییدا. فەلسەفەی ئەرستۆ، فەلسەفەی دیکارت، فەلسەفەی فیتگنشتاین، لە قووڵاییاندا گەڕانن بۆ ئەو بنەما سادە و بنەڕەتیانەی کە لە پشتیانەوە ئیدی یەکەکان و ڕەگەزە پێکهێنەکانی حەقیقەت هیچ وردتر و سادەتر نابنەوە. لێرەوە گەڕان بۆ «یەکەی یەکەم»، «حەقیقەتی بنەڕەتی»، «پێکهاتی هەرە سادە» بەشێکی گرنگی کۆی هەموو پرۆژە فەلسەفییەکانە. هەتا فەلسەفەیەکی قووڵ و ئاڵۆزی وەک فەلسەفەی هیگڵ، خاڵی نییە لە سەرەتایەکی سادە و یەکەمین کە بنەمای کۆی تیورە دیالەکتیکییەکەیتی و لە ناکۆکی یەکەمینی نێوان «بوون و عەدەم» دا خۆی دەبینێتەوە.

عاشقبوون بە سادەیی تەنیا خولیای فیکری دینی و فەلسەفی نییە، بەڵکو خولیای هونەریشە. شەپۆلە گەورەکانی هونەر لە ماتیسەوە بەجۆرێکی بەرچاو ڕوویان لە سادەیی کرد، چیتر ئەو وردەکارییە زۆرەی لە نیگاری کلاسیکدا هەبوو، لە هەندێک بەریاندا بەرەو ئاسانییەکی مانادار و بەرچاو گۆڕا، قووڵایی ئەو سادەییە تەنیا لە تابلۆی کەسانی وەک

بیکاسۆ و خوان میرۆ دا دەرنەکەوت، بەڵکو وەک ئاڕاستەیەکی گەورە لای دۆشامپ و ئاندی وارهۆڵ و چەندانی دیش دەرکەوت و ڕەهەندی نوێی وەرگرت. بەگشتی دیوێکی گرنگی هونەری مۆدێرن، دژ بەو بڵندگەراییە دێرینە و مەزنخوازییەی ناو مێژووی هونەر کاریکرد کە هونەر و قووڵییان پێکەوە گرێدەدەدا یان هونەریان تەنیا وەک جۆرێک لە سەنعەتی ئاڵۆز تەماشادەکرد، لەبری ئەوە هونەر بووە شانۆیەک بۆ ئایدیای سادە و پراکتیزەکردنی ئاسان، لێرەوە لای وارهۆڵ کۆمەڵە کارتۆنێکی لەسەر یەک دانراو وەک کارێکی هونەریی نیشاندەردرێت و تایەی پاسکیلێک لای دۆشامب سەردەمێکی نوێ لە مێژووی هونەردا دەکاتەوە.

بەڵام ئەم عەشقە بۆ سادەیی تەنیا خواستێکی تیوریی نییە، واتە هەر ئەوە نییە کە خولیایەک بێت بۆ دۆزینەوەی تەفسیری سادە بۆ شتەکان، یاخود گەڕانەوە بێت بەرەو سادەیی لە هونەردا. بە پێچەوانەوە خواستی سادەیی، خواستێکی زیندەگیانە و پراکتیکیشە، مرۆڤەکان خۆشیان مەبەستیانە سادە بژین، سادە ژیان هەمیشە بەشێک بووە لە خولیا گەورەکانی مرۆڤ. هەڵبەت هەر سەردەمە و فۆرمی تایبەتی بۆ سادەیی هەیە، بۆ نمونە لە کۆمەڵگایەکدا دەشێت دەروێشی بۆ خۆی سەمبولی سادەیی و دەستبەرداربوون لە ئاڵۆزی ژیان بێت. دەروێش لە ڕێگای کورتکردنەوەی پێداویستییە مادییەکانی خۆیەوە، ژیان کورتدەکاتەوە بۆ ڕەهەندە ڕۆحییەکەی، بەڵام لەسەردەمێکی دیدا هیپپیەکان وەک هێزی گەڕانەوە بۆ سادەیی دەردەکەون و ژیان کورتدەکەنەوە بۆ دیوە سروشتییە ڕووتەکەی. واتە نابێت بیرمان بچێت کە سادەیی و ئاڵۆزیی وەک چۆن دوو چەمکی زانستی و مەعریفین، دوو چەمکی کولتووریشن و بەپێی کولتوورە جیاوازەکان دەرکەوتەی جیاوازیان دەبێت.

مرۆڤێک کە سادەییەکەی دەبێتە سەمبولێکی گەردونی، گاندییە. گاندیی

یەکەم کەس بوو کە سادەیی گۆڕیی بۆ چەکێکی شۆڕشگێڕانە، بۆ هێزێکی گەورە کە دەشێت مرۆڤ دژ بە تەواوی سیستم بەکاریبهێنێت. سادەیی لە ئەزموونی گاندییدا تەنها سافکردنی دەرونی ئینسان و پاککردنەوەی نییە، بەڵکو لە هەمانکاتدا چەکێکە دژ بە هەموو ئەو تەماحە مادییە گەورانەی کە دەشێت مرۆڤ بە دەسەڵاتدارانەوە گرێبدات. سادەیی لێرەدا تەنیا ستایلێکی ژیان نییە، بەڵکو چەکێکی گرنگی دژایەتیکردنی ڕۆحی کەپیتالیزمە، کە لەسەر وێرانکردنی سادەیی و دروستکردنی ئاڵۆزیی دەستکرد دروستبووە. چەمکی ژیانی سادە لەگەڵ ڕۆحی کەپیتالیزمی مۆدێرندا ناگونجێت، کە لەسەر قاندانی ژیان بە ئامێر و ئاڵۆزییەکانی دەژی. ئاڵۆزکردنی بەردەوامی ژیان و بارکردنی مرۆڤ بەخواستی نوێ و تەماحی مادیی نوێ، ئەوە ڕۆحی کەپیتالیزمە. ئەم ڕۆحەش هەمیشە دژی سادەییە، چونکە جگە لە ئاڵۆزکردنی خواستەکانی مرۆڤ و هەرچی زیاتر توێدارکردنی نیازێکی تری نییە. ئەوە کارێک دەکات سادەیی لە دونیای مۆدێرندا، لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا هەر بەجەوهەر ڕەگەزێکی ڕۆمانسی و شۆڕشگێڕانەشی تێدابێت کە هەمیشە و هەمیشە بەرامبەر ڕۆحی شتویست و کاڵاپەرستی سیستمکە دەوەستێتەوە.

یەکێک لە سادەترین کاراکتەرەکانی ناو مێژووی ڕۆشنبیریی، فەیلەسوفی گەورە فیتگنشتاینە. ئەو کەسەی جارێک برتراند ڕاسل وەک نمونەی «بلیمەتی پێرفێکت» ناویدەبات. فیتگنشتاین ڕۆژێک دەچێتە کتێبخانەیەک و کتێبێکی تۆلستۆی دەبینێت، لە ژێر کاریگەری خوێندنەوەی ئەودا هەموو بەشە میراتی خۆی لە سامانی گەورەی خێزانە ملیۆندارەکەی دەبەخشێتە خوشک و براکانی و بەشێکی دیشی لەبەرەوە دەداتە هەندێک لە نوسەرانی لە بابەت «تراکل و ڕێلکە و چەندانی تر». فیتگنشتاین دوای خوێندنەوەی تۆلستۆی هەتا واز لە زانکۆ دەهێنێت و لە گەڕانیدا بەدوای سادەییدا دەبێتە مامۆستا لە گوندێکی دووردا،

لەوێ ماوەیەک لە مەتبەخی قوتابخانە و لەسەر زەوییەکە دەخەوێت، دواتریش بەردەوام هەر لە ژووری دارماو و بێ ناو ماڵ و دیکۆردا دەژی، بە جلی زۆر پەرپوت و کۆنەوە دەسوڕێتەوە، هەتا دەڵێن جارێک لە جێگایەکی زۆر بچوک و فەرامۆشکراوی تایبەت بە جلشتندا ژیاوە. بەڵام لای خەڵکی دەڤەرەکە زۆر خۆشەویستبووە، زۆربەی کات بەرپێگاوە بوو تا سەعات و مەکینەی دورمان و ڕادیۆی ماڵان چاکبکاتەوە. ئەم سادەیی و دوورکەوتنەوە گەورەیە لە تەنتەنات و لە ڕواڵەت پەرستی تا کۆتایی ژیانی لەگەڵ فیتگنشتایندا دەمێنێتەوە. دواتر کە لەو قوتابخانەیە دووردەکەوێتەوە دەبێتە یاریدەدەری باغەوان لە ڕەبەنماڵ «دیر»ێکدا، لەوێش لەو ژوورەدا دەخەوێت کە کەرەستەکانی چیمەن و هەرێزبرین، گەسک و شەنچنگاڵی تێدا هەڵدەگیرێت. بەڵام ئیدی لە هەموو لایەکەوە دەخرێتە ژێر گوشارێکی زۆرەوە و هاورێکانی ناچاریدەکەن بگەرێتەوە بۆ کامبردج و لەوێ ببێتەوە بە مامۆستا. ئەوەی لای من لە فیتگنشتایندا زۆر جوانە شێوازی وانە گووتنەوەکانێتی. دەڵێن وانەکانی فیتگنشتاین وەک هەر وانەیەکی تر نەبووە، خودی وانەکان شوێنی بیرکردنەوەی ئەو بوون، ئەو وەک مامۆستاکانی تر بە بابەتێکی ئامادەکراوەوە نەچۆتە کلاسی خوێندن، بەڵکو تەواو قاڵبەکانی خوێندنی تەقلیدی دەشکێنێت و کلاس لای ئەو لە جێگای فێرکردنی حەقیقەتی ئامادە و زانینی تۆمارکراوەوە، دەبێتەوە بە ماڵێکی سادە بۆ بیرکردنەوە. لە وانەکانیدا گەلێک پرسیار بێ وەڵام دەمێننەوە، زۆر جار بە قوتابییەکانی دەڵێت «ئێوە بەدبەختن کە مامۆستایەکی خراپی وەک منتان هەیە» «دەبینن چ کەسێکی نەفام بۆتە مامۆستاتان» «ئاه کە من مامۆستایەکی بێکەڵکم». لە کاتی وانەکانیدا پشووی درێژی بیرکردنەوەی تێدەکەوێت، دەڵێن زۆرجار ماوەی درێژ تەواو بێدەگ بووە و تەنیا بیریکردۆتەوە، وەک یەکێک بەتەنیا بێت و لە ژووری تایبەتی خۆیدا لە شتێک ڕابمێنێت. لە کامبردیجیش لە

ژوورێکی سادەدا ژیاوە کە جگە لە تەختی خەوتنەکەی و مێزێک هیچی دی تێدا نەبووە. بەڵام مرۆڤ تا فەلسەفەی فیتگنشتاین نەخوێنێتەوە تەواو لە ئاڵۆزییەکانی سادەیی تێناگات... ڕەنگە کاراکتەر و فیکری فیتگنشتاینیش بۆ خۆی باشترین سەمبول بن بۆ دیاردەی «ئاڵۆزیی سادەیی». سادەییەک کە لە پشتییەوە ئاڵۆزییەکی قووڵ پەنهانە... ئاڵۆزییەک خولیایەتی بگاتەوە بە ڕوونترین پلەکانی سادەیی.

## نامە دزراوەکەی شاژن

ڤیتگنشتاین هێمایەکی گەورەیە بۆ پێکەوە ژیانی ئەوپەڕیی سادەیی و ئەوپەڕیی ئاڵۆزیی لە یەک بۆتەدا. سادەییەک نییە کە ڕەهەندێکی ئاڵۆزی نەبێت. تۆلستۆی بە ڕوخسار کەسێکی سادە بووە، هایدگەر هەروەها ڤیتگنشتاینیش، بەڵام لە پشتی ئەو سادەییە ڕوکەشەوە، لە پشت ئەو خۆپاراستنە زۆرەوە لە ئاڵۆزیی ڕەواڵەتی، ئاڵۆزییەکی فەلسەفی قووڵ هەیە. لە جەوهەردا پشتکردنە ئاڵۆزییە ڕەواڵەتییەکان هیچ نییە جگە لە پردێک بۆ گەیشتن بە جۆرە ئاڵۆزیی و قووڵییەکی جەوهەریتر کە ڕەواڵەت تێدەپەڕێنێت و سروشتی فرە دیو و فرە لۆچی مرۆڤ دەردەخاتەوە. ئەو مامۆستایەی فەلسەفە کە هایدگەری لە جلی جووتیاراندا نەناسییەوە، مافی خۆیەتی گومان لە هەموو سادەییەکی دی بکات. هەر یەکێک لە ئێمە ڕۆژانە بەلای خەڵکانی ئاساییدا دەڕۆین، کە تەنیا بە پێوەرە تەقلیدییەکان سادەن، بەڵام گەر لە بنەوەڕا نیگایەکی وردتر لە دیدگا و هەستەکانیان بکەین، دەشێت بوونەوەری فرە ئاڵۆزبن. بۆیە سادەیی ڕەواڵەتیش هەمیشە جێگای گومان بووە. ئەم گومانە لە سادەیی، گومانێکی دوو دیوە. واتە سادەیی دەشێت تەنیا فێڵێک بێت، کە لە پشتییەوە نهێنییەکی گەورەتر و ترسناکتر شاردراوەتەوە، یاخود هەر بە ڕاستی سادەیی بێت و هەر بەوجۆرە

بێت کە دەردەکەوێت و شتێکی تر نەبێت لە پشتییەوە جگە لەوەی دەیبینین. گومانی زۆر لە سادەیی مرۆڤ بەرەو دوودڵی و دڵپیسی کێشدەکات، گەر بکەوینە وەسواسی ئەوەی دەشێت هەموو جووتیارێک هایدگەر بێت و هەموو باغەوانێک ڤیتگنشتاین، ئەوە ژیانمان لێ هەراسان دەبێت. چۆن دەکرێت بژین گەر دڵنیانەبین؟ ئەوانەی دەیانبینین شتێک نین زۆر دوورتر و جیاوازتر لەوەی ئێمە بە هەست و فێربوونی خۆمان دەیانخوێنینەوە. واتە لێرەدا بەر کێشەیەکی ڕاستەقینە دەکەوین کە بەرپرسە لە ژمارەیەکی ئێجگار زۆری ئەو کێشانەی تووشمان دێن. بەسەرێک باوەڕهێنانی ڕاستەوخۆ بە سادەیی، دەشێت بەرەو هەڵەی کوشندەمان بەرێت، بەڵام گومانی زۆریش لەسادەیی، دەشێت بەرەو دڵپیسی و دوودڵیمان ڕابکێشێت، بمانخاتە سەر خولیای گەڕان بەدوای هۆکارگەل و قووڵییەکدا کە شتەکان خاوەنی نین. ئەدی چۆن لە نێوان ئەم دوو بەرداشەدا بژین و تێبگەین؟

ئاخۆ مێژووی فیکر دەرهەق بەم کێشەیە چیمان پێدەڵێت. ئاخۆ قەبووڵکردنی سادەیی دەمانگەێنێتە سەر حەقیقەت یان ڕاوەستان لە ئاستی سادەیی شتەکاندا جۆرێکە لە خۆبەدەستەوەدان بۆ گەمژەیی و دژ بە ڕۆحی زانستە؟.

گەرچی دیوێکی فیکر و هونەری مۆدێرن وا خۆی دەردەخات کە ڕوو لە سادەییە، بەڵام دیوێکی دیکەی ئەم فیکرە لە خزمەت سادەکردنەوە و ئاسانکردنەوەی تێگەیشتندا نییە لە مرۆڤ، گەر قووڵ بە هەندێک لە جومگە سەرەکییەکانی فیکری مۆدێرندا بڕوانین، دەبینین کە بە کۆ کارێکدەکەن بەردەوام دەرهەق بە سادەیی مرۆڤ لە گوماندا بین، بەپێی داروین مرۆڤ هیچ نییە جگە لە جانەوەرێک کە تۆزێک زیاتر لە جانەوەرانی تر گەشەیکردوە، بەڵام پەیوەندی و ڕیشەی بە دونیای جانەوەرانەوە ئەبەدی و نەپچڕاون، ئەوەی دەشێت لە هەر ساتێکدا

درندەیەکی ترسناک لە ناخی مرۆڤدا بێتەدەرێ، هەموو براوایەکمان بە رووکەش و بینرا و سادە تێکدەشکێنێت. بەپێی فرۆیدیش لە پشت هەموو کار و کردار و گوفتارێکەوە، بەهانە و بزوێنێکی سێکسوالّیانە هەیە، شارستانییەتیش هیچ نییە جگە لە داپۆشینی ئەو غەریزە سیکسوالّییانە و نەرمکردنیان و پێچانەوەیان لە بەرگی نوێدا، بەوپێیە لە پشت هەموو خەونێک و تێکستێک و نوکتەیەک و هەڵەیەکی زمانەوە نهێنییەکی شاردراوە و غەریزەیەکی پێچراوە و دەمامکدارتر هەیە. بە مانایەکی تر فرۆید هەموو بڕواکانمانی بە سادەیی تێکشکاند، بەپێی ئەو لە پشت سادەترین و بە ڕوکەش بێگوناهترین ڕەفتارمانەوە، خواستی ئاڵۆز و مەبەستی پەنهان ئامادەیە کە مرۆڤ خۆیشی دەرکیان پێناکات. جگە لە فرۆید زمانەوان و بونیادگەراکان ئەو گومانە فرۆیدییەیان قووڵترکردەوە، بەبڕوای ئەوان هەموو تێکستێک جگە لە دیوە گووتراوەکەی دیوێکی نەگووتراوی هەیە کە زۆرجار ڕووکەشی تێکست تەنیا دەمامکێکە بۆ ئەو. بەبڕوای ئەوان هەر ڕستەیەک مرۆڤ دەیدرکێنێت، قسەکەرێکی لە منی قسەکەر پەنهانتر و بەهێزتری لە پشتە، ئەویش بونیادە کولتوورییی و ئەبستیمییەکانە. بەو پێیەش بێت دەبێت هەرگیز باوەڕ بە سادەیی نەکەین، هەقمانە لە گومان و دڵپیسییەکی هەمیشەییدا بژین، نە باوەڕمان بە ڕوکەشی قسە بێت و نە بە ڕەفتاریی ڕووبەڕوو، چونکە هەردەم ئەوەی دەیبینین و یەکەمجار وەریدەگرین هیچ نییە جگە لە پەردەیەکی تەنک بەسەر ڕاستییەکی ئاڵۆزترەوە. ئەوەی لە قسەدا سادە تەماشایدەکەین و بێبایەخ دەیگرین، دەشێت کلیلی نهێنی گەورەی هەڵگرتبێت. ئەوەی بە سادەیی لەوێدا دانراوە، دەشێت هەڵگری نیشانە و کۆدی گەلێک ترسناک بێت.

بەبڕوای من هیچ تێکستێک لە مێژووی ئەدەبیاتدا «هەڵبەت تا ئەو جێگایەی زانیاریی کەم و کورتی من دەرکی پێدەکات و دیویێتی» وەک

چیرۆکـە بەناوبانگەکـەی ئـادگار ئـالان پـۆ «نامـە دزراوەکـە» ڕووبـەڕووی کێشـەی فریـو و مەکـری سـادەیی نەبۆتـەوە. چیرۆکەکـە یەکەمجـار سـاڵی ١٨٤٤ بڵاوبۆتـەوە. ئـەم چیرۆکـە سـاڵانێک شـوێنی نامەگۆڕینەوەیەکـی چڕ و گفتوگۆیەکـی درێـژی نێـوان هـەردوو فەیلەسـوف «جـاک لاکان» و «جـاک دێریـدا» بـوو. دیـارە نیـازی مـن لـە ناوهێنانـی ئـەم چیرۆکە گەڕانـەوە نییـە بـۆ ئـەو گفتوگۆیـە، بەڵکـو ڕوانینـە لێـی وەک چیرۆکێـک کـە هەڵگـری ڕۆحـی گومانـی مۆدێرنـە لـە سادەیی. ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کـۆی خەیاڵـی مۆدێـرن وەک خەیاڵێکـی بەدبیـن دەرهـەق بـە سـادەیی کاریکـردوە، ئـەوەی لای فرۆیـد درەنـگ دەربـارەی سـادەیی دەیزانیـن «ئـەدگار ئـالان پـۆ» پێشـتر لـەو چیرۆکـەدا تەعبیرێکـی قووڵـی لێکـردوە.

دیمەنـی یەکەمـی چیرۆکەکـەی پـۆ لـەلای شـاهانی «بۆدیـۆر» ڕوودەدات، خانمـی شـاژن نامەیەکـی زۆر گرنـگ دەخوێنێتـەوە کـە نابێـت هیـچ کـەس ناوەڕۆکەکـەی بزانێـت و نهێنییەکـی ئاشـکرابکات، لـەو سـاتەدا کـە ئـەو سـەرگەرمی خوێندنـەوەی نامەکەیـە شـا خـۆی دێتـە ژوورێ، شـاژن بـۆ ئەوەی شاهەنشـا گومـان نـەکات نامەکـە بـە سـادەیی دەخاتـە سـەر مێزەکـە و لەوێدا جێیدەهێڵێـت، جێهێشـتنی نامەکـە بەوجـۆرە بـە مەبەسـتی شـاردنەوەیەتی، شـاژن بـەوە نامەکـە لـە شاهەنشـا ونـدەکات، بـەوەی بیخاتـە بەردەسـتی، بـەڵام لـەو کاتـەدا «د» وەزیریـش دێتـە ژوورێ، ئەویـش عەوداڵـی نامەکەیـە و دەیەوێـت دەسـتیبکەوێت، وەزیـر ئـەو فێڵـەی شـاژنی بەسـەردا تێناپەڕێـت، لـە کاتـی قسـەکردندا نامەکـەی شـاژن لـە پێشـچاوی خـۆی هەڵدەگرێـت و نامەیەکـی دی هاوشـێوە دەخاتـە شـوێنی. شـاژن چـاوی لـە هەمـوو شـتێکە، بـەڵام ناتوانێـت هیـچ بڵێـت، چونکە هەر قسـەیەکی نائاسـایی و هەر جوڵەیەک دەشـێت سـەرنجی شاهەنشـا ڕابکێشـێت و بەوەش کار لە کار بترزێت. شـاژن بـۆ ئـەوەی نامەکـە لـە وەزیـر بدزێتـەوە، پەنادەباتـە بـەر سـەرۆکی پۆلیـس و داوای کۆمەکـی لێدەکات، سـەرۆکی پۆلیـس زۆر بـەوردی هـەر یـەک لـە ماڵ

و نوسینگەی وەزیر دەپشکنێت، بەڵام ناکام دەگەڕێتەوە. ناچار داوای کۆمەک لەیەکێک لە دۆزکار «مفتش» ـەکان دەکات بە نێوی «دۆبین». دۆبین سەرەتا پێشنیاری ئەوە دەکات دووبارە ماڵ و نوسینگەی وەزیر بپشکننەوە، بەڵام بەڕێوەبەری پۆلیس دڵنیاییدەکات کە کارێکی وەها گەلێک بێسوودە، چونکە پشکنینەکانی پێشویان بە چەشنێک وردەکاربووە گومانێک لەوەدا نییە کە دووبارەکردنەوەیان دەرەنجامێکی نییە. بەڕێوەبەری پۆلیس دەڵێت «هەموو پاکەتێکمان کردۆتەوە، هەموو دەفتەرێک، وەک پشکنینی ئاسایی پۆلیس تەنیا کتێبەکانمان ڕانەوەشاندوە، بەڵکو کتێب و پەڕە پەڕە هەڵماندراونەتەوە، ئەستووری هەموو بەرگەکانمان تاقیکردۆتەوە، بەجۆرێکی میکرۆسکۆبی پشکنینی وردمان بۆ کردون. تەواو گەیشتووینەتە ئەو بڕوایەی بەرگی هیچ کتێبێک، نوێ نەکراوەتەوە و داخرابێتەوە، ئەوەشمان یاد نەکردوە کە ئەو پێنج شەش کتێبەی لای سەحاف هاتوونەوە ورد بە دەرزییەکانمان بپشکنین».

بەقسەی بەڕێوەبەری پۆلیس بێت، کونجێک و کەلێنێک نەماوە نەگەڕێن، بەڵام هەوڵەکانیان بە هیچ گەیشتووە. دۆبین دوای لێکۆڵینەوەیەک لەسەر کەسایەتی وەزیر «د» دەگاتە ئەو بڕوایەی وەزیر نامەکەی لە جێگایەکی قایمدا نەشاردۆتەوە، بەڵکو بەسادەیی لە جێگایەکدا داینـاوە کە وەها بەرچاوە کەس خەیاڵی بۆئەوە ناچێت نامەیەکی واگرنگ، بە شێوەیەکی وا ئاسان و بێبایەخ دانرابێت. دۆبین خۆی هەڵدەستێت و دەچێت بۆ لای وەزیر، لەسەردانەکەیدا بۆی دەردەکەوێت کە هەر بەڕاستی نامەکەی لە جێگایەکی زۆر بەردەستدا داناوە، بەجۆرێک بێبایەخ لەگەل هەندێک کاغەزی دیدا هەڵیگرتووە. دواتر دۆبین دەچێتەوە ماڵی وەزیر و لە پێشدەم ماڵەکەدا ڕووداوێک و تەقەکردنێک دروستدەکات تا وەزیر سەرقاڵبکات و زەرفەکان دەگۆڕێت و نامە دزراوەکەی دەستدەکەوێتەوە.

چیرۆکەکە لەسەرەتاوە تا کۆتایی دەربارەی «مەکری سادەیی» ـەیە.

سادەیی سەرەتا شاهەنشا فریودەدات، خەیاڵی بۆ ئەوە ناچێت ئەو کاغەزەی شاژن بێبایەخ داینـاوە شتێکی گرنگ بێت، دواتریش بەڕێوەبەری پۆلیس بە هەمان دەردی ئەو دەچێت، بەڵام وەزیر و دۆبین ناکەونە ئەو داوەوە، بەڵکو هەردووکیان سادەیی وەک چەکێکی فریودەر بەکاردەهێنن. سادەیی لێرەدا مەکرباز و فریودەرە. ئالان پۆ پێشەنگی ئەوانەیە کە وادەکەن مالاوا لە سادەیی بکەین. لۆژیکی ئەم چیرۆکە ئاوێنەی لۆژیکی هەموو سەردەمەکانی دواترە، کە لەسەر بڕوا نەکردن بەسادەیی دروستبووە. ئەم لۆژیکە جیاوازە لەو لۆژیکەی گۆتە باسیدەکرد، ئەو لە «سالانی گەڕۆکی ویلهلم مایستەردا» ڕستەیەکی سەرنجڕاکێش دەرهەق بە کێشەی سادەیی و ئاڵۆزیی دەنوسێت، کە لەو ڕۆحەی ئەدگار ئالان پۆوە گەلەک دوورە، گۆتە دەڵێت «ئەوەی سادە بە ئاڵۆزیی، ئاسان بە قورسی ڕوونبکەینەوە، دەردێکە بەسەر تەواوی جەستەی زانستەکاندا دابەشبووە». ئەوەی لای گۆتە دەردە، لای ئادگار ئالان پۆ مەرجی بینین و دەرککردنە. سادەیی فێڵێکە لە فێڵەکانی ئاڵۆزیی کە نابێت بەسەرماندا گوزەربکات، ئەوە بڕوای ئادگار ئالان پۆ و بڕێکی زۆر لە بزاوتەکانی ناو فیکری مۆدێرنە.

نامە دزراوەکەی شاژن، سەمبولی ئەو نهێنییە ترسناک و قووڵەی ناو هەموو شتەکانە کە بە سادەیی وەریاندەگرین و بەسەرماندا تێدەپەڕن. «باوەڕ بە سادەیی مەکەن» ئەوە دروشمی نهێنی نێو بەشی هەرە زۆری فیکر و فەلسەفەی مۆدێرنە. لە ئەدەبیاتی پۆلیسییەوە بیگرە تا کۆی زانستەکان، تا ئابووری نوێ، تا ستایلی ژیانی هاوچەرخ هەموویان پێکڕا سەر بە «هونەری تێکشکاندنی سادەیین»... تادەگەینە جێگایەک دژایەتی سادەیی ڕەهەندی ترسناک وەردەگرێت. سادەیی ڕەنگە فریودەربێت، بەڵام سەردەم و ڕۆژانێک دێنەپێشێ کە پشتکردنە سادەیی کارەساتی گەورە بۆ مرۆڤایەتی دەخولقێنێت.

## پرۆتۆکۆلی حەکیمانی زایۆن

باوەڕنەکردن بە دیوی سادە و ئاسایی شتەکان، لە سیاسەتدا ئەو تیورە گەورەیەی خولقاندوە کە بە «تیوری بەدپلانی ـ موئامەرە» ناودەبرێت. بۆ نمونە کە ترازیدیایەک یان کارەساتێک ڕوودەدات، مرۆڤەکان بە ئاسانی باوەڕ بە تەفسیرە سادەکان ناکەن. لە مرۆڤی سەرەتاییەوە تا مرۆڤی هاوچەرخ، مرۆڤ هەمیشە مەخلوقێکی بەدگومان بووە. ئەوەی مرۆڤ لە هەموو جانەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە و ئاڕاستەیەکی نوێ بە مێژووی دەبەخشێت، بەدگومانییە. مرۆڤ هەمیشە بەدوای دەستێکی نهێنیدا دەگەڕێت لە پشت دیاردەکانەوە، باوەڕ بە ڕووی دەرەوەی شتەکان ناکات، ئەوە ئاسمان نییە کە باران دەبارێنێت و بروسکە دروستدەکات، بەڵکو دەستێکی دیکەیە کە لە پشت بارانەوەیە. بە کورتی یەکێک لە بەرەنجامەکانی گومان لەسادەیی گەڕانی هەمیشەییە بۆ بکەرێکی نادیار. لای مرۆڤی سەرەتایی بیرۆکەی خودا لە بڕواوە بەو دەستە نادیارە سەرهەڵدەدات. گەڕانی بەردەوام بۆ دەستێکی نادیار لە پشت هەموو مێژووی زانست و دین و سیاسەتەوەیە. ئەم خولیایە ئەو پەیوەندییە ناکۆکەی ئینسان بە دونیاوە دەردەخاتەوە، بەسەرێک مرۆڤ ناتوانێت سادەیی شتەکان قەبووڵبکات، بەڵام بەسەرێکی دیش مەیلێکی قووڵی هەیە بۆ هەڵهاتن لە ئاڵۆزیی و ڕاکردنەوە بۆ باوەشی سادەیی. گەر نمونەیەکی زەق وەربگرین بۆ ئەم دۆخە ناکۆکە، ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر بە نمونە دەهێنینەوە، بەشی هەرە زۆری رای گشتی لە دونیادا تا ئێستا باوەڕ بە سروشتی ڕاستەقینەی ئەو ڕووداوانە ناکەن، بەردەوام قسە لە دەستێکی نادیاری تر هەیە، کەس لەوەدا ناوەستێت ڕێکخراوی «القاعدة» بە تاکە گوناهبار بزانێت. بەڵکو بەردەوام خەیاڵمان بۆ «موئامەرەیەکی» گەردونیتر و گەورەتر دەڕوات، بۆ خودی جۆرج

بوش، بۆ سی ئای ئەی، بۆ کارخانە گەورەکانی چەک، بۆ ڕێکخراوێکی نهێنی کە سەرۆکی کۆمپانیاکانی نەوت و سەرۆکی بانک و سیاسییەکان پێکەوە گرێدەداتەوە، بۆ مۆسادی ئیسرائیلی. بە کورتی لە دوای یازدە سێپتەمبەرەوە تا ئەمڕۆ، کەم کەس باوەڕ بە «چیرۆکی یەکەم» دەکات. دیوێکی ئەم باوەڕ نەکردنە دەگەڕێتەوە بۆ گومانی هەمیشەیی مرۆڤ بە «قەناعەتی یەکەم»ـی خۆی. چیرۆکی یەکەم لەسەر هەموو ڕووداوێک، هەمیشە چیرۆکێکی سادەیە، هەمیشە وەک جێگای گومان تەماشادەکرێت، وەک چیرۆکێک کە دەیەوێت چیرۆکێکی تر داپۆشێت. مرۆڤ بۆ هەموو ڕووداوێک هەمیشە زیاد لە چیرۆکێکی هەیە، چیرۆکی یەکەم، چیرۆکی دیوی دەرەوەی ڕووداوەکانە، چیرۆکی قەناعەتی یەکەمە، چیرۆکی دوومیش چیرۆکی باوەرهێنانە بە هۆکارێکی نادیار، بە نیازێک کە لە ساتی یەکەم و خوێندنەوەی یەکەمەوە دەرناکەوێت و دواتر وەک نهێنییەکی دۆزراوە دێتەدەرێ. بۆ نمونە کاتێک کە نەخۆشێک لە بیمارستان لە ژێر نەشتەرکاریدا دەمرێت، کەمجار خاوەن مردووەکان باوەڕ بەوە دەکەن، خودی دەردەکە نەخۆشەکەی کوشتبێت، بەڵکو باوەڕیان وایە پزیشکەکان ئەزموون و تاقیکردنەوەیان لەسەر کردوە، خۆیان فێرکردوە، دەرمانی تازەیان لەسەر جەرباندوە. زۆرجار کە ڕووداوێکی هاتوچۆ لە سیاسییەک یان کەسایەتییەکی گشتی ڕوودەدات، کەس باوەڕ بە ڕێکەوتەکە ناکات، هەمیشە خەیاڵیان بۆ پیلانێکی گەورەتر دەچێت کە ڕووداوەکەی دروستکردوە. لەخەیاڵی ئێمەدا زۆربەی وەخت سیاسییە گەورەکان و گۆرانیبێژە ناودارەکان بە جۆرێکی سروشتی نامرن، هەمیشە پیلانێکی نهێنی زیرەکانە نەخشەی کوشتنی داڕشتوون، بەوپێیە جەمال عەبدولناسر، تورکت ئوزال، یاسر عەرەفات، مایکل جاکسن، مارلین مۆنرۆ... و چەندانی تر لەخەیاڵی ئێمەدا بەسروشتی نەمردون و بکەرێکی گەورەتر و نادیار کوشتوونی. بەڵام دەبێت بڵێم کە

خودی تیورەی «موئامەرە» خاڵی نییە لە سادەییەکی گەمژانە. ڕاستە تیورەکە دەرەنجامی باوەڕنەهێنانی ئینسانە بە سادەیی، بەڵام لەهەمانکاتدا دروستکردنی سادەییەکی دیکەی دەستکردە، کە پرسیار و گومانەکانی دی بە جۆرێک لە تەفسیری سادەی تر دەرەوێنێتەوە. واتە لە ڕاستیدا زۆرجار بەدگومانی لە قەناعەتی یەکەم «یاخود بەدگومانی لە سادەیی یەکەم» تەنیا بەرەو جۆرێکی تر لە سادەییمان دەبات، نەوەک بەرەو تەفسیری وردتر و زانستی تر. مەرج نییە گومان لەسادەیی هەمیشە لە زانستدا دوایی بێت، بەڵکو زۆرجار لە خورافات و ئەفسانەی ترسناکدا دوایی دێت. تیورەی پیلان و بەدنەخشەیی، خۆی هیچ نییە جگە لە جۆرێک لە سادەکردنەوەی کاری سیاسی و پێشکەشکردنی نەخشەسازییەکی بۆ دونیا کە لەگەڵ خەیاڵگەی مرۆڤە سادەکاندا بگونجێت. زۆربەی جینۆسایدە گەورەکانی مێژوو لەسەر بنەمای تاوانبارکردنی قوربانیان بە پیلانگێڕیی داڕێژراون. ڕۆماننوسی ئیتالی ئەمبرتۆ ئیکۆ لە دوا ڕۆمانیدا بەجۆرێکی سەرنجراکێش لەسەر تیورەی بەدپلانی کاریکردوە. ڕۆمانەکە بە ناوی گۆرستانەکەی پراگەوە یە، بابەتی ڕۆمانەکەش «پرۆتۆکۆلی حەکیمانی زایۆن»ـە. ڕۆمانەکە لە ڕێگای کاراکتەری سیمۆن سیمۆنینیەوە کە پیاوکوژ، دژەسامی، دڵـرەش، ساختەکارێکی گەورەیە دەگێڕدرێتەوە. سیمۆنین لەو ڕۆمانەدا بەردەوام بەڕێگایەوە بۆ ئەوەی کار بۆ هێزێکی سیاسی یاخود ڕێکخراوێکی نهێنی ئەنجامبدات، جارێک بۆ جزویتەکان، جارێک بۆ پۆناپارتییەکان، جارێک بۆ دوژمنانی کلێسە، جارێک بۆ ماسۆنییەکان. بەڵام ئەوەی ڕقی گەورەیەتی جووەکانە، ڕقێک کە باپیرەی لە منداڵییەوە تێیدا چاندووە. ڕۆمانەکە باس لە گەورەترین ساختەکاریی مێژوویی لە دونیای نوسین و کتێبدا دەکات. پرۆتۆکۆلی حەکیمانی زایۆن، هیچ نییە جگە لە دۆکۆمێنتێکی دروستکراو لەلایەن ئەنتی سامییەکانەوە دژ بە جوو تا بیسەلمێنن بەدپلانێکی جیهانی گەورە هەیە، و جووەکان

کار بـۆ ئـەوە دەکـەن دەسـت بەسـەر جیهانـدا بگـرن و پرۆتۆکۆلەکـەش بەڵگەی ئـەو پیلانەیـە. خـودی پرۆتۆکۆلەکە شتێکی ساختە و دروسـتکراو و دەسـتکردە، دوور و نزیـک پەیوەنـدی بـە جووەکانـەوە نییـە، بەڵکـو دەسـتکردی کۆمەڵێـک دژەجـووە تـا ڕقێکـی گشـتی و فەزایەکـی دۆزەخـی بـۆ ئـەوان بسـازێنن. ئـەوەی سـەیرە ئەوەیـە ئـەم پرۆتۆکۆلـە سـاختەیە ڕۆڵێکـی زۆر ترسـناک لـە مێـژوودا دەبینێـت، لـە کۆتایـی سـەدەی نـۆزدە و سـەرەتای سـەدەی بیسـتدا بەجۆرێکـی ترسـناک لـە ئەوروپـا بڵاودەبێتـەوە، جـووەکان وەهـا وێنـادەکات کـە لـە پلانێکـی ترسـناکەوە ئـاڵاون و دەیانەوێـت حوکمـی دونیـا بگرنـە دەسـت. نازییـەکان بەجۆرێکـی ترسـناک پرۆتۆکۆڵەکـە دەکەنـە بابەتـی پروپاگەنـدەی خۆیـان و ئـەو دروشـمە دەخەنـە نێـو مەیـدان کـە «هەمووشـتێک خەتـای جووەکانـە». لێـرەوە ڕای گشـتی بەجۆرێکـی ترسـناک دژ بـە جووانـی ئەوروپـا هانـدەدەن. ڕووداوەکانـی ڕۆمانەکـە چیرۆکـی ئـەو سـاختەکارییە گەورەیەیـە، بەشـی هـەرە زۆری پاڵەوانـەکان کاراکتـەری ڕاسـتەقینەن. خـودی کتێبەکـە هەوڵێکـە بـۆ دەرخسـتنی ئـەو لۆژیکـەی لـە پشـت تیـۆرەی بەدپلانییەوەیـە. لۆژیکێـک بـووە مایـەی سـووتاندنی ملیۆنەهـا مـرۆڤ. «پرۆتۆکۆڵـی حەکیمانـی زایـۆن» ئەمـڕۆش لەلایـەن ئیسـلامییە توندڕەو و عەرەبـە ناسیونالیسـتەکانەوە زۆر بەکاردەهێنرێـت، گـوزارەی «پلانێکـی یەهـودی»، بەشـێکی گرنگـی فەرهەنگـی زمانەوانـی عەرەبـی و ئیسـلامییە. گەرچـی ئەمڕۆ ساختەکاری ئـەم پرتۆتۆکۆڵـە تـەواو ئاشـکرایە، گەرچـی هیـچ پلانێکـی جوولەکانـە بـۆ کۆنتڕۆڵـی دونیـا بوونـی نییـە، بـەڵام خەیاڵـی بـەدی مـرۆڤ هەرگیـز لـەوە ناکەوێـت مەترسـییەکان و قەیرانـەکان بگێڕێتـەوە بـۆ هـۆکاری سـادە، بـۆ پیلانێکـی داڕێـژراو لەلایـەن دەسـتەیەک یـان تایەفەیـەک یاخـود ئەتنییەکـەوە. مرۆڤـەکان پێویسـتیان بـە تەفسـیرێکی سـادە هەیـە کـە بـە ڕوکـەش نهێنـی و قـووڵ دەربکەوێـت. تیـۆرەی بەدپلانـی تینووێتـی عەقڵـە سـادە و گەمـژەکان بـۆ نهێنـی و قووڵـی تێـردەکات.

وادەزانن کە گووتیان پلانێکی نهێنی دۆزراوەتەوە، بەوە گەیشتوونەتە سەر جەوهەری دیاردەکە. مرۆڤەکان بە تەفسیری سادەی دونیا ڕازی نابن، بەڵام هەمیشەش توانای خوێندنەوەی ڕاستییان نییە... لەبەرئەوە تیورەیەک دروستدەکەن بە ناوەڕۆک سادە و بە ڕوکەش ئاڵۆز بێت، تیورەی بەدپلانییش، ئەو تیورەیەیە، کە هەم کونجکۆڵی نەخۆشانەی مرۆڤ تێردەکات و هەم سادە و ساکاریشە.

هەموو تیورەکانی پیلان لە دونیادا لە یەک دەچن، بەردەوام کەسێک یان گروپێک هەڵدەبژێردرێت و گوناهی هەموو بەدبەختی و نوشوست و قەیرانەکانی دەخرێتە مل. بەعسییەکان بەر لەوەی ئەنفال بکەن، کوردیان وەک نەتەوەیەکی بەکرێگیراویی پیلانچی ناودەبرد. بەرلەوەش کوردە فەیلییەکانیان وەک تێکدەری بازاڕ و نۆکەری ئێران وێنادەکرد، بڕوایەکیان دەتاشی کە ئەوان پیلانێکی ڕەشی ئێران جێبەجێدەکەن، تا بەوجۆرە لە وڵات دەریانبکەن و دەست بەسەر سامانیاندا بگرن. مرۆڤ بۆئەوەی تاوانی گەورە ئەنجامبدات، پێویستی بە قەناعەتی زۆر سادەیە. مرۆڤ وەک بوونەوەر لە دوودڵییەکی ئەبەدیدا دەرهەق بە حەقیقەتی سادە دەژی. کاتێک باوەڕ بەسادەیی دەکات دەشێت بە هەڵەدا چووبێت، کە باوەڕیشی پێ ناکات دەشێت هەر بە هەڵەدا چوو بێت.

دواجار دەبێت دووبارە بپرسم: سادەیی چییە؟ ئەوە پرسیارێکی ئەبەدییە کە مرۆڤ بەردەوام دەگەڕێتەوە سەری. ئاخۆ دەبێت هەمیشە باوەڕ بە سادەیی بکەین؟ نا، مرۆڤ هەمیشە دەرهەق بەسادەیی بەدگومان بووە، ئەو بەدگومانییەشی بەدیوێکدا زانست و بەدیوێکدا ڕەشەکوژی خولقاندوە. ئاخۆ سادەیی هەمیشە جوانە؟ سادەیی دەشێت وەک تابلۆکانی خوان میرۆ جوان بێت، بەڵام دەشێت وەک هۆلۆکۆست و ئەنفالیش ترسناک بێت. باوەڕهێنان بەسادەیی دەشێت بەرەو گەمژەیمان بەرێت، باوەڕنەهێنانیش پێی دەشێت بەرەو کارەساتمان ڕاکێشێت.

مرۆڤ دەبێت بەوردی مەترسییەکانی بڕوا نەهێنان بەسادەیی بزانێت و مەترسییەکانی تەسلیمبوونیش بە سادەیی تێبگات. سادەیی ستاتیکای خۆی هەیە، وەک چۆن ترسی خۆشی هەیە. عەشقی مرۆڤ بۆ سادەیی لە هونەردا ماتیس دروستدەکات، بەڵام لە سیاسەتدا هۆلۆکۆست... بەبڕوای من ژیان، تێڕامانێکی بەردەوام و گەشتێکی ڕۆژانە و هەمیشەییە لە نێوان بڕوا هێنان و بڕوانەهێنانندا بە «سادەیی». سادەیی دەشێت هەم ڕاستگۆ بێت، دەشێت هەم فریودەر و عەیاریش بێت... بەڵام ئەوەی کە ئاشکرایە، ئەوەیە وەک بابەتێکی گرنگ و ترسناک بەردەوام لە هەموو کونج و کەلێنێکدا ڕووبەڕووی دەبینەوە، دەمانخاتە دوودڵییەوە و دڵنیاشماندەکات... لە زانست نزیکمان دەخاتەوە و بەدیوێکی تریشدا دەشێت لە حەقیقەت دوورمان بخاتەوە. سیحرێکە دەمانکێشێ و ترسێکە دەمانتارێنێت... هەموو ئەو شتانەش پێماندەڵێت، قسەکردن لە سادەیی چەند زەحمەتە، بە ئەندازەیەک دەکرێت بڵێین، لە جیهاندا هیچ شتێک بە ئەندازەی سادەیی خۆی ئاڵۆز نییە.

# نهێنی بێدەنگی مەیمون

مـــن و عـــاریـــــف بەڕاز و نـهێنی دوایـــن
تکام لێکرد: ئەی عاریـف، نهێنی دونیام پێ بڵێ
ئـەو گـوتـی: بێـدەنگـبە و گوێبـگرە بێدەنگیی
ڕاز و نیــهانــی جــیهانــت پــێ بـڵێـت
مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی

تێگەیشـتن لـە بێدەنگـی، یەکێکـە لـە هـەرە قورسـترین کارەکان. بـەرد بێدەنگـە و ئـاژەڵان بێدەنگـن و مرۆڤـیش دەتوانێـت بێدەنـگ بێـت. لـە نێـوان ئـەم سـێ جـۆر بێدەنگییـەدا، جیـاوازی گـەورە هەیـە. تێڕامـان لـە بێدەنگـی بـەرد و شـتە بێگیانـەکان مەبەسـتی مـن نییـە، تێڕامانیـش لـە بێدەنگـی ئـاژەڵان و مـرۆڤ لـە زەمانێکـەوە کـە ئەفلاتـون دیالۆگـی «کراتیلیـۆس» ـی نوسـی و تـا دەگەینـە دوا هەوڵـی گـەورە لـە تراکتاتۆسـەکەی ڤیتگنشـتایندا بابەتێکـی سـەرەکی فەلسـەفە بـووە، بـەڵام ئـەوەی مـن لێـرەدا مەبەسـتمە شـتێکی بچوکتـر و سـنوردارترە، جیاکارییـە لـە نێـوان جۆرێکـی تایبەتـی لـە بێدەنگی کـە لـە ڕاسـتیدا لـە دیکارتـەوە وەریدەگـرم و سروشـتێکی حەیوانـی هەیـە، لەگـەڵ جۆرێکـی دیکـەی تایبەتـی لـە بێدەنگـی مرۆڤانـە، کـە ماناکـەی قـووڵ بـە دۆخـی ڕۆحییـەوە وابەسـتەیە و پلەیەکـە لـە پلەکانـی قووڵبوونـەوە و تێگەیشـتن. جیاکارییـە لـە نێـوان جۆرێـک لـە بێدەنگـی سـەپێنراو، لەگـەڵ

جۆرێـک لـە بێدەنگـی پێویسـت، بێدەنگییـەک کـە سـەرەتای وەرگەڕانـی ڕۆحـی مرۆڤـە لـە جەنجاڵییـە کوشـندەکەی دونیـاوە بـەرە نـاو خـۆی. بێدەنگـی یەکەمیـان ناودەنێـم بێدەنگـی دیکارتـی و بێدەنگـی دووەم نـاو دەنێـم بێدەنگـی کیرکجـاردی.

## بێدەنگی دیکارتی

بـۆ ئـەوەی لـە نهێنـی ئـەم بێدەنگییـە تێبگەیـن، دەبێـت شـتێکی کـەم لەسـەر ژیانـی دیـکارت خـۆی بزانیـن. لـە سـاڵی ١٦٥٠ دا ڕینییـە دیـکارت کـە ماوەیەکـی کـورت بـوو لەسـەر داوەتـی شـاژنی سـوید «کریسـتینا» چووبـووە دەربـاری پادشـایەتی، تـا بنەماکانـی فەلسـەفەی خـۆی بـۆ شـاژنی گەنـج و عاشـق بـە فەلسـەفە ڕوونبکاتـەوە، زۆری نەبـرد تووشـی هەوکردنێکـی تونـد لـە سـییەکانیدا هـات و بـە ماوەیەکـی کـورت گیانـی لەدەسـتدا. چەندیـن سـەدەیە زۆرینـەی دیکارتناسـان بڕوایـان وایـە، هـۆی مردنـە کتوپـڕ و سـەیرەکەی دەگەڕێتـەوە بـۆ لەشـولاری لاوازیـی ئـەو و سـەرما و سـۆڵەی کوشـندەی سـوید، بـەڵام لـەو پـازدە سـاڵەی دواییـدا ئـەو بڕوایـە گۆڕانـکاری گـەورەی بەسـەردا هـات. فەیلەسـوفی ئەڵمـان «تیـۆدۆر ئێبـەرت» سـاڵی ٢٠٠٩ لێکۆڵینەوەیەکـی وردی دەربـارەی مردنـی دیـکارت، بـە ناونیشـانی «مەرگـی پڕتەلیسـمی ڕینییـە دیـکارت» بڵاوکـردەوە، لەوێـدا ئـەو تێزەیـە دەخاتـە ڕوو کـە دیـکارت بەدەسـتی قەشـەیەکی ئۆگسـتینی کـە ترسـی ئەوەی هەبـووە دیـکارت خانمـی شـاژن بخاتـە سـەر بیـروڕای کاتۆلیکـی بـە ئارسـین ژەهرخـوارد کـراوە و کوشـتوویێتی.

لـە ڕاسـتیدا کوشـتنی دیـکارت بەوجـۆرە شـتێکی سـەیر نییـە، واتـە گـەر ڕاسـتبێت و دیـکارت ژەهرخـوارد کرابێـت، ئـەوە کۆتاییەکـی سروشـتی ژیانێکـی ناوازەیـە، ژیانێـک دیـکارت بەشـی زۆری لـە تەنهایـی و خۆشـاردنەوە و هەڵهاتنـدا بردۆتەسـەر. چەنـد سـاڵێک پێـش مردنـی سـەردەمێک دیـکارت

چیرۆکی دادگاییەکەی گالیلۆ دەبیستێت، لە لای خۆیەوە بڕیاردەدات نوسینەکانی پەنهانبکات و بڵاویان نەکاتەوە، چونکە لێکچوونێکی جەوهەری لە نێوان دۆزینەوەکانی خۆی و گالیلیۆدا دەبینێت. دواتر کە کورتەیەکی بۆچوونەکانی چاپدەکات، دەکەوێتە بەر هێرشی دیندار و کڵێسەگەرایان، تۆمەتی ئەوەی دەخەنە پاڵ کە «گومانکارە» و بوونی هەموو شتێک دەخاتە ژێر پرسیارەوە، لەوانە بوونی خودا خۆشی. تۆمەتگەلێک کە دیکارت لە بنەوەڕا ڕەتیاندەکاتەوە. ئەوەی بۆ من جێگای سەرنجە بڕگەیەکی دیکارتە کە «ڤیلهلم ڤایشنێدل» لە وتارێکدا بە ناوی «دیکارت، یان فەیلەسوف لە پشتی دەمامکەوە» هەڵیدەبژێرێت. دیکارت لە وەڵامی نەیارانیدا بە حەسرەتەوە دەڵێت «خەڵکانی دارستان نشین باوەڕیان وایە کە مەیمون جانەوەرێکی زۆر زیرەکە، گەر بیەوێت دەتوانێت فێری قسەبێت، بەڵام ئەم جنسە خۆیان مەبەستیان نییە و نایانەوێت قسەبکەن، ئەوەش بە مەبەست دەکەن تا مرۆڤ نەیانخەنە ژێر کار و بەزۆر ئیشیان پێ نەکەن. گەر بهاتبایە و منیش هێندەی مەیمونان زیرەک بوومایە، هیچ کەس دەرکی پێ نەدەکردم و نەیدەزانی کە کتێب دەنوسم. بەڵام من وەک مەیمون زیرەک نەبووم و وازم لە نوسین نەهێنا، لەبەرئەوە هەموو ئەو هێمنی و ئارامییەم دۆڕاند کە دەکرا بە بێدەنگی خۆم بیپارێزم».

ئەم پەرەگرافەی دیکارت، تراژیدیای هەموو فیکرێکی ڕەسەن دەردەخات. گەر دیکارت دواجار بەو چەشنەش کوژرابێت کە ئەمڕۆ قسەی لێدەکرێت، ئەوە باشتر لە هۆکانی ئەو هەستەی سەرەوە تێدەگەین. ئەو بڕگەیە زۆر زۆر تراژیدییە، پرسیارەکە ئەوەیە: ئەم جیهانە چ مانایەکی هەیە کە یەکێک لە گەورەترین فەیلەسوفەکانی ئاوات دەخوازێت وەک مەیمون بایە و بێدەنگی هەڵبژاردایە و دەرنەکەوتبایە تا ئارامی و هێمنی خۆی لەدەست نەدات. ئەم بێدەنگییەی دیکارت باسیدەکات، بێدەنگییەکە

لـە بێزارییـەوە لـە تێنەگەیشـتن و زوڵمـی مـرۆڤ بـۆ مـرۆڤ هەڵقـولاوە. بێدەنگیـی ئـەو کەسـانەیە کـە دەیانەوێت بیـر و ئایدیـای خۆیـان بـۆ جیهـان ئاشـکرانەکەن، چونکـە دەزانـن ئاشـکراکردنی ئـەو ئایدیانـە چ دەردەسـەرییەک بـەدوای خۆیـدا دەهێنێـت. ئـەم بێدەنگییـە لـە ئازادییـەوە هەڵنەقـوولاوە، بەڵکـو بێدەنگییەکـی قووڵتـرە، بێدەنگـی نائومێدبوونـە لـە جنسـی ئادەمیزاد. ناگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ شـتێکی نییـە بیڵێـت، بەڵکـو دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو بڕوایـەی نوسـین و قسـەکردن دەروازەی یەکەمـی بەدبەختـی و ئـازارن... مـرۆڤ هـەر هێنـدەی قسـەیکرد دەکەوێتـە ژێربـاری سـزا و چاوەدێرییـەوە، لێـرەوە مـرۆڤ گـەر دەیەوێـت ئـازاد بێـت و تووشـی بەدبەختـی نەبێـت، چاکتـرە بێدەنـگ بێـت. ئەمجـۆرە بێدەنگییـە دیکارتییـە شـێوەیەکە لـە خۆپاراسـتن. جۆرێکـە لـە میکانیزمـی بەرگـری کـە مەیمونـەکان چاکتـر لـە مـرۆڤ دەیزانـن و بەکاریدەهێنـن... مەیمـون لـە مـرۆڤ ئاسـوودەترن، ئەوەشـی ئـەو ئاراميیـەی پـێ بەخشـیون بێدەنگییـە. ئەمجۆرە لـە بێدەنگـی تەنیـا لـەو فەزایانـەدا دەژی و لـە دایکدەبێـت کـە فـەرد و زیرەکـی ئـەو نرخێکیـان نییـە، فیکـر ڕاودەنرێـت، دەشـێوێنرێت. ئەمەجـۆرە بێدەنگییەکـی حەیوانییـە، ئـەم شـێوەیە لـە ئاسـوودەگی، کـە دیـکارت ئاواتـی پێدەخوازێت، ئاسـوودەگی مـرۆڤ نییـە، ئاسـوودەگی فەیلەسـوف نییـە، بەڵکو ئاسـوودەگی کەسـێکی ترسـاو و مانـدووە کـە بـەردەوام لـەوە دەترسـێت تووشـی نەهامەتی و دەردەسـەری گـەورە ببێـت. زۆربـەی زۆری بێدەنگییەکانـی دونیـای ئێمـە، ئەمجـۆرە بێدەنگییەیـە، بێدەنگـی دیکارتییـە، بێدەنگـی مەیمونـە، کاتێـک دەیەوێـت خـۆی لـە بـەڵای قسـەکردن ڕزگاربـکات.

## بێدەنگی کیرکجاردیی

لای کیرکجارد جۆرێکی دیکە لە بێدەنگی دەبینینەوە. کیرکجارد حەسرەت لە قسەی خۆی ناخوات و ناخوازێت کە بریا خۆی هیچی نەنوسیبایە. ئەو دەنوسێت « دۆخی ئەمڕۆی جیهان ئەوەیە، هەموو ژیان پێکڕا نەخۆش و خەستەیە. گەر من پزیشک بام و یەکێک پرسی بکردایە: ئامۆژگاری تۆ چییە؟. یەکسەر و بێدوودڵی دەمگووت : بێدەنگی دروستبکەن، مرۆڤەکان بێدەنگ بکەن». هەموو دەزانین کیرکجارد فەیلەسوفێکی دیندار بوو، ئەو باوەری وابوو مرۆڤ بە قاژ و قیژی زۆری خۆی وادەکات دەنگی خودا نەبیسترێت، هاتوهاواری ئینسان، بەسەر دەنگی خودا دا زاڵبووە، ژاوەژاوی خەڵک وادەکات، مرۆڤەکان نەتوانن گوێ لە ئاسمان بگرن. لێرەوە دەیگووت لە ناو ئەو دەنگەدەنگەدا هەتا گەر دەنگی خوداش ببیسترێت، لەوە دەکەوێت دەنگی خودا بێت. لەم سەردەمەدا ناتوانین ئەم قسەیەی کیرکجارد بە دیوە دینییەکەیدا وەربگرین، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە دەنگی هیچ شتێکی بڵندگەرا و هیچ پەیامێکی دیکە کە نەچێتە قاڵبی ئەو برە گەورەیەوە لە ژاوەژاو بە باشی نابیسترێت. لەم سەردەمەدا کە دەنگە دەنگ بۆتە هۆیەک لە هۆکانی پیسبوونی ژینگەی رۆحی ئینسان، پێویستی ئینسان بە دروستکردنی بێدەنگی پێویستییەکی گرنگە، لە جیهانی ئەمڕۆدا کە میدیا هێزی یەکەمە، کە لە چرکەیەکدا هەزاران دەبەنگ لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و ڕادیۆوە دەدوێن، ڕۆژانە ملیۆنەها بابەتی بێنرخ چاپدەکرێت و ملیۆنان تەن لە کاغەز لە مەبەستی هیچدا سەرفدەکرێت، دۆخی ئەمڕۆی جیهان پێکڕا ئەو قسەیەی کیرکجاردمان دێنێتەوە یاد. ئەم بێدەنگییەی دووەمیان، بێدەنگی ترس نییە، بێدەنگی ڕاکردنە لە جۆرە دەنگ و شێوە قسەکردنێک کە بۆتە ژاوەژاوێکی رووت، بۆتە قسەکردنێک تێیدا هەموو دەنگێک وندەبێت، بەرز و نزم نامێنێت، جوان دەبێت بە ژێر ناشیرین و مۆسیقا دەبێت بە ژێر زرمەی ماشێن و ئامێرەوە. هاواری کیرکجارد بۆ بێدەنگکردنی مرۆڤ جیاوازە لە هاواری

دیکتاتۆرەکان، جیاوازە لە بێدەنگی مەیمون. بێدەنگی مەیمون خەفەکردنی مرۆڤە بۆ تواناکانی خۆی، لێرەدا بێدەنگی پەناگایە، شوێنی خۆونکردنە، جێگای خۆشاردنەوەیە. بەڵام ئەم بێدەنگییەی تر، هەوڵێکە بۆ پاککردنەوەی ژینگەی ڕۆحی مرۆڤ لە دەنگە زیادەکان. ئەوەی کیرکجارد هاواردەکات بێدەنگی دروستبکەن، بەو مانایە دێت کە گوێ لە دەنگە بڵند و تایبەتی و پڕ ماناکان بگرن. تێزەکەی کیرکجارد کەمتازۆر قووڵکردنەوەی تێزەیەکی بلوتارخە کە دەیگووت «ئێمە لە مرۆڤەکانەوە فێری قسە و لە خوداکانەوە فێری بێدەنگی دەبین». کیرکجارد بێدەنگی بە سیفەتێکی یەزدانی دەزانێت، خودا بێدەنگەو ئەوە تەنیا مرۆڤە کە زۆر قسە دەکات، هەر لێرەشەوەیە کە مەولانای ڕۆمی پێیوایە گوێگرتن لە بێدەنگی، راز و نیهانی جیهان ئاشکرادەکات. گەر ئێمە باوەرمان بە رەهەندە دینییەکەی ئەمجۆرە لە بێدەنگیش نەبێت. لەو بێدەنگییەدا گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ جەوهەری بیرکردنەوەی ساف دەبینین، بیرکردنەوەیەک دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ شێوە قووڵەکانی تێڕامان. بێدەنگی کیرکجاردی بەرجەستەکەری هەوڵی مرۆڤە بۆ دوورکەوتنەوە لە شتە تێپەڕ و بێمانا و ڕۆژانەکان... دەنگ لە دونیای ئەمڕۆدا پەیوەندییەکی قووڵی بە ناوەوەی مرۆڤ و بە بەها گرنگەکانەوە نەماوە، لێرەوە بێدەنگی کیرکجاردی، بێدەنگییەکە مرۆڤ لە جیهانی دەرەوە بەرەو ناوەوە کێش دەکاتەوە، لە ئێشی میکانیکی و ڕۆتینییەوە بەرەو مەعریفە و تێڕامان دەمانباتەوە، لە تێپەڕەوە بەرەو جاویدان دەمانگێڕێتەوە.

کێشەی دونیای ئێمە ئەوەیە، لێوان لێوە لە بێدەنگی دیکارتی، ئەو بێدەنگییەی دەمانباتەوە سەر خەفەبوون و چاونوقاندن و تاوان یان هیچ نەبێت نائومێدی و کەمتەرخەمی، هێدی هێدی خاڵیش دەبێتەوە لە بێدەنگی عاریفانی وەک کیرکجارد و مەولانای ڕۆمی. لە نێوان بێدەنگی خۆشاردنەوە و بێدەنگی بیرکردنەوەدا، مرۆڤی هاوچەرخ بەردەوام بێدەنگی خۆشاردنەوە و خۆ دزینەوە هەڵدەبژێرێت.

# دەربارەی نهێنی «نهێنی»

قەشەنگترین شت، پڕ نهێنی ترینە
ئەنشتاین

گەورەترین درۆیەک مرۆڤ لە ژیانیدا دەیکات، ئەوەیە کە دەڵێت «من هیچ نهێنییەکم نییە». مرۆڤ خۆی نهێنییە، دروستکەری نهێنییە، عاشقی نهێنییە، بە نهێنیش گەمارۆدراوە. مرۆڤ کە بەتەواوی نازانێت لە ناخی خۆیدا چی دەگوزەرێت، کە نازانێت لە ناخی مرۆڤەکەی تەنیشتیدا چی دەگوزەرێت، کە نازانێت لە جیهانی نزیک و دووریدا بە تەواوی چی بووە و چی دەبێت، بەوە خۆی لە نهێنی دونیا دەپارێزێت، کە لەیادیبکات، دانی پێدا نەنێت، فەرامۆشیبکات. مرۆڤ هەموو ڕۆژێک کە لە بەیانییەوە هەڵدەستێت سەرقاڵی شیکردنەوەی نهێنی، دروستکردنی نهێنی، بیرکردنەوەیە لە نهێنی. نە لە هوشیاری و نە لەخەودا لە دەست نهێنی ڕزگاری نابێت، هەر شتێک کە دەیزانێت، هێشتا بەشی گومانێکی گەورە نهێنی تێدا ماوە. هەر شتێکیش کە نایزانێت وەک دەستێکی ترسناک، وەک تارمایی تاریک بەدوایەوەیەتی و بەدوایەوە دەبێت. مرۆڤ تەنیا لەو ساتەدا بۆتە مرۆڤ کە هەستیکردوە، نهێنییەک هەیە دەبێت تێیبگات، تەنیا لەو ساتەشدا درێژە بە مرۆڤبوونی خۆی دەدات کە بزانێت، هەرگیز نهێنی کۆتایی نایەت. مرۆڤ کە بیری لە نهێنی نەکردەوە دەگەڕێتەوە بۆ

دۆخـی ئـاژەڵ، بـەڵام گـەر پێشـی وابـوو هەمـوو نهێنییـەکان دەزانێـت بـەوە خـۆی دەخاتـە جێـگای خـودا و دەبێـت بـە بوونەوەرێکـی ترسـناک.

بلیـز پاسـکال لـە هـەر فەیلەسـوفێکی دی زیاتـر گوزارشـتی لـە گەورەیـی سـنووری ئـەو نهێنیانـە کـردوە کـە گەمـارۆی مـرۆڤ دەدەن. ئـەو دەنوسـێت «هەمـوو شـتەکان لـە هیچـەوە هاتـوون و بـەرەو ئەبەدییـەت خراونـەڕێ، کـێ دەیەوێـت دوای ڕەوتـی سـەیر و سەمەرەیان کەوێـت؟ ئێمـە هەرگیـز ناگەینـە جەوهـەری ڕاسـتەقینەی شـتەکان، ئـەوەی دەیزانیـن تەنیـا سـێبەرێک یـان دەرکەوتەیەکـی ڕووکەشـی جەوهـەرە. ئێمـە بـۆ هەتاهەتایـە دوودڵیـن لـەوەی بزانیـن شـتەکان لـە کوێـوە هاتـوون و بـۆ کـوێ دەچـن، مـن بـە هـەر لایەکـدا دەڕوانـم جگـە لـە تاریکـی هیچـی تـر نابینـم، سروشـتیش جگـە لـە بەهانـەی دوودڵـی و نائارامـی هیچـی دیـم پێشـکەش نـاکات». بـەڵام کێشـەی سـەرەکی لەوەدایـە کـە نهێنـی تەنیـا کاتێـک مانـای هەیـە کـە نهێنییـەک بێـت بـۆ مـن. نهێنـی هەتـا گەورەتریـن و گشـتیترینیشـیان «بـۆ نمونـە: نهێنـی بوونی خودا» هـەر مرۆڤـە و لـە ڕوانگەیەکـەوە سـەیریدەکات، بەجۆرێـک وادەردەکەوێـت وەک نهێنییەکـی شەخسـی و تایبەتـی ئـەو بێـت، هەتـا گەورەتریـن نهێنیـش کاتێـک دەبێتـە نهێنـی کـە مۆرکی نهێنییەکی شەخسـی وەربگرێـت، چارەسەرییەکەشـی زۆرجـار چارەسـەرێکی تایبەتـە. کریسـتیان فریدریـش هێبـل، درامانـوس و هاوڕێـی نزیکـی هاینریـش هاینییـە. لـە سـاڵی ١٨٣٧ دا و لـە یاداشـتەکانیدا شـتێک دەنوسـێت کـە لـە زۆر شـوێندا بـە نمونـە دەهێنرێتـەوە. هێبـل دەڵێـت «مـرۆڤ، هەرچـی بێـت و هـەر کـەس بێـت، کاتێـک دەڕوات، لەگـەڵ خۆیـدا نهێنییـەک دەبـات، کـە بەحوکمـی پێکهاتـە ناوازەکـەی، تەنیـا ئـەو دەیتوانـی بیدۆزێتـەوە و ئاشـکرابیکات. لـە دوای ئەویـش هیـچ کەسـێکی دی ناتوانێـت بـەو کارە هەسـتێت». بۆچوونەکـەی هێبـل جێـگای تێڕامانـە... بـۆ لەگـەڵ مردنـی هەمـوو مرۆڤێکـدا نهێنییـەک دەمرێـت کـە جگـە لـەو کەسـی دیکـە نەیدەتوانـی ئاشـکرابیکات؟. چونکـە نهێنـی شـتێکی خودگەرایـە، واتـە

سوبێکتیڤە «زاتییە» نەوەک شتێکی بابەتی «ئۆبێکتیڤ» بێت یاخود بوونێکی واقیعی ڕووتی هەبێت، ناساندنی نهێنی وەک شتێکی سوبێکتیڤ جەوهەری ئازادی تێڕامان و بیرکردنەوەیە... هەموو مرۆڤێک دەبێت مافی ئەوەی هەبێت، بە ڕێگای تایبەتی خۆی، بۆ وەڵامی ئەو نهێنییە بگەڕێت کە خۆی هەڵیدەبژێرێت. پێمبڵێ ژیانی خۆت بۆ دۆزینەوەی چ نهێنییەک تەرخانکردوە، پێتدەڵێم تۆ کێیت. واتە نهێنی شتێک نییە لە ناو جەوهەری شتەکاندا بێت، بوونێکی بابەتی ڕەهای هەبێت. نهێنی... هەر نهێنییەک بێت، لە نهێنییە گەورەکانی گەردونەوە تا نهێنییە تایبەتی و بچوکەکانی خۆمان، نهێنییەکە لە چاوی یەکێکەوە، لە ڕوانگەی تایبەتی یەکێکەوە. ئەوەی مانای بوونی من دەستنیشاندەکات، ئەوەیە: سیحری چ نهێنییەک من دەبات. لە ڕۆمانەکەی هێرمان میلڤیلدا سیحری نەهەنگێک کابتن ئەهاب بەرەو قووڵایی و مردن دەبات، لە ڕۆمانی ئاوریشمی ئەلیساندرۆ باریکۆدا ئەو نهێنییە قووڵە لە نیگای ژنێکدایە. بە مانایەکی تر نهێنی هەمیشە «خودڕەنگە-سوبێکتیڤە». لێرەدا قسەیەکی بایۆلۆژیناسی ئەڵمان «جاکۆب یۆهان فۆن ئۆیکسکویل» وەک نمونە نرخێکی گرنگی هەیە، ئەو لە کتێبی «بایۆلۆژیای تیوریدا» دەنوسێت «هەموو واقیعییەتێک دەرکەوتەیەکی سوبێکتیڤە، دەبێت ئەمە ژێرخانی هەموو زانستێک پێکبهێنێت، هەتا لە بواری بایۆلۆژیاشدا، مرۆڤ دەتوانێت بێ ئاکام هەموو دونیا لە دوای هۆکاری ناسوبێکتیڤ بگەڕێت. مرۆڤ هەر چۆنێک بێت و بڕوات بەر شتگەلێک دەکەوێت، کە لە پێکهاتیاندا قەرزاربارى سوبێکتن» تا دەگاتە ئەوەی بڵێت «دەبێت لە پشت سوبێکتەوە، نەوەک ئۆبێکتەوە بۆ نهێنی دونیا بگەڕێین».

لە چیرۆکە جوانەکەی سانت ئۆگزۆپێریدا «ئەمیرە بچکۆلەکە» دێڕێکم دێتەوە یاد کە خزمەتی هەمان مەبەست دەکات. لەوێدا هاتووە «ئەمەیە نهێنی من، نهێنییەکی زۆر سادەیە، مرۆڤ تەنیا بە دڵ جوان دەبینێت،

شتە جەوهەرییەکان چاو ناتوانێت دەرکیانبکات و بیانبینێت». بەو پێیە، واتە بە بۆچوون و تێگەیشتنی هەر یەک لە هێبل و ئۆیکسکویل و سانت ئۆگزۆپێری بێت، نهێنی هەردەم سوبێکتیڤە. ئەوەی پێیدەڵێین نهێنی هەمیشە نهێنییەکە لە چاوی منەوە، بە پێی کۆمەڵێک تێڕوانینی تایبەتی من، کە دەشێت بەتەنیا لای من نهێنی بێت... یان گەر لای هەمووانیش نهێنی بێت، لای هەر کەسە و سروشتێکی تایبەتی هەیە کە جیاوازە لەوی دی. نهێنی مەتەڵێک نییە لە نێو شتەکاندا نوسراوبێت، بوونێکی دانراو نییە، هێڵێک نییە کە لە نێوان ئێمە و جۆرە زانینێکدا کێشرابێت. واتە گەر لە مێژووی تێڕامانی مرۆڤ بۆ جیهان وردبینەوە، بەر ئاڵۆزی جیهان دەکەوین، بەڵام بەر نهێنییەک ناکەوین کە خۆی بەیان نەکات، نهێنی پەیوەندی بەجۆری پەیوەندی مرۆڤەوە لەگەڵ بابەتەکەدا هەیە، وە پەیوەندیشی بە سنووری زانینی مرۆڤەوە هەیە، بە تەماحییەوە بۆ زانین.

نهێنی لەو کاتەدا دروستدەبێت کە مرۆڤ دەیەوێت شتێک بزانێت، بەر لەو خواستە سەرەتاییە، هیچ نهێنییەک بوونی نییە، مرۆڤ گەر نەیویست هیچ بزانێت، نهێنی بوونی نامێنێت. نهێنی زادەی ئەو ساتەیە کە مرۆڤ بە خۆی دەڵێت «دەمەوێت بزانم». ئیرادەی زانین، هەمیشە ئیرادەیەکی سوبێکتیڤە، ئیرادەیەکی کێشەسازە، خۆی پرسیار دروستدەکات، لە پشت هەموو هەوڵێکەوە بۆ زانین «من»ێک هەیە... سروشت پرسیار لە ئێمە ناکات، ئاسمان پرسیار لە ئێمە ناکات، خودا پرسیار لە ئێمە ناکات، مێژوو پرسیار لە ئێمە ناکات... ئەوە مرۆڤە کە پرسیار لە خۆی دەکات. لێرەوەیە هەموو نهێنییەکی گەورەی دونیا، مۆرکێکی خودگەرای هەیە. هەموو نهێنییە گشتییەکانیش سەرەتا نهێنین بۆ کەسێک یان بۆ تاقمێک و دواتر دەبن بە نهێنی گشتی. بەڵام کێشەکە لە رووە فەلسەفییەکەیدا لەوە قووڵترە، واتە ڕاستە نهێنی هەمیشە نهێنییەکی سوبێکتیڤە، ڕاستە نهێنی تەنیا بۆ هوشیارییەکی شەخسی دیاریکراو نهێنییە، بەڵام کێشەکە

لە ڕووە ئەبستمۆلۆژییەکەیدا لەوە ئاڵۆزترە. ئاڵۆزییەکەشی لەوەوە دەست پێدەکات کە مرۆڤ لە هوشیاری خۆشی بەگومانە. نهێنی تەنیا لەو شتەدا نییە کە دەیبینین، واتە تەنیا لە «بابەت- ئۆبێکت» دا نییە، بەڵکو هەر خودی بیرکەرەوە و ڕامانکار«واتە سوبێکت»، ئەویش بۆ خۆی نهێنییەکی گەورەیە. هەر ئۆبێکت نهێنی نییە بۆ سوبێکت، بەڵکو گەورەترین نهێنی بۆ سوبێکت، سوبێکت خۆیەتی. نهێنییە گەورەکان لە یەک پرسیاری سەرەکیدا کورت نابنەوە: ئایا مرۆڤ چی دەزانێت؟. بەڵکو ئەوەشی دەچێتە سەر، ئاخۆ چۆن دەیزانێت؟. لەم ڕووەوە کانت کێشەیەکی ئەبستمۆلۆژی قووڵی جوڵاند کاتێک قسەی لە بوونی «هوشیارییەکی ترانسدنتالیستی» کرد، واتە قسەی لە هوشیارییەک کرد دەکەوێتە پێش «ئەزموون» ـەوە. بۆ نمونە بە پێی کانت هەستی مرۆڤ بە کات و شوێن پەیوەندیان بە ئەزموونەوە نییە، مرۆڤ کە لەدایک دەبێت، هوشیارییەکی پێشوەختی بە کات و شوێن هەیە، بێئەوەی ئەزموونی لەگەڵ کات و شوێندا هەبێت. بەمجۆرە هوشیاری مرۆڤ خۆی دەبێتە شوێنی نهێنییەکی گەورەتر. ئاخۆ هوشیاریی ئێمە «قاڵبێکی پێشوەخت داڕێژراوە»، وەک کانت دەڵێت، یاخود هیچ هوشیارییەکی ترانسدنتالیانە بوونی نییە و هیچ شتێک لە حوکمی ئەزموون ناچێتە دەر. دروست لەم خاڵەشدا گەورەترین تراژیدیای مرۆڤ دەست پێدەکات، کاتێک خودی ئەو کەرەستانەی هەمانە و بە نیازین لە ڕێگایەوە نهێنی بپشکنین، خۆیان دەبن بە نهێنی. واتە نهێنییەکە لەوە دەردەچێت نهێنی بینراو و نەبینراو، ڕوون و ناڕوون بێت و دەبێتە پرسیار لەوەی ئاخۆ چاو خۆی بە دروستی دەبینێت، هوشیاریی بە دروستی تێدەگات و چۆن دەکرێت دڵنیابین کە بەڕاست بینیومانە و تێگەیشتووین؟.

ئەوەی مرۆڤ زۆر ئازاردەدات ئەو نهێنییانە نییە کە لە جیهانی گەورەدا، یاخود لە گەردوندا نایاندۆزێتەوە، ئەوەی زۆر ئازاری دەدات دەستەوەستان

بوونێتی لە باوەڕهێنان بە کاراکتەر و بە چاو و بە تێگەیشتنی خۆی.

ئەم گومانە لە مرۆڤ، گومانێکی دوو دیوە، هەمیشە چەند لقێکی فەلسەفی گەورەی لێدەبێتەوە. بەسەرێک گومانی دووروودرێژی دیانەتەکانمان لە مرۆڤ هەیە، بەوەی مرۆڤ خۆی ناتوانێت هیچ نهێنییەک بزانێت، تەنیا ڕێگای بۆ زانینی قووڵ و ڕاستەقینە «وەحی، ئیلهام، نبووەتە»، واتە ئەو زانینانەیە کە یەکێکی دی، هێزێکی دەرەدونیایی «ماورائي» فێریدەکات و پێیدەڵێت. بەپێی تێڕوانینی دینی گەر شتێک هەبێت ناوی «مەعریفەی ئینسانی» بێت، دەبێت ڕیشەکانی بگەڕێتەوە بۆ ناو «مەعریفەی ئیلاهی»، ناو وەحی و ئیلهامی خودابەخش و نبوەت، بەم پێیە سنووری زانستی مرۆڤانە ملکەچی ئەوجۆرە گوزارشتەیە کە خودا هەم شێوەکەی و هەم مەبەستەکەشی دیاریکردوە. دین بە درێژایی مێژوو لەگەڵ زانستدا ناتەبا ماوەتەوە، هەوڵەکانی ئاشتکردنەوەی زانست و دین هەمیشە هەوڵی ڕێژەیین و لە جێگایەکدا دەوەستن. دین و زانست لە هەر چییەکدا تەبابن، لە مەسەلەی «سنووری مەعریفەی ئینسانی» و «سەرچاوەی ئەو مەعریفەیەدا» تەبانابن. زانست ناتوانێت بانگەشەی ئەوەبکات کە سەرچاوەی خودایی هەیە، دینیش ناتوانێت لە سەرچاوەی ئیلاهی جیاببێتەوە، ئەم جیاوازییە هەمیشەییە و چارە ناکرێت.

بەڵام جۆرە زانستێکیش هەیە کە پێیوایە مرۆڤ لە هەقی هەموو نهێنییەک دێت، گەورەبوونی ژمارەی زانستەکان و وردبوونەوەی زانست بۆ بەشی زۆر بچوک و خولیای زۆر ورد، گرێدراوی ئەو ڕاستییەیە کە مرۆڤەکان پێکڕا یەکجۆر نهێنی نایانجوڵێنێت، نهێنی کیمیاگەرێک چ بایەخێکی لای شاعیرێک یان دەروونناسێک نییە، کایە جیاوازەکانی زانست و تێڕامان، دەرگای جیاوازن بۆ سەر هەرێمی پڕ نهێنی جیاواز. زۆری دینەکان گوزارشتن لە پەرتبوونی مرۆڤ، تەعبیرن لە بێکەسی مرۆڤ لەسەر زەوی، تەعبیرن لە نەبوونی دەنگێکی گەردونی کە مرۆڤ بدوێنێت،

زۆری زانستەکانیش تەعبیرن لەوەی مرۆڤ، وەک بوونەوەرێکی تەنیا و بێ کۆمەک، هەرگیز یەک پرسیار و یەک نهێنی نەبووە، نهێنی لای ئەو لە جێگایەکدا نییە، هەموو شوێنێک نهێنییە و مرۆڤیش جگە لەوەی کاری ڕۆشنکردنەوەی بەردەوامی ئەو نهێنیانەیە بۆ خۆی مەبەستێکی تری نییە، گەورەیی زانستەکان و زۆری دینەکان دواجار یەک شتمان پێدەڵێن، مرۆڤ لەسەر زەوی نییە بۆ ئەوەی خۆشبەخت بێت، بەڵکو بۆئەوەی تێبگات. مرۆڤ بەدرێژایی مێژووی خۆی هێندەی شەڕی تێگەیشتن و بڕواکانی کردوە، شەڕی خۆشبەختی نەکردوە. خۆشبەختی هەمیشە خاڵێکی لاوەکی بووە لە بەردەم تێگەیشتندا. لێرەدایە ڕەوایە بپرسین: ئایا جگە لە «پرەنسیپی لەزەت» یاخود «پرەنسیپی واقع» کە فرۆید دەستیان دەخاتە سەر، پرەنسیپێکی تر نییە ناوی «پرەنسیپی زانین» بێت کە لەسەرەتاوە، لە ساتەوەختی یەکەمەوە مرۆڤ بەدوای خۆیدا کێشدەکات؟. وەڵامەکەمان بۆ ئەم پرسیارە هەرچییەک بێت، ناتوانێت ئەوە فەرامۆشبکات کە ئەو بکەرە سەرەکیانەی فرۆید لە داڕشتنی تیورەکەیدا بەکاردەهێنێت، پاڵەوانی ناسچنۆک «فزولی» و زانینخوازن کە بەر لەوەی بیانەوێت لەزەت بەرن دەیانەوێت تێبگەن، ئۆدیبۆس دەیەوێت تێبگات، هاملێت دەیەوێت تێبگات... هەردووکیان نهێنی شکێنن، زانینی حەقیقەتیان لە خۆشبەختی خۆیان لا گرنگترە، فاوستی گۆتەش هەر لەسەر هەمان هێڵ دەڕوات و زۆرینەی پاڵەوانە گەورەکانی تری ئەدەبیش بەدوور نین لەو خولیایە.

بەڵام مرۆڤایەتی هیچ کات یەک ئاراستەی گشتی بۆ تێگەیشتن نەبووە، سەپاندنی یەک نهێنی «یاخود یەکجۆر نهێنی» بەسەر هەموو خواستەکان و کولتوورەکان و عەقڵەکاندا، بەسەپاندنی یەک وەڵام بەسەر تەواوی دونیادا کۆتایی دێت. ئەوەی زانست لە مێژووی مرۆڤدا کردویەتی پرۆسەیەکی ئاڵوگۆڕی گەورەیە، زانست مرۆڤی لەوە ڕزگارکرد تەنیا

خەریکی پرسیاریی ئەودیو دونیایی بێت، بەڵکو سەرنجی بەرەو هەزاران وردە نهێنی تر ڕاکێشا. ترسناکە مرۆڤ هەمیشە بپرسێت چی لەو دیو دونیاوە هەیە و نەپرسێت چی لەم دونیایەدا دەگوزەرێت، نەپرسێت خۆی کێیە و لە چی دروستبووە و چی لە ناودایە. هەڵبەت ئەوە بەو مانایە نییە کە «نهێنی ئەودیو دونیایی - ماورائي -» نرخی نییە... بەڵکو بەو مانایەیە، دیلکردنی عەقڵ بەجۆرێک، وەک ئەوەی تەنیا لە خزمەت ڕۆشنکردنەوەی یەکجۆر نهێنیدا بێت، ترسناکە.

ڕزگارکردنی مرۆڤ لە «یەک نهێنی گشتی - نهێنی سەنتراڵ - شا نهێنی»، سەرەتای ئازادبوونی عەقڵ و خەیاڵی مرۆڤ بوو. دەبوو سەرزەمینی نهێنی پەلبکێشێت تا مرۆڤ لە قەفەزی یەک شیکردنەوە و یەک ڕاڤەکردن بۆ دونیا بێتەدەرێ. ڕۆشنگەریی دەرهێنانی شوێنەکانی پشکنین و گەڕانە لە دەستی دین، دۆزینەوەی بابەتی نوێی بیرکردنەوەیە.

«مرۆڤ دەبێت ئازاد بێت لەوەی دەیەوێت لە ژیانیدا وەڵامی چی پرسیارێک دەداتەوە» بەبڕوای من ئەوە جەوهەری ئازادیی و مانای سوبێکتیش لە ژیاندا دیاریدەکات. مۆدێرنە دوو ڕێگای گەورەی لێدەبێتەوە، بە ڕێگایەکدا مرۆڤ دەکاتە پسپۆڕێکی گەمژە و ترسناک لە شتە بچوکەکاندا، کە توانای گرێدانەوەی «کەرت» و «کۆ»، «بچوک » و «گەورە» ی نامێنێت، ڕێگا پێچەوانەوەکەشی دەیکاتە ڕۆحێکی سەفەرکەری ئازاد کە لە ناو مەعریفە زۆر و جیاوازەکاندا، بە جۆری نوێ درێژە بە گەمەی یەقین و گومان دەدات.

«ڕۆشنکردنەوەی زیاتر و زیاتر» «گەڕان بۆ تێگەیشتنی زۆرتر» ئەوە مەبەستی بوونی مرۆڤە لەسەر زەوی، بەڵام زۆر ڕۆشنکردنەوەش بەرەو کوێ دەچێت؟ ئەوە ئەو پرسیارەیە کە دەرەنجامگەلێکی فەلسەفی و ئەخلاقی گەورەی لێدەبێتەوە و دەبێت مرۆڤ بە وردی بیر لەدەرەنجامەکانی بکاتەوە.

# دەسەڵات و نهێنییەکانی

## ١

دەسەڵات لە ساتی سەرهەڵدانییەوە، بە نهێنییەوە گرێدراوە. دەسەڵات لە جەوهەردا دەسەڵاتە بەسەر دروستکردنی نهێنی و پاراستنیدا، وەک چۆن دەسەڵاتە بەسەر ئاشکراکردنی نهێنیشدا. هیچ دەسەڵاتێک ناتوانێت دەسەڵات بێت گەر «نهێنییەکانی خۆی» باش نەپارێزێت، ناشتوانێت دەسەڵات بێت گەر توانای بەسەر «نهێنی ئەوانیتر» دا نەشکێت. بۆ نمونە گەر لە دەوڵەتدا، دەزگاکانی ئەمنییەت و پۆلیس کاری ئاشکراکردن و دۆزینەوەی نهێنی بە باشترین شێوە نەبەنە ڕێگاوە، ئەوکات دەسەڵات وەردەگەڕێتە سەر ئامێرێکی پەککەوتە.

ئەستەمە لە گەمەی دەسەڵات تێبگەین گەر لە ڕاستیدا لە گەمەی نهێنی و ئاشکراکردن تێنەگەین.

دەسەڵات... هەموو دەسەڵاتێک هەوڵێکە بۆ دۆزینەوە و ئاشکراکردنی نهێنی ئەوی دی.

چەمکی خودا وەک دەسەڵاتی هەرە باڵا لەوەوە دێت کە هەموو نهێنییەک دەزانێت، دەزانێت چی لە دڵماندایە، دەزانێت چۆن بیردەکەینەوە، بەردەوام دەمانبینێت، لە شاخوێنبەری دڵ لێمان نزیکترە. خودا لە خەیاڵدانی هەموو ئاینەکاندا نهێنییە و دەسەڵاتی بەسەر هەموو نهێنییەکیشدا هەیە. لێرەوە چەمکی «هێز یان قودرەت»، تەنیا ئاماژە

نییە بۆ هێز و قودرەتی فیزیکی بەسەر ئەوانیتردا، بەڵکو ئاماژەیە بۆ دەسەڵات بەسەر نهێنی ئەوانیدیشدا. خودا ئەو هێزەیە کە دەزانێت ئێمە چیین و ئێمە نازانین ئەو چییە. دواتر هەموو دەسەڵاتێک لەسەر فۆرمی ئەم کاتاگۆرییە خودایییە دروستدەکرێتەوە، هەموو دەسەڵاتدارانی دونیا لە سەرەتای مرۆڤایەتییەوە تا ئەمڕۆ خواستیانە ئێمە نەزانین ئەوان چیین و ئەوان هەموو شتێک لەسەر ئێمە بزانن. تەکنۆلۆژیای مۆدێرنیش تا ئەندازەیەکی زۆر هاتنەدی ئەو خەونەی بۆ دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆی دونیا فەراهەمکردوە.

بەهێزترین دەسەڵات ئەو دەسەڵاتەیە کە ئەو دەزانێت ئێمە چی دەکەین و ئێمە نازانین ئەو چی دەکات.

بەدرێژایی مێژوو، دەسەڵات بۆ ئەوەی بتوانێت ئەفسونکار بێت، بتوانێت ئاسان ئەوانی دی ملکەچی خۆی بکات. دەبێت بە شەبەنگێکی تەماویی ڕازابێتەوە، دەبێت وادەربکەوێت کە نهێنییەکی قووڵی هەڵگرتووە کە دۆزینەوە و دەرککردنی لە توانای مرۆڤە سادەکان گەورەترە. دەسەڵات بۆ ئەوەی دەسەڵات بێت، دەبێت لە «سادە یان ڕۆژانە» بڵندتر بێت، دەبێت «ئاسایی یاخود هەرواپی ـ عادی» نەبێت. هەر دەسەڵاتێک زۆر سادەبوو واتە توانای ئەفسونی نییە. گەر تەماشای وشە سەرەکییەکانی دەوروبەری دەسەڵات بکەین پێکڕا وشەگەلێکن پەیوەندییان بە نهێنییەوە هەیە: سیخوڕی، خیانەت، دڵسۆزی، ئەمانەت، پەیمان. پێکڕا ئەم وشانە لەسەر هەوڵی پاراستنی نهێنی بەندن.

ڕەنگە لێرەدا دەنگێکی ناڕازی بەرزبێتەوە و بڵێت « ڕوونگەرایی ـ شەفافییەت کە پۆلی پێچەوانەی پەنهانخوازی و نهێنپەرستییە» بەشێکی

جەوهەری دیموکراسییەتی مۆدێرنە. خۆ گەمارۆدان بە تەلیسم و پۆشینی قودرەت بە پەردە و پەچەی نهێنی، فۆرمێکی پێشین و دێرینی دەسەڵاتە کە لەگەڵ فۆرمی دەسەڵاتی مۆدێرندا ناگونجێت. واتە لە جەوهەردا دیموکراسییەت هەوڵێکە بۆ پاکردنەوەی دەسەڵات لە خواستە تاریکەکەی بۆ خۆشاردنەوە و خۆ پەنهانکردن، گێڕانەوەی قودرەتە بۆ ژێر تیشک و بۆ ناو خانەی ڕۆشنی، بۆ لای ڕوناکی و بینین.

گەر وابێت کەواتە ئەوە تەنیا دیکتاتۆرییەتە کە مایل بە نهێنی پەرستییە. دیکتاتۆرییەتە خۆی لە پشت دیوارەکانەوە دەشارێتەوە، هێزی نهێنی خۆی هەڵدەگرێت و حەشاریدەدات تا کەس تەواوی قودرەتی نەخوێنێتەوە. ئەوە دیکتاتۆرییەتە زیندانی تاریک و ژێرزەمینی قووڵ دروستدەکات تا کردارەکانی خۆی لەوێدا بشارێتەوە، فایلە گرنگەکانی هەمیشە نهێنین و پێکرا لە ژێر دەستی دیکتاتۆر و کەسە نزیکەکانیدان. دیکتاتۆرییەت هیچ نییە جگە لە دروستکردنی تەمومژێکی قووڵ لە دەوری دەسەڵات، ئەوەی دەگیرێت لە شوێنی نادیاردا دەگیرێت. شوێنی تەواوی دیکتاتۆر نهێنییە، ژیانی تایبەتی نهێنییە، هاتوچۆکانی نهێنین. دەرکەوتنیشی بە ئاشکرا لە ناو خەڵکدا، بۆ لابردنی ئەو نهێنییە نییە، بەڵکو بۆ قووڵکردنەوەیەتی... دیکتاتۆر کە سەردانی جێگایەک دەکات، کە دەردەکەوێت، بۆ ئەوە نییە کە پێمان بڵێت ئەوە منم و وەرن بە ڕۆشنی بمبینن، بەڵکو بۆ قووڵکردنەوەی ئەو پرسیارانەیە: ئاخۆ لە کوێوە هاتووە، بۆ کوێ دەچێت؟. ئایا پێش ئەوەی لەم دیمەنەدا دەربکەوێت چی کردوە و دواتر چی دەکات؟. دیکتاتۆر لەسەر نهێنی دەژی، ئەم نهێنییە، شتێک نییە تەنیا میللەت نەیزانێت، بەڵکو وەزیرەکانیشی نایزانن، هاوڕێ نزیکەکانیشی نایزانن... بەوەدا دیکتاتۆر متمانەی بە کەس نییە، ئیدی هەتا کەسە هەرە نزیکەکانی، هەتا ژنەکەشی، ئاگاداری هەموو شتێکی نییە. دیکتاتۆری ڕاستەقینە ئەوەیە

کە زۆرترین نهێنی هەیە، سیستمیش لە ناوەوەڕا تا پتر بە نهێنی و زانیاری نەزانراو قانبدرێت زیاتر دیکتاتۆرییە. دیکتاتۆرییەت بریتییە لەدروستکردنی ئەرشیفێکی گەورەی نهێنی.

پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ لە سیستمی دیموکراسیدا «نهێنی» بوونی نامێنێت؟ . ئایا دەسەڵاتی دیموکراسی ئەو دەسەڵاتەیە کە ڕوونگەرایی «شەفافییەت» حوکمیدەکات؟ ئاخۆ دیموکراسییەت مۆدێلی جیاکردنەوەی دەسەڵات و نهێنییە لە یەکدی، یاخود ئەم بۆچوونانەش هەندێک وەهم و درۆی گەورەن و هیچی دی؟.

گەر ورد بڕوانین لە سیستمی دیموکراسیدا سیاسەت و ژیانی سیاسەتمەدار و خەرجییەکانی و شێوازی ژیانی ڕۆشنییەکی گەورە بەخۆیانەوە دەبینن. سیاسی تەنیا لە سنوورێکی زۆر بچوکدا نهێنی هەیە... بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە بەو مانایە نییە کە لە ناو سیستمی دیموکراسیدا «نهێنی» بوونی نامێنێت. لە دیکتاتۆرییەتدا نهێنی زۆربەی وەخت وەک نهێنی شەخسی کەسی دیکتاتۆر و کەسانی نزیکی سەیردەکرێت، بەڵام لە دیموکراسییەتدا جێگای نهێنی دەگۆڕێت و نهێنی لە نهێنی هێزێکی سیاسییەوە، لە نهێنی تاقمێکی حوکمدارەوە دەبێتە نهێنی سیستم. لە دیموکراسییەتدا نهێنی سەربازیی، نهێنی تەکنۆلۆژیی، نهێنی کۆمپانیاکان، نهێنی سیاسەتی ئابووری، نهێنییەکانی سیاسەتی دەرەوە، نهێنی دەزگاکانی پۆلیس و چاوەدێری، نهێنی لابۆرەکان، نهێنی کارگەکانی بەرهەمهێنان و کیمیای کاڵاکان، نهێنی بانکەکان، نهێنی گرێبەستە گەورەکان... جێگای نهێنییەکانی دیکتاتۆر دەگرنەوە. ئەوەی لە دیموکراسییەت و سیستمی لیبراڵی خۆرئاوادا بۆی نییە نهێنی زۆر گەورەی هەبێت، فەردە نەوەک سیستم، ڕوونگەرایی «شەفافییەت» تەنیا ژیانی تایبەتی و شەخسی مرۆڤە تاکەکان ڕۆشندەکاتەوە، بەڵام

سیستم نهێنییە گەورە و تاریکەکانی خۆی لە جێگای تاریک و داخراودا هەڵدەگرێت.

دەسەڵات لە هیچ جۆرە سیستمێکدا ناتوانێت بێ نهێنی بژی، هەتا گەر ئاشکراکردنی نهێنییەکان شتێکی گرنگ و کاریگەرییەکی نێگەتیڤیشی نەبێت، بوونی خودی نهێنی بەشێکە لە میکانیزمی کۆنترۆڵکردن... دیموکراسییەت سیستمێکە خواستی کۆنترۆڵ و ئاراستەکردن تێیدا لە خواستی کۆنترۆڵ و ئاڕاستەکردن لە سیستمی دیکتاتۆریدا لاوازتر نییە، بەڵام ناڕاستەوخۆتر و پەچەپۆشترە.

ئاشکرانەکردنی تەواوەتی خود لە مۆراڵی هیچ دەسەڵات و سیستمێک جیانابێتەوە... دەسەڵات بۆئەوەی ئەو هەستەمان لادروستبکات کە دەسەڵاتە دەبێت نهێنی هەبێت. دەبێت هەمیشە شتێک هەبێت نەیزانین، هەمیشە شتێک هەبێت لەو دیو پەردەوە بێت، شوێنی پرسیار بێت... جیاوازی نێوان دیموکراسییەت و دیکتاتۆرییەت لەوەدا نییە کە لێرەدا نهێنی هەیە و لەوێدا «شەفافییەت»، بەڵکو لەوەدایە لە دیموکراسییەتدا ئەوانی دی دەتوانن بۆ ئەو نهێنیانە بگەڕێن و گەر دۆزیانەوە ئاشکرایبکەن... لە دیکتاتۆرییەتدا مافی زانینی نهێنی لە خەڵک دەسەندرێتەوە و ئەوەی بیەوێت نهێنی بزانێت دەکوژرێت.

ئەوەی دەسەڵات نهێنی هەیە و نابێت ئێمە بیزانین، بەشێکی گەمەکەیە... بەڵام دیوی ترسناکی یارییەکە ئەوەیە کە دەسەڵات ئەو مافە دەداتە خۆی هەموو نهێنییەکی ئێمە بزانێت.

«ئاشکراکردنی نهێنی مرۆڤ» بەشێکی گرنگی خواستی پرۆژەی ڕۆشنگەریی و مۆدێرنەیە. زانستی مۆدێرن هەوڵێکی گەورە دەدا بە ناو مرۆڤدا ڕۆبچێت و هەموو نهێنییەکانی بخوێنێتەوە. لێرەدا گرنگی پرۆژەیی فۆکۆیی ئاشکرادەبێت کە پەیوەندییەکی قووڵ لە نێوان «مەعریفە» و «دەسەڵات» دا دەدۆزێتەوە، مەعریفە ودەسەڵات لەوەدا تەبان کە

دەیانەوێت نهێنی مرۆڤ بدۆزنەوە و کۆنترۆڵیبکەن. بڕی هەرە زۆری زانستە مۆدێرنەکان زانستی ئاشکراکردن و کۆنترۆڵکردنن. گەر زانستە سروشتییەکان مامەڵەی «بابەت ـ ئۆبێکت» لەگەڵ سروشتدا بکەن، زانستە مرۆییەکان مامەڵەی «بابەت ـئۆبێکت» لەگەڵ خودی مرۆڤدا دەکەن. کۆمەڵناسی و دەروونناسی و ئەنترۆپۆلۆژیا و ئیدارە، زانستگەلێکن لەسەر هەڵماڵینی نهێنی مرۆڤ و چۆنیتی کۆنترۆڵکردن و ئاراستەکردنی ئیشیانکردوە. هەوڵی دەروونناسان بۆ ڕۆچوون بە ناو ناخی مرۆڤدا لە بیمارستانە دەروونییەکاندا دەگاتە ئاستێکی ترسناک و نامرۆڤانە... لێرەدا مرۆڤی مۆدێرن کەسێک نییە تەنها لە ژوورەکانی ئەشکەنجە و لەژێر فەلاقەی پۆلیسدا هەوڵبدرێت نهێنی لێ دەربهێنرێت و شتی پێ بدرکێنرێت، بەڵکو لە لابوورەکانی زانست و لە ژووری پزیشکەکان و لە ژێر نەشتەری دەروونناسانیشدا پەردە لە رووی نهێنی هەڵدەماڵرێت. بۆیە لە دیدی فۆکۆوە مەعریفە هەمیشە دەسەڵاتە، هاوشانێتی، هەم خۆی دەسەڵاتی تایبەتی هەیە، هەم نۆرم و مۆراڵ و تەکنیکی کۆنترۆڵ بە دەسەڵاتی رەسمیش دەبەخشێت.

لە جیهانی مۆدێرندا لەزەتی مەعریفە و لەزەتی دەسەڵات بەجۆرێکی سەرنجڕاکێش تێکەڵدەبن... هەردووکیان لەسەر لەزەتی بینینی نهێنی ئیشدەکەن، هەردووکیشیان بە مەبەستی کۆنترۆڵکردن لە کاردان.

دەسەڵات لەسەر ڕووتکردنەوەی نهێنی مرۆڤەکان دروستبووە. هیچ دەسەڵاتێکیش لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وەک دەسەڵاتی مۆدێرن، مرۆڤی ڕووت نەکردۆتەوە. مرۆڤی ئێستا بەردەوام لە ژێر چاوەدێریدایە بۆ ئەوەی کەمترین نهێنی هەبێت... دەسەڵاتی مۆدێرن دەتوانێت بزانێت کەی لەگەڵ کێدا قسەدەکەین، بزانێت لەماڵەوە سەیری چ بەرنامەیەکی تەلەفزیۆن دەکەین، کۆنتۆکەمان چەند پارەی لەسەرە، سەعات چەند بە چ شەقامێکدا تێپەڕیووین، چ نەخۆشییەکمان هەیە. ئەمجۆرە لە پەلاماردان بۆ سەر

جیهانی نهێنی و تایبەتی مرۆڤ پێویستی بەدروستکردنی دەیان زانست و سەدان ئەنستیتوتی تایبەتمەند هەیە... لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا بەتەنیا پۆلیس ئەرکی پشکنینی نهێنی مرۆڤ و ئاشکراکردنی لە ئەستۆ دەگرت، بەلام لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا پشکنینی بەردەوامی تایبەتمەندێتی مرۆڤ، ئاشکراکردنی، کۆنترۆڵکردنی دەبێتە بەشێکی گەورەی دەزگا گرنگ و ئۆرگانییەکانی سیستەم.

لە جیهانی مۆدێرندا لەزەتێکی نوێ سەرهەڵدەدات کە لەزەتی بینینی نهێنی ئەوانی ترە، گەیشتن بەو لەزەتە یەکێکە لەو بزوێنە غەریزیانەی کەپیتالیزمی نوێ لەسەری ئیشدەکات. میدیای مۆدێرن ئەو دەرفەتە بە هەموو یەکێک لە ئێمەش دەدات بە برێکی دیاریکراو لە لەزەتی گەورەی دەسەلاتدا بەشداربین کە لەزەتی بینینی نهێنییە. پیشەسازی پۆرنۆ و فیلمی ڕووت، بەرنامەگەلی لە بابەت «بیگ برازەر»، هەوڵە بۆ دروستکردنی فەزایەک کە تێیدا هەر مرۆڤە و واهەستبکات دەسەلاتێکی گەورەی هەیە، توانای ئەوەی هەیە تا دوورترین شوێن نهێنی ئەوانی تر بخاتە ژێر چاودێری و توانای بینینەوە.. گەر دەسەلات لە دیوێکیدا توانای بینینی نهێنی ئەوانیدی بێت. لێرەوە «لەزەتی بینینی نهێنی» لە دونیای ئەمڕۆدا یەکێکە لەو میکانیزمە گرنگانەی لە ڕێگایەوە دەسەلات ئەو وەهمە بە فەردە بچوک و پەراوێزییەکانیش دەبەخشێت کە خاوەنی دەسەلاتن و دەتوانن خۆیان لە نهێنی ئەوانی تر تێربکەن.

## ٢

لەو سەفەرانەی دوایدا بۆ کوردستان چەند جارێکە ڕێکەوتی شتێکی سەیردەکەم، هەر جارێک کەسێک یان دووان دەبینم کە دەڵێن «هەندێک نهێنمان هەیە دەمانەوێت بۆت باسبکەین». من هەموو جارێک لە وەلامی ئەو بەڕێزانەدا دەڵێم «من ڕۆژنامەنوس نیم، بەرنامەیەکی تەلەفزیونیم

نییە. گەر نهێنییەکانیشم پێبڵێیت سوودی نییە، چونکە لە ڕاستیدا دوایی نازانم چییان لێ بکەم... باشترە نهێنییەکەت بدەیتە ڕۆژنامەکان، بەوانەی کاریان ئاشکراکردنی نهێنییە. من کە دەنوسم باس لە نهێنی تایبەتی کەس ناکەم، ئەدەب ئیش لەسەر ڕووتکردنەوەی مرۆڤێکی دیاریکراو یان شەخسێکی واقعی ناکات، من وەک ڕۆماننوس و نوسەر، هەر کات قسەم لە نهێنی کردبێت، باس لە جۆرە نهێنییەکی دیکە دەکەم، نهێنی هەموومان... لەو نهێنییە تاریکانەی تەواوی کۆمەڵگا هەیەتی، نەوەک نهێنی شەخسی مرۆڤێکی دیاریکراو». هەمیشەش بەرلەوەی کابرا نهێنییەکەی بدرکێنێت کۆتایی بەقسەکان دێنم و ماڵاواییدەکەم. ڕەنگە هۆی ئەوە بگەڕێتەوە بۆ پاڵنەرێکی سایکۆلۆژی، من هەمیشە فزوڵی تێگەیشتنم لە مرۆڤ هەبووە، بەس فزوڵی زانینی نهێنی تایبەتی کەسم نەبووە. ئەوەی لەو حاڵەتانەدا بۆ من جێگای سەرنج بوو، وادەهاتە بەرچاوم کە هەموو ئەو کەسانە لە ڕێگای زانینی نهێنییەکەوە، هەست بە هێزێکی گەورەدەکەن. ڕەنگە نهێنییەکان پابەندی گەندەڵی بەرپرسێک یان ژیانی شەخسی کەسێکی دیاریکراو بووبێتن... واتە جۆرە نهێنییەک بن، تەنیا نرخێک هەیانبێت ئەوەیە نهێنیین و هیچی دی، خەڵک بیانزانێت یاخود نا، هیچ شتێک لە ژیان و بیرکردنەوە و مۆراڵیان ناگۆڕێت... لەوەش دەرچن نرخێکی ڕاستەقینەیان بۆ کەسێکی ئاسایی وەک من نییە، کە نە پۆلیسی ئادابم و نە لە دەزگای چاوەدێری دارایی کاردەکەم. بەڵام پرسیارێک کە هەمیشە لام دروستدەبوو ئەوە بوو «چی وادەکات، مرۆڤێک کە نهێنییەک دەزانێت، هەست بە هێزێکی تایبەت بکات، هەستبکات هەم پەیامێکی هەیە، هەم چەکێکی کوشندەی کەوتۆتە دەست کە هەرچۆنێک بووە دەبێت بیتەقێنێت؟». بۆ ئەوەی وەڵامێکی «ناتەواویی» ئەو پرسیارەبدەمەوە، دەبێت کەمێک لە مانای «نهێنی» لە ژیانی ئێستادا ڕابمێنم.

لە دونیای ئەمڕۆدا ڕێکخستنی سیستمی نهێنی، واتە دیاریکردنی ئەو شتانەی کە ڕەوایە ئاشکرابکرێن، لەگەڵ ئەو شتانەدا کە ڕەوایە بە نهێنی بمێننەوە، گرفتێکی ئەخلاقی و یاسایی گەورەیە. چۆنێتی ڕێکخستنی ئەو سیستمە، بۆتە مایەی دیالۆگ و دەرگیرییەکی گەورە کە تێیدا سیاسییەکان، فەیلەسوفان، یاساناسان، دینییەکان بەشدارن. لەسەردەمانی تردا تەنیا دەسەڵات بۆی هەبوو نهێنی ئەوانی تر بدۆزێت و بیپشکنێت، ئەو شتەی کە پێیدەگوترێت «فەزای گشتی» بە تەنیا بە دەست دەوڵەت و هەندێک هێزی دیکەی پەراوێزییەوە بوو، بەڵام لە مڕۆدا ستراکتوری فەزای گشتی تا ڕادەیەکی زۆر گۆڕدراوە. ئەمڕۆ فەزای گشتی فەزایەکی کراوەترە... هەموو کەس دەتوانێت بەجۆرێک لە جۆرەکان کار لەو فەزایەدا بکات. لێرەدا وشەی نهێنی یان مامەڵەکردن لەگەڵ نهێنیدا گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەردا هاتووە. میدیای مۆدێرن پێکهاتی ئەم فەزا گشتییەی لە بنەوەڕا گۆڕی... ئەوەی سەرنجی تێکەڵاوبوونی مرۆڤی سادە و چالاکییەکانی بدات لە ناو سایت و لە ژوورەکانی چات و لە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکاندا ئەو ئاڵوگۆڕە ترسناکەی فەزای گشتی دەبینێت. لەسەردەمانی پێشوودا میدیا شوێنێکی کۆنترۆڵکراو بوو، بەشێک بوو لە دەزگا ئۆرگانییەکانی دەسەڵات، ئەوەی لەوێدا دەگوترا و ئاشکرادەکرا بە فلتەری دەسەڵاتدا تێدەپەڕی، بە پێچەوانەی میدیای مۆدێرنەوە کە قەبووڵی هیچ جۆرە کۆنترۆڵ و سانسۆرێک ناکات. لە سیستمی سانسۆرکراوی میدیادا، چەمکی «ئاشکراکردن ـ کشف» چەمکێکی ئەخلاقی نەبوو، واتە کێشەی ئەخلاقی بەدوای خۆیدا ڕانەدەکێشا، بەڵکو چەمکێکی سیاسی بوو، کێشەی ئازادی بیرکردنەوە و تەعبیری بەدوای خۆیدا کێشدەکرد. بەڵام گۆڕانی پێکهاتی فەزای گشتی، وەرچەرخانێکی قووڵی لە هاوکێشەی «دەرخستن/ شاردنەوە» دا دروستکرد... ئەو قسە و وێنە و بابەتانەی لە کولتووره سوننەتی و تەقلیدییەکاندا پێویستیان

بە شاردنەوە بوو، لە کولتووری مۆدێرن و نوێڕەنگدا بێ هیچ بەربەستێک دێنەوە دەرێ... لێرەدا تێکچوونی سیستمی «هەڵگرتن و پاراستنی نهێنی» لە کۆمەڵگادا کارێکدەکات بنەما و حەرامە کولتوورییەکانی کۆمەڵگای سوننەتی لە بنەوەڕا بلەرزێن و گۆڕزی کاریگەر بخۆن.

لەمجۆرە فەزایەدا کە ئەمڕۆ باڵادەستە، هەموو نهێنییەک دەکرێت خێرا ئاشکرابێت. مرۆڤی مۆدێرین لە فەزای گشتی ئێستادا عاشقی ئەوەیە رۆڵێکی تایبەتی ببینێت، رۆڵی دەسەڵاتدار، رۆڵی ئەو کەسەی نهێنی دەبینێت و ئاشکرایدەکات. بەوەدا بەدرێژایی مێژوو، دەسەڵات تەنیا هێزێک بووە بۆی هەبێت خاوەنی نهێنی و خاوەنی هێزی ئاشکراکردنی نهێنی بێت... ئەوە نهێنی بۆ خۆی مۆنۆپۆڵکردوە، ئەوە نهێنی هەیە و بواریش نادات بێرەزامەندی ئەو کەس نهێنی هەبێت، لێرەوە لاسایکردنەوەی دەسەڵات دەبێتە خولیایەکی سایکۆلۆژی گەورە بۆ مرۆڤەکان. لەم ژینگەیەی ئەمڕۆدا زۆرینەی خەڵک کەرەستەکانی ئاشکراکردنیان لە بەر دەستدایە، واتە شوێنی بڵاوکردنەوەیان هەیە... بڵاوکردنەوە هەمیشە وەک پۆڵی پێچەوانەی «نهێنی» دەردەکەوێت. «نهێنی» ئەوەیە کە کەس نایزانێت، «بڵاوکراوەش» ئەو شتەیە کە بۆ تەواوی دونیا و مێژوو شتێک تۆماردەکات، بڵاوکردنەوە لە دونیای ئێمەدا زیاد لەوەی بە مانای تۆمارکردن و هەڵگرتن و پاراستنەوە گرێدرابێت، بە مانای ئاشکراکردن و دەرخستنەوە بەستراوە. لە نەستی مرۆڤی ئێمەدا ئەو وێنەیە چەسپیوە هەر شتێک بڵاوبووەوە وەک حەقیقەتێکی جێگیر و ئەبەدی بۆ دونیا ئاشکرادەبێت. بە حوکمی ئەم تێگەیشتنەش، کولتووری نوسین و بڵاوکردنەوە لای ئێمە هێندەی پەیوەندیان بە «فەزیحەت - گومانی ئەخلاقی - ئیفشاکردن - پەردەهەڵماڵین»ەوە هەیە، پەیوەندیان بە «ڕامان - بیرکردنەوە - گومانی زانستی»یەوە نییە. ئیدی هەموو کەرەستەیەکی میدیایی، هەموو مینبەرێکی بڵاوکردنەوە وەک شوێنی

ئاشکراکردن ـ ئابڕووبردن ـ دەرخستن بەکاردەهێنرێت. زۆربوونی ژمارەی ڕۆژنامەنوس و ڕۆژنامە و سایتەکان پەیوەندییەکی بە گەشەی نوسین و بەهرەی داهێنانەوە نییە، بەڵکو گرێدراوی ئەو ئارەزووەی مرۆڤی نوێن بۆ بینینی ڕۆڵێکی وەک «بیگ برازەر» لە ڕۆمانەکی ئۆرویل «١٩٨٤»دا کە دەتوانێت هەموو شتێک ببینێت. ئەو ڕووبەرە ئازادانە میدیای مۆدێرن بە مرۆڤی ئێمەی بەخشی، لە بری ئەوەی ئازادی بیرکردنەوە و توانای تێڕامانی فیکری لە مرۆڤی ئێمەدا بتەقێننەوە، بوونە هەڵگری جۆرە مۆراڵێکی نزیک لە مۆراڵی دەسەڵات، بوونە مینبەری پەلاماردانی کایەی تایبەتی مرۆڤەکان و ڕەفتارکردن وەک هێزێک کە دەسەڵاتی بەسەر نهێنی ئەوانیدیدا دەشکێت. لە بری «ئەخلاقی ئازادی» و ڕێزگرتن لە خسوسییەت و چەسپاندنی دادپەروەری، بوونە «بیگ برازەر»... بە چاوێک تەنیا مەبەستێتی ببینێت و ئیفشاگەری بکات.

ئێستا لە تەواوی دونیادا پیشەسازییەک هەیە کە پیشەسازی دروستکردنی نهێنییە، لەم پیشەسازییەدا، چیتر نهێنییە ڕاستەقینە و گەردونی و زانستییەکان نابینینەوە، بەڵکو بەر نهێنی دروستکراو دەکەوین، کە پتر بۆ تێرکردنی فەنتازیاکانی مرۆڤ دادەڕێژرێن، نەوەک بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە گەورە و ئەبەدییەکان.

ئەگەر لە شێوە کلاسیکییەکانی دەسەڵاتدا دەوڵەت و ئۆرگانەکانی هەڵگری نهێنی بووبن، لە دونیای مۆدێرندا، میدیا کۆنترۆڵی گەمەی نهێنی و ئاشکراکردن دەکات. بێ کۆنترۆڵی میدیا، دەسەڵات ناتوانێت کۆنترۆڵی گەمەی «نهێنی و ئاشکراکردن» بکات. مرۆڤی هاوچەرخ چاودەکاتەوە و دەبینێت، مینبەرێکی لە بەردەستدایە بۆ قسەکردن... واتە لە کەسێکی بێدەنگی پاسیڤەوە بۆتە کەسێک کە دەتوانێت بڵاوبکاتەوە. بەڵام ئەوەی مینبەرێکت هەبوو بۆ ئاشکراکردنی نهێنی، مانای ئەوە نییە کە نهێنییەکت هەیە بۆ ئاشکراکردن... لێرەوە برێک لە مۆراڵی مرۆڤی

مۆدێرن تووشی هەمان ئەو دەرد بووە کە بەدرێژایی مێژوو دەسەڵات تووشی بووە.

دەسەڵات هەردەم بەوە نەیارانی دەکوژێت کە پیشانیبدات، دەستی خستۆتە سەر نهێنییە گەورە و تاریکەکانیان، ناوەوەیان دەبینێت، نیازیان ئاشکرادەکات، بە زمانی بازاڕیی «دەستەکەیان کەشفدەکات». ئەم ئەخلاقە گواستراوەتەوە بۆ میدیای نوێش بەتایبەت لە کۆمەڵگا دواکەوتووەکانی وەک ئێمەدا، سەکۆی ئازاد بۆ بیرکردنەوەی ئازاد بە کارناهێنێت، بەڵکو هەمان ئەخلاقی ترسناکی دەسەڵات دووبارەدەکاتەوە، بەوەی «ئابڕووی ئەوانی دی بەرێت» «کەشفیانبکات» «پەردە لە ڕوویان هەڵماڵێت».

ئەو ئازادییەی میدیای مۆدێرن پێشکەشیدەکاتجەوهەرێکی شۆڕشگێڕانەی ئێجگار گەورەی هەیە، وەک تەواو لە کێشەی ویکیلیکسدا دەرکەوت، بەڵام لە کۆمەڵگا دواکەوتووەکانی وەک ئێمەدا دەبێت بە چەکی هەڕەشەی ئەخلاقی، دەگەڕێتەوە و دەبێتە بەشێک لە کولتووری خێڵەکی، بە سەکۆیەک بۆ مۆراڵی تەقلیدی و ئەخلاقگەرای سوننەتی... میدیا لێرەدا بیرکردنەوەی ئازاد دروست ناکات، بەڵکو فۆبیایەکی ئەخلاقی دروستدەکات، لە دوا دەرەنجامەکانیشیدا بەقازانجی دیوە هەرە داخراو و کۆنەپەرستەکەی کۆمەڵگا دەشکێتەوە. یەکێک لە کارەساتە ترسناکەکان کە کۆمەڵگا خۆرهەڵاتییەکان پێوەی گیرۆدەن، شکاندنەوەی مۆراڵی میدیای ئازادە، بەدیوە کۆنزەرڤاتیزم و ئابڕووپارێزەکەدا، میدیایەک ئەخلاق «بە هەموو ماناکانی» سەنتەری بابەتەکانێتی.

دەسەڵات لە ڕەوتی مێژوودا بۆئەوەی هێزی خۆی بسەلمێنێت، زۆرجار شانۆگەریی ئاشکراکردنی نهێنی سازدەکات. دەسەڵات بۆئەوەی بیسەلمێنێت، بەسەر تاریکترین شوێن و قووڵترین جێگای ناخی مرۆڤەکاندا دەستی دەڕوات، «نمایشی ئاشکراکردن» دروستدەکات. بۆ

ئـەوەی دەسـەڵات هەبێـت دەبێـت هەمیشـە نهێنییەکـی شـاردراوە ئاشـکرا بکرێـت. لـە سـەردەمی سـتالنینیدا «دادگاکییەکانـی مۆسـکۆ»، نمونـەی ئەوجـۆرە لـە «نمایشـی ئاشـکراکردن» بـوون. لـە نـاکاو دەسـەڵات هەمـوو دەزگای پروپاگەنـدەی خـۆی دەخاتـە کار بۆئـەوەی بڵێـت «نهێنییـەک» هەبـووە ئاشـکرامانکردوە. سـتالین هەمـوو هـاوڕێ نزیکـەکان و سـەرکردەکانی حیزبـی بەلشـەفی لـە ژێـر ئەشـکەنجەدا ناچارکـرد دان بـە تاوانێکدا بنێـن کـە نەیانکردبـوو... سـتالین پێویسـتی بـەوە بـوو بڵێت «پیلانێـک»، «نهێنییەکی گـەورە» هەیـە و مـن ئاشـکرامکردوە. لێرەدا هێـزی دەسـەڵات تەنیـا لە هێزی ئاشـکراکردنیدایە. نازییەکانیـش هەمـان شـتیان دەکـرد کاتێـک قسـەیان لـە ئاشـکراکردنی پلانێکـی گەردونـی جوولەکـەکان دەکـرد بـۆ دەسـتگرتن بەسـەر هەمـوو دونیـادا. بەعسـییەکان هەمانشـێوە، سـەرەتا دەسـەڵاتی خۆیـان بـەوە پتـەو و بـە هێزکـرد جـار دوای جـار، پلانـی زایۆنـی، پلانـی مەجوسـی، پلانـی ئیمپریالیـان ئاشـکرادەکرد. هەمـوو دەسـەڵاتەکانی تریـش هەمـان ئـەو گەمەیـە دەکـەن... لـە خۆرئـاوای ئێسـتادا، گـەڕان بـە دوای تارماییەکانـی قاعیـدە و ئاشـکراکردنیدا، بەشـێکە لـەو گەمـە یۆنفێرسـاڵەی «نهێنـی و ئاشـکراکردن» کـە سیسـتمی لەسـەر ڕاگیـراوە. هەمیشـە دەبێـت پلانێکـی تاریـک و ترسـناک هەبێـت بـۆی بگەڕێیـن، گـەر ئـەو گەڕانـە بەردەوامـە بـەدوای نهێنـی «دوژمـن» دا بوەسـتێت، دەسـەڵات کۆتایـی پێدێـت. ئـەم مۆراڵـە دۆزەخییـەی دەسـەڵات گوازراوەتـەوە بـۆ نـاو میدیـای هاوچەرخیش، لـە تـەواوی دونیـادا میدیـا لـە هەوڵـی ئەوەدایـە نهێنییەکمـان بـۆ ئاشـکرابکات کـە ئێمـە نایزانیـن.

لـە ڕاسـتیدا زۆربـەی کات دەسـەڵات هیـچ نهێنییەکـی ڕاسـتەقینە ئاشـکرا نـەکات، بـەڵام زۆر بـۆی گرنگـە «نمایشـی ئاشـکراکردن» «ڕیتواڵـی کەشـفکردن» پێشکەشـبکات. دەسـەڵات دەبێـت بیسـەلمێنێت کـە توانـای هەیـە بگاتـە ناخـی تاریکـی مرۆڤـەکان، بیسـەلمێنێت چـۆن خـودا بـە هەمـوو

شتێک دەزانێت، ئەویش بە هەموو نهێنییەک دەزانێت. دیوە کۆمیدییەکەی ئەم گەمەیە لەوەدایە کە لە ڕاستیدا مەتەڵێک نییە دەسەڵات وەڵامی بۆ دۆزبیێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوەیە، وەڵامێکمان هەیە و بۆ مەتەڵێک دەگەڕێین بۆی.

لە لۆژیکی دەسەڵاتدا کەرەستەکانی ئاشکراکردنی نهێنی لە خودی نهێنی گرنگترە. واتە دەزگا ئەمنییەکان تەنیا و تەنیا بۆ ئەوە دروست نابن نهێنییەکان بدۆزنەوە و بگەنە جێگا تاریک و ترسناکەکان، بەڵکو زۆرجار تەواو بە پێچەوانەوەیە، نهێنییەک دادەتاشرێت، پلانێکی تاریک دروستدەکرێت، تا دەزگا ئەمنییەکان بیدۆزنەوە. بۆ ئەوەی بزانین دەسەڵات بەهێزە، دەبێت لە پێناوی تاقیکردنەوە و دەرخستنی هێزی کەرەستەکانی ئەودا، نهێنییەک دروستبکرێت. لێرەدایە نهێنی مانا و وەزیفەی خۆی دەدۆڕێنێت، چونکە ئاشکرابوونی پێش خۆی دەکەوێت، واتە دەبێتە نهێنییەک کە بە خواست و لەسەر ڕێنمایی ئەوانەدا دروستکراوە کە پێشتر کەرەستەکانی ئاشکراکردنیان دروستکردوە.

لە دونیای ئەمڕۆدا ئەم گەمە درێژەی دەسەڵات، سروشتێکی بەرفراوانی وەرگرتووە، کاتێک مرۆڤە ئاساییەکانیش زۆر مەیل و ئارەزوو نیشاندەدەن وەک دەسەڵات ڕەفتاربکەن. ئەوەی ئەم مرۆڤەش زۆرجار لە ناخەوە دەجوڵێنێت «ئارەزووی ئاشکراکردنە». ئارەزووی ئاشکراکردن یان مەیل بەرەو ڕوونگەرایی پەیوەندی بەوەوە نییە ئاخۆ نهێنی هەیە یاخود نا، بەڵکو پەیوەندی بەوەوە هەیە مرۆڤی مۆدێرن هێزی خۆی لە ئاشکراکردندا دەبینێتەوە... بۆیە گەر نهێنی نەبوو، دەبێت دروستبکرێت. مرۆڤی هاوچەرخ ئەو کەرەستانەی کەوتۆتە دەست کە لە ڕێگایەوە نهێنی ئاشکرابکات، شت بڵاوبکاتەوە... بۆیە زۆرجار دەبینین غەریزەی ئاشکراکردنە کە نهێنی دروستدەکات، نەوەک بوونی نهێنی بێت غەریزەی ئاشکراکردن بجوڵێنێت.

مرۆڤـی هاوچـەرخ هەمـان خواسـتی دەسـەڵاتی تێدا دروسـتبووە بـۆ بینینی نهێنـی ئەوانـی تـر. لێرەوە دزەکـردن بـۆ نـاو ژیانـی تایبەتـی مرۆڤەکانـی دی بـووە بـە بەشـێکی گرنگـی خولیـای ئەو. گـەر بگەڕێینـەوە بۆ لای فەیلەسـوف جـاک لاکان پتـر لـە نهێنـی ئـەو هەسـتە تێدەگەیـن. ئـەو هەسـتەی کـە مرۆڤـی هاوچـەرخ هەیەتـی «ئـەوەی بـەردەوام هەسـتبکات شـتێکی گرنگـی دۆزیوەتـەوە یـان نهێنییەکـی ونبـووی کەوتۆتەدەسـت».

منـداڵ بەپێـی لاکان « و لای فرۆیدیـش» لـە منداڵیـدا بـە ئەزموونێکـی تراژیـدی ونکـردن و دۆزینـەوەدا دەڕوات. ئـەو سـاتەی کـە دایکـی لـە پێشـچاوی وندەبێـت و دەڕوات، لەگـەڵ ئـەو سـاتەدا کـە دەردەکەوێـت و دەگەڕێتـەوە، یـان ئـەو سـاتەی کـە مەمکـی دایکـی دەخرێتـە زاری و دوایـی لێـی دووردەخرێتـەوە. ئـەو ئەزموونـە سـەرەتاییە ئاسـەواری قـووڵ لەسـەر بونیـادی دەرونیمـان جێدەهێڵێـت. منـداڵ دواتـر گەمـەی ونکـردن و دۆزینـەوە دەبێتـە یەکێـک لـە گەمـە سـەرەکییەکان لای. لەزەتـی ونکردنـی دایـک و دۆزینـەوەی دەبێتـە هەوێنـی هەمـوو گەمەیەکـی ونکـردن و دۆزینـەوە. مـرۆڤ دەبێـت شـتێک ونبـکات، بـۆ ئـەوەی لەزەتـی دۆزینـەوەی بـژی... لـە منداڵیـدا دوورکەوتنـەوە و هاتنـەوەی دایـک، بەجۆرێکـی قـووڵ خەیاڵمـان بـۆ هەمـوو یارییەکـی ونکـردن و دۆزینـەوە ئامـادەدەکات.

لێرەدا گەمـەی ونکـردن و دۆزینـەوە خۆشـییەکەی لەوەدایە کـە گەمەیە... واتـە لـە ڕاسـتیدا ونکـردن و دۆزینـەوەی ڕاسـتەقینە لـە گـۆڕێ نییـە. بەڵکـو یارییەکـی بـەردەوام و ڕۆژانـە هەیـە کـە تێیـدا شـتێک وندەکەیـن بـۆ ئـەوەی بیدۆزینـەوە. فرۆیـد سـەرنجی ئـەوەدەدات کـە یەکـەم یـاری منـداڵ لـە ژیانیـدا دەیـکات یـاری شـاردنەوەی شـت و دۆزینەوەیەتـی، واتـە گەمـەی ونکردنـی بابەتەکانـی حـەز و دۆزینەوەیـان. مـرۆڤ بـەردەوام خەریکـی ئـەو گەمەیەیـە، لـە سـینەمادا، لـە چیرۆکـدا، لـە ڕۆمانـی پۆلیسـیدا، لـە یـاری کۆمپیوتـەردا، لـە لابۆرەکانـدا، لـە ڕۆژنامەگەرییـدا هەمیشـە ئـارەزووی ئـەوە مـرۆڤ

ڕادەکێشـێت کـە نهێنییـەک هەیـە ونبـووە و دەیەوێـت بیبینێـت. ئـەوەی ملیۆنەهـا مـرۆڤ دەتوانـن سـەدەها زنجیـرە بـەدوای سـریالێکی تەلەفزیونـی پڕوپوچـەوە دانیشـن، پەیوەنـدی بـەو گەمـە کـۆن و دێرینـەوە هەیـە، گەمـەی ونکردنـی نهێنییـەک کـە تـا دوایـی لـە دووی دەڕۆیـن، بزانیـن لـە کۆتاییـدا چـی لـە پشـتە.

وەک چـۆن دەسـەڵات هێـزی خـۆی لـەوەدا دەبینێتـەوە کـە نهێنـی ئەوانـی تـر دەبینێـت. مرۆڤـە سـادەکانیش لـە نـاو میدیـای هاوچەرخـدا هەمـان یاریدەکـەن... هـەم لەگـەڵ دەسـەڵات و هـەم لەگـەڵ یەکتـر. هەمیشـە لـە بری گومـان و شـیکردنەوەی زانسـتی، مـرۆڤ بـەردەوام بـەر خەڵکانێـک دەکەوێـت کـە هێـزی خۆیـان لـەوەدا دەبیننـەوە نهێنییـەک دەزانـن. مرۆڤـی هاوچـەرخ بـۆ ئـەوەی بیسـەلمێنێت بەهێـزە، بـەردەوام دەبێـت نمایشـی ئـەوە بـکات کـە «نهێنـی لەلایـە». بۆیـە «نمایشـی ئاشـکراکردنی نهێنـی» کـە سـەردەمانێک دەسـەڵات بـۆ خـۆی قۆرغـی کردبـوو، ئەمـڕۆ کەوتۆتـە دەسـت هەموومـان... هەمـوو دەتوانیـن ئـەو وەهمـە لـە خۆمـان و ئەوانـی تـردا دروسـتبکەین کـە نهێنـی دەزانیـن. وەک چـۆن زۆرجـار دەسـەڵات خـۆی نهێنـی دروسـتدەکات، تـا بڵێـت توانـای ئاشـکراکردنی هەیـە... ئێمـەش زۆرجـار «نهێنـی وەهمـی» بـۆ خۆمـان ئاشـکرادەکەین تـا بڵێیـن «توانـای دۆزینەوەمـان» هەیـە... بەجۆرێـک ئیـدی لەزەتـی دۆزینـەوە لـە لەزەتێکـی بێگوناهـ و زانسـتی و عەقڵییـەوە گـۆڕاوە و بـووە بـە خواسـتێکی ناعەقڵانـی و کوشـندە.

نهێنـی تەنیـا کاتێـک دەتوانێـت خەیاڵـی مـرۆڤ دەوڵەمەنـد بـکات کـە نهێنییەکی ڕاسـتەقینە بێـت، بـەڵام ئەمـڕۆ ئێمـە لەسـەردەمی نهێنییـە وەهمی و درۆزنەکانـدا دەژیـن. نهێنییـەک کـە سیاسـییەکان و مۆراڵـی سـوننەتی پێکـەوە دایدەڕێـژن و پێکـەوە ئاشـکرایدەکەن.

# له بیمارستانی واقعییه‌تدا

## ١

واقعییه‌ت نه‌خۆشییه، نه‌خۆشییه‌كی ئه‌ده‌بیی گه‌وره‌یه، گه‌وره‌ترین نیشانه‌ی ئه‌م نه‌خۆشییه له‌و ساته‌دا ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ خوێنه‌ر داوا له‌ نوسه‌ر ده‌كات واقعی بێت. له‌ پشت ئه‌م داوایه‌وه‌ دوو تێنه‌گه‌یشتنی گه‌وره‌ ڕاوه‌ستاون، یه‌كه‌م : تێنه‌گه‌یشتن له‌ خودی واقع . دووه‌م: تێنه‌گه‌یتشن له‌ ئیشی ئه‌ده‌بیات. به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا خوێنه‌رانی واقعپه‌رست، یان جه‌نگاوه‌رانی واقعییه‌ت كه‌م نین، ڕه‌نگه‌ به‌رده‌وام خۆیان ده‌رنه‌خه‌ن، به‌ڵام گه‌ر به‌جۆرێكی نهێنیش بێت، به‌شێكیان له‌ ناو ئێمه‌دان و ده‌ستێكیان له‌ خه‌یاڵ و خولیاماندا هه‌یه. كه‌ ده‌ڵێم خوێنه‌ری واقعپه‌رست، مه‌به‌ستم له‌ كه‌سێكی تایبه‌تی نییه، به‌ڵكو مه‌به‌ستم له‌ خوێنه‌رێكی نهێنییه‌ كه‌ بوونه‌وه‌رێكی گومانكار و مه‌كرباز و ته‌فره‌ده‌ره‌ و به‌جۆرێك له‌ جۆره‌كان له‌ ناو هه‌موماندا ده‌ژی، به‌رده‌وام زه‌وق و سه‌لیقه‌ی ئه‌ده‌بیمان داده‌به‌زێنێت. زۆرجار ئه‌م خوێنه‌ره‌ دیوه‌كانی ترمان ده‌كوژێت و ده‌بێته‌ خوێنه‌ری زاڵ، ده‌بێته‌ ڕه‌خنه‌گری زاڵ، ده‌بێته‌ ئه‌و هێزه‌ی بڕیارمان بۆ ده‌دات چی په‌سه‌ندبكه‌ین و چی ڕه‌تبكه‌ینه‌وه. زۆر جار به‌ر سێبه‌ر و تارماییه‌كانی ئه‌و خوێنه‌ره‌ كه‌وتووم، هه‌م له‌ ناو خۆمدا و هه‌م له‌ ده‌ره‌وه... به‌ڵام جارێك ئه‌و خوێنه‌ره‌م زۆر به‌ڕاستی بینی. دوو ساڵ دوای بڵاوبوونه‌وه‌ی «غه‌زه‌لنوس و باغه‌كانی خه‌یاڵ» نامه‌ی خوێنه‌رێكم بۆ هات گه‌لێك توڕه،

لە نامەکەیدا نوسیبووی کاتێک ڕۆمانەکانی منی خوێندۆتەوە چاوەڕوانی ئەوەی نەکردوە، من لە واقعییەت لابدەم، چاوەڕوانی ئەوەی نەکردوە ڕوو لە خەیاڵات بکەم و باسی شتگەلێک بۆ خوێنەرانم بکەم کە خەیاڵن و لەدونیای ڕاستەقینەدا مومکین نین. بەڕای ئەو من وەک نوسەرێک دەبوو زۆر دەروەستی ئەوە بم خوێنەرەکانم واقعی بیربکەنەوە و دوای خەیاڵات و شتگەلی فەنتازی نەکەون، چونکە وەک نوسەر دەبوو بزانم ئیشم ئەوەیە زام و برینی گەلەکەم بە زمانێکی واقعی باسبکەم، نەوەک فێری خەیاڵپڵاویان بکەم. خوێنەرە ئازیزەکە بەجۆرێک لە من زویر بوو، گووتبووی چونکە من بەو جۆرە خەیاڵات و وڕێنەچنی بڵاودەکەمەوە، ئەو ئیتر بڕیاریداوە شتە واقعییەکانیشم لێ نەکڕێت، چونکە بڕوای بەتەواوی دونیاکەی من نەماوە، نازانێت دەمێک پەڕەی دواتر هەڵدەداتەوە کاری بە کوێ دەکێشێت و لە کوێوە سەردەردەهێنێت، قاچ لە خەیاڵپڵاودا دادەنێت یان لە دونیای حەقیقەت و واقیعدا خۆی دەدۆزێتەوە. هەڵبەت دونیای واش نە دڵنیایی تێدایە و نەدەزانێت چۆن تێیدا بسوڕێتەوە، دواجار سوێندی خواردبوو کە لەوە بەدوا، تەنیا وتارەکانم دەخوێنێتەوە، چونکە ئەوێ تاکە جێگایەکە من وەک مرۆڤێکی ئاسایی و نۆرماڵ دەتوانم بیربکەمەوە... لەوە دەرچێت من لە شیعر و ڕۆمانەکانمدا سەرگەردانێکی لە دنیا دابڕاوم و فڕێکم بە واقعەوە نییە. بەوەش کۆتایی هێنابوو، کە ئەو کەسێکی واقعییە و نایەوێت قاچی لەزەوی داببڕێت و ئەوەی من دەیکەم ڕاکێشانی بەرەیە لە ژێر پێی خوێنەرانێکدا کە نەدەبوو وایان دەرهەق بکەم.

دەبێت بڵێم کە نامەی خوێنەرەکە بۆ من شتێکی نائاسایی نەبوو، لە ڕۆمانی یەکەممەوە، لەو لاپەرە سەرەتاییانەی مەرگی تاقانەی دووەمەوە کە تێیدا باس لە خەوهەستانی داپیرەیە لە بەیانییەکی ڕەشەبادا، چاوەڕوانی دەرکەوتنی ئەو خوێنەرەم دەکرد، دڵنیابووم یەکێک

دێت و دەڵێت «بوەستە، ئەمەی تۆ دەیگێڕیتەوە، واقیع نییە». لە ئێوارەی پەروانەدا، کە باسی ئەو ڕەشەبایەم کرد، کە خەندانی چکۆلە دروستیدەکات، لە دواهەمین هەناردا کە باسی ئەو سەفەرە بچوک و کورتەی محەمەدی دڵشوشەم کرد لە سەر ئاوی لافاوێکی گەورە، بەردەوام سیخورمەم لەو خوێنەرە دەدا، دەمویست لە جێگایەکدا بیبینم و ڕوو بە ڕوو پێمبڵێت «برا نا، ئەمە واقعییەت نییە... ئەمە نابێت، ئەوە کاری نەکردەیە». بەڵام دەرکەوتنی ئەو خوێنەرە بەمجۆرە کۆنکرێتە، بەم توڕەبوونە گەورەیەوە، بەو نائومێدییە تاڵەوە، لە بەردەمی خۆمدا، دەمێ ساڵ دواکەوت و تا دوای غەزەلنوس کەس وەک ئەو خوێنەرە ئەو ئاواتەی نەهێنامە دی، ئاواتی بینینی خوێنەرێکی سەد دەر سەد واقعی. خوێنەرێک بەردەوام تێکستەکە، بە ئەگەرەکانی ناو واقع بەراورد دەکات. واقع لای کۆمەڵێک ڕووداوی سیاسی و مێژوویی نییە بە تەنیا، بەڵکو کۆمەڵێک ڕێسای فیزیکی و کیمیکی و بایۆلۆژیشە، کە نوسەر لە خۆیەوە بۆی نییە لێیان لابدات. کە دەپرسێت ئەمە چ کارەساتێکە ڕۆماننوسان بەسەر دونیادا دەیهێنن، چۆن دەبێت پاڵەوانێک لە دەمەوە لەدایک بێت؟ وەک ڕابلییە دەیکات. ئەوە چ بەزمێکە سیاسەتمەدارێکی واقعی و قەشەیەکی دونیادیدەی وەک جۆناسان سویفت لەگەڵ گێلڤەردا دەینێتەوە کاتێک فرێیدەداتە دوو دونیاوە کە هیچیان واقعی نین، جارێک دەیخاتە ناو نەتەوەیەکی بچوکەوە کە خەڵکانی بە ئەندازەی پەنجەیەکی گێلڤەرن، جارێکیش دەیخاتە ناو نەتەوەیەک لە زەبەلاحان و باڵا بڵندان کە ئەم بەقەد پەنجەیەکیانە... چۆن دەبێت فەرمانبەرێکی عاقڵ و گوێڕایەڵی وەک گریگۆر سامسای کافکا بەیانی لە خەو هەستێت و بووبێت بە قالۆنچە؟ چۆن دەبێت کانکانی جۆرج ئامادۆ بە مردنی خۆی ڕازی نەبێت، بمرێت و هەستێتەوە و بڕوات بۆ ئەوەی جارێکی تر ئەو مردنە بمرێت کە خۆی حەزی لێیەتی؟ چۆن نیلزی سەلما لاگەرلۆیڤ وەها بچوک دەبێتەوە

بچێتە سەر پشتملی قولینگەکان و بەدونیادا بفڕێت؟ چ نرخێکی ئاموزشی لەوەدایە منداڵانی خۆمان بە خەیاڵاتی واناباەجێ پەروەردەبکەین، بۆ ڕێگا بە چیرۆکنوسان دەدەین بێنە ژیانمانەوە، ئەمە چ دونیایەکە، دونیای سەیر و سەمەرەی چیرۆک کە بۆقێک ماچدەکەیت دەبێتە ئەمیرێکی شەنگ و بە شکۆ، یان وەک ئالیس دەرمانێک دەخۆی دەکشێیت و گەورە دەبیت، دەرمانێکی تر دەنۆشی بچوک دەبیتەوە. ئەم هەموو خەیاڵ و حیکایەتبازییە چییە ڕۆماننوسان و چیرۆکنوسان دەستی لێ هەڵناگرن، بۆ نازانن و ناتوانن واقعی بن، تا ئەو جۆرە خوێنەرانە تورەنەکەین؟.

باوەڕناکەم هیچ ڕۆماننوسێک بیری لەو پرسیارە نەکردبێتەوە، ئاخۆ ئەو خوێنەرە لەسەر هەقە یاخود نا؟. ئێمە کە کتێبێک دەنوسین بۆ ئەوە نییە خوێنەران باوەڕمان پێبکەن؟ بۆ ئەوە نییە کە بە خوێنەر بڵێین هەوڵدەدەین لە خۆی و لە دونیا و لە شتەکان نزیکی بکەینەوە؟ کە وایە بۆ هیچ نوسەرێک نابینین واقعی تەواو بێت، بۆ هیچ هونەرمەندێک نابینین بە ئەمانەتەوە واقع بگوازێتەوە، بۆ هەمیشە دەستکارییەکی وەها ناشیستەی واقیع دەکەین، هەندێ خوێنەر و بینەرمان بتۆرێن.

## ٢

دوو ڕۆماننوسی زیندووی ئەم سەردەمەمان، کە هەردووکیان دوو تیورێزەکەری کارای هونەری ڕۆمانیشن، میلان کۆندێرا و ئەمبرتۆ ئیکۆ، وەک دەیان ڕۆماننوسی تر لەگەڵ ئەو کێشەیەدا دەرگیر بوون. وەک لەوەوبەر لە جێگایەکی تریش باسمکردوە، لای کۆندێرا، ڕۆمان جۆرێکە لە گاڵتە، مەعشەری ڕۆماننوسانیش زۆربەیان گاڵتەبازن، قۆشمە و قسەخۆشن. مرۆڤ کە ڕۆمانێک دەگرێت بەدەستییەوە، دەبێت بزانێت ڕۆمان دەخوێنێتەوە، واتە ئامادەبێت بۆ قەبووڵکردنی ئەو گاڵتانەی نوسەر دەیکات، ناتوانیت هەرگیز ڕۆمان بێ ئەو هەستە بخوێنیتەوە کە

گاڵتەیەک لە گۆڕێیە، خوێنەر لە هەر شتێکدا جیدی بێت، ناتوانێت لەوەدا جیدی بێت کە تێکست بباتەوە سەر واقع و بە شتەکان بەراوردیبکات. بەڕای ئەمبرتۆ ئیکۆیش هەر لەسەرەتاوە خوێندنەوەی ڕۆمان لەسەر مۆرکردنی پەیمانێکی نەنوسراو لە نێوان خوێنەر و نوسەردا بەندە، کە خوێنەر هەست و قەناعەتە واقعییەکانی بخاتە لاوە... بەبێ سڕکردنی هەستمان بەواقع ناتوانین خوێنەری ڕۆمان بین... هەر وەخت بەسەلیقەی کەسێکی واقعییەوە پرسیار لە نوسەر بکەین نائومێد دەبین. هەتا نوسەرە هەرە واقعییەکانیش ناتوانن تەواو واقیعی بن، تەواو واقعی بوون ڕۆمان پردەکات لە تێبینی و سەرنج و وەسفی بێسود. ڕۆماننوس کامێرامانێک نییە بەوشە ئیشبکات، هەموو ڕۆماننوسێک کە دەستدەداتە نوسین دەزانێت واقیع چردەکاتەوە، کورتیدەکاتەوە، دەیگۆڕێت، شتێک دروستدەکات واقیع نییە، بەڵام لە هەندێ ڕەگەزیدا بە واقیع بەراورد دەکرێت. هیچ نوسەرێک پێشتر وەک ئەمبرتۆ ئیکۆ بەوردی ڕوو بە ڕووی ئەم کێشەیە نەبۆتەوە. کتێبەکەی ئیکۆ «لەدارستانی حیکایەتدا» زۆری قسە و پرسیارە دەربارەی گرفتی واقعییەت لە ڕۆماندا. لەم زنجیرە وتارەدا کە دەربارەی واقعییەت دەینوسم و لەجەوهەردا هەوڵە بۆ هیجاکردن و ڕەخنەگرتن لە هەموو جۆرە هەستێکی واقعپەرستی لە خوێندنەوەی ڕۆماندا، زۆر دەگەڕێمەوە بۆ سەر ئەو کتێبەی ئیکۆ و نمونەکانی.

سەرەتا حەزدەکەم لە نمونەیەکەوە دەستپێبکەم، بیسەلمێنێت واقعی نەبوون مانای ئەوە نییە، «وەک ئەو خوێنەرە بەرێزەی سەرەوە تێگەیشتووە» نوسەر ناسینێکی ڕاستەقینە دەربارەی دونیا نەدات بەدەستەوە، زانیاری ناتەواوامان بداتێ یان شتێکمان بداتێ پەیوەندی بە حەقیقەتەوە نەبێت. لە ڕاستیدا ئەدەب هەمیشە حەقیقەت و زانیاری زۆرترمان پێدەڵێت لەوەی خۆمان پێشبینیدەکەین. من لە زانکۆ بووم

کە مادام بۆڤاری فلۆبێرم خوێندەوە، لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ تەمەنێکی درێژ تێپەڕیوە، بەڵام ناسینی من بۆ مادام بۆڤاری تا ئەمڕۆ زۆرترە لە ناسینیم بۆ زۆربەی ئەو کەسە ڕاستی و واقعیانەی لە ژیانمدا بینیومن و لەگەڵیان ژیاوم. من ناوی بەشی هەرە زۆری ئەو کچانەم بیرچۆتەوە کە لە کۆلێژ لەگەڵمدا بوون، بەس هیچ کات ناوی مادام بۆڤاریم بیر ناچێتەوە، ئەوەندەی لەسەر ژیانی راستەقینە و نهێنی مادام بۆڤاریش دەزانم، ئەوەندە لەسەر ژیانی هیچ کەسێکی ڕاستەقینە نازانم. واتە گەر بەدیوێکی تردا سەیربکەین واقعییەکان ئەوەندەش واقعی نین کە خۆیان بانگەشەیدەکەن. ناسینی ئێمە بۆ واقیع هەمیشە کەمتر و کورتتر و بچوکترە لەوەی دەیزانین، ئێمە بۆیە کتێب دەخوێنینەوە و چیرۆک دروستدەکەین، چونکە بوونەوەرێکی سنووردارین، چاو و گوێ و هەستی خۆمان بەشمان ناکات، واقیع پێش ئێمە دروستبووە، بەردەوام یان چاوەڕوانی لەدایکبوونی ئەوەین کە نازانین چییە، یان سەروکارمان لەگەڵ دونیایەکدایە پێش ئێمە دروست بووە و نازانین چۆن و بۆ وادروستبووە. بە کورتی بوونەوەرێکین ناتوانین بەو مانایە واقعی بین کە ڕاستەوخۆ، بەیەک نیگا، واقیع بخوێنینەوە و تێیبگەین و بیناسین. ئەوەی پێیدەڵێین واقیع ئەوە نییە کە هەیە، بەڵکو لە بێشومار دیوی نەبینراو دروستبووە کە هەن یان دەبن، کە دەشێت بووبن یان دەشێت هەبن.

ئیکۆ نمونەیەکی گرنگ دەهێنێتەوە. ئەو نمونە لە ژۆلیان سوریلی ستاندالەوە وەردەگرێت «کە لەوتارێکی پێشوودا کورتە باسێکم لێکرد»... ئەو دەپرسێت، ئاخۆ ئێمە ژولیان سوریل باشتر دەناسین یان باوکمان. دەڵێت ئێمە لە نزیکەوە هەموو شتێک لەسەر ژولیان دەزانین، لە کاتێکدا شتێکی ئەوتۆ لەسەر باوکمان نازانین... بە کورتی هیچ کات ناتوانین مرۆڤێکی واقعی بە ئەندازەی پاڵەوانی ڕۆمانێک بناسین. ئەوە تا ئەندازەیەک دەریدەخات کە ناسینمان بۆ کەسانی واقعی هەرگیز

ناگاتە ئاستی ناسینمان بۆ پاڵەوانێکی ئەدەب. هەموو دەزانین هاملێت واقیعی نییە، بەڵام هیچ کاراکتەرێکی زیندوو لە مێژوودا بە ئەندازەی هاملێت لەسەری نەنوسراوە. بۆ؟ لەبەرئەوەی دەتوانن هاملێت باشتر لە هەموو هاورێکانمان بناسین، لەبەرئەوەی لە ئەدەبدا تەنیا دیوە واقعییە بینراوەکەی مرۆڤ دەرناکەوێت، بەڵکو دیوە نادیار و ونەکانیشی دێنەوە سەرەوە. بە کورتی واقعپەرست کەسێکە تێنگات واقع بە تەنیا چەند هەژار و دەستکورت و ڕەواڵەتییە.

بەڵام دەشێت واقعییەت خۆی چی بێت؟ دیارە دەکرێت مانای واقعییەت بە جۆرێک گەورە و بەرفراوانبکەین شوێنێ هەموو فەنتازیا و خەیاڵێکی تێدا ببێتەوە، ئەو شتانەش لە خۆ بگرێت کە نەبینراون و نەشیاو دێنە بەر چاو. بەڵام لەم دۆخەدا وشەی واقعییەت زۆر لە مانای خۆی لەدەستدەدات. واقعپەرستەکان بۆیە قسە لە واقعییەت دەکەن تا جیایبکەنەوە لەو شتانەی کە ئاسان ناشێت ڕووبدەن و ببینرێن. واقعییەت مانای دوورکەوتنەوە لە خەیاڵاتێک کە سیستم و ڕێکخستن و پەیوەندییە واقعییەکان دەشێوێنن. کە لە ئەدەبدا بە تێکستێک دەڵێین واقعی واتە لەو هەلومەرجە مێژوویی و مادییە لانادات کە زەمینە بۆ ڕووداوەکان دەسازێنێت، واتە نابێت شتێک ببینین و سەد دەر سەد بزانین کە ئەمە شیاو نییە. بۆ نمونە گەر لە تێکستێکدا یان فیلمێکدا هەر سەرەتا کەسێکمان بینی دەفرێت ئەوا دەزانین ئەمە فیلمێکە واقعمان «وەک خۆی» بۆ ناگێڕێتەوە، دەزانین لە دونیای واقعیدا مرۆڤ لە خۆیەوە و بێ یارمەتی ئامێرێک نافرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە دەگمەن ڕێدەکەوێت گەر لەسەرەتای فیلمێکدا یان ڕۆمانێکدا دیمەنێکی وابببینین، فیلمەکە وێڵکەین یان ڕۆمانەکە فڕێبدەین. هەڵبەت گەر بە قسەی واقعییەکان بایە، دەبێت لەسەرەتاوە ئەو کارە بکەین، چونکە لە دیمەنی یەکەمەوە دەرهێنەر یان نوسەر درۆیەکمان لەگەڵ دەکات

و بابەتێکمان پێشکەشدەکات کە لە واقعدا نییە. بەڵام بەدەگمەن مرۆڤێک دەبینین وابکات، گەر کەسێکیشمان بینی بەوجۆرە ڕەفتاردەکات دەمودەست گومان لە سەلامەتی عەقڵی دەکەین... بە مانایەکی تر خەڵکانی واقعی و واقعپەرست ژمارەیان لەوە کەمترە کە مرۆڤ بیری لێدەکاتەوە... بەڵام بۆ؟ لەبەرچی ناتوانین واز لە کتێبێک یان فیلمێک بهێنین کە هەر لەسەرەتاوە بە درۆیەکی گەورە دەست پێدەکات، کە لە دیمەنی یەکەمەوە دڵنیاین ڕەچاوی یاسا مادی و پراکتیکییەکانی ژیانی ئێمەی نەکردوە. بەبڕوای من وەڵامەکە ڕەنگە ئاسان بێت، وەڵامەکەش بەسەر دوو هۆدا دابەشدەکەم. یەکەم: ئەدەب و هونەر گەرچی ئەستەمە لە پاشخانی واقعی جیاببنەوە، بەڵام هیچ کات واقعی نین و نەبوون و ناتوانن ببن. دووەم: مەبەستی ئەدەب و هونەر قووڵبوونەوەیە لە تێگەیشتن لە ژیان و لە مرۆڤدا، نەوەک لە واقعدا، ئەدەبیش بۆ ئەوەی بتوانێت لە ژیان و مرۆڤمان نزیکبکاتەوە ناتوانێت تەواو واقعی بێت. ئەدەبی واقعپەرست ناتوانێت دیوە نادیار و خەوناوی و ئەستەمخوازەکەی مرۆڤ بگێڕێتەوە، ناتوانێت ناوەڕۆکە نهێنییەکەی نەستی بپشکنێت، ناتوانێت دەرگا لەسەر خواستە زۆر تایبەتی و تاریک و نهێنییەکانی بکاتەوە، ناتوانێت ئەگەرە بەدی نەهاتووەکانی بخوێنێتەوە. لە بەرئەوە دەزانین تێکستێک یان فیلمێک کاتێک بە لادان لە واقیع دەست پێبکات مانای ئەوە نییە قووڵ بە ژیان و مرۆڤدا ڕۆناچێت.

بەڵام لە ئەدەبدا چەندە واقع شکێنی بکەین، هێشتا هەر لە ڕێگای پەیوەندییەوە بە واقعەوە دەکرێت لە شتەکان تێبگەین. ئەوەی لە نامەی ئەو خوێنەرەدا بۆ من جێگای سەرنج بوو، ئەو تێبینییەتی کە وادەبینێت بەوەدا لە جێگایەکدا واقعییەت ڕەچاو نەکراوە، کەواتە تەواوی وێنەی واقع یان پەیوەندی تێکست بە واقعەوە پچڕاوە... ئەوە ئەو هەڵە گەورەیەیە کە فەلسەفەی واقعی بوونی لەسەر بەندە، ئەوە جەوهەری

نەخۆشی واقعییەتە. لە ئەدەبدا کاتێک واقع شکێنی دەکەین، ئەوە بەو مانایە نییە کە کۆی ئەو فەزایەی پێشکەشیدەکەین کاری بەواقعەوە نییە، بەڵکو بەو مانایەیە کە گەرانمان بۆ حەقیقەت، پشکنینمان لە ئەگەرەکانی ژیاندا، دۆزین و هەڵکۆڵینمان بۆ ناوەوەی مرۆڤ بۆ جێگایەکمان دەبەن یاسا سادە و بینراو و سروشتییەکانی واقیع تێیدا کارناکەن. واتە گەر واقع بە واقعی بوونی خۆی بهێڵینەوە لە واقع تێناگەین. مرۆڤی واقعی کەسێکە تەنیا وێنەیەکی بەرتەسکی بۆ دونیا هەیە، دەتوانێت دیوێکی کەم و بچوکی دونیا ببینێت.

لە ڕۆمانەکەی کافکادا «ڕموزنبوون»... گریگۆر سامسا بەیانی لە خەو هەڵدەستێت و بووە بە قالۆنچە. هەر کەسێک لەوانەی نەخۆشی واقعییەتیان هەیە ناتوانن باوەڕ بەم سەرەتایە بکەن، چونکە لە مێژووی مرۆڤدا نەبووە هیچ کەسێک بەیانی لە خەو هەستێت و بووبێت بەقالۆنچە، وێنەکە بە ئەندازەیەک دوورە لە واقعەوە دەبێت هەموو کەمێک لەسەری رابوەستین... چۆن تێکستێک دەتوانێت یارمەتیمان بدات لە دونیا و مرۆڤ تێبگەین کە بەم درۆیە دەست پێبکات؟. بەڵام با پێچەوانەکەی بهێنینە پێشچاوی خۆمان، گەر گریگۆر سامسا وەک هەموو بەیانییەک لە خەو هەستایە و ڕیشی بتاشیبایە و بڕۆیشتبایە سەر کار، لێرەدا چیمان دەبوو... هیچ... نە چیرۆکێکمان دەبوو، نە شاکارێکی ئەدەبی و لەوانەیە هەر خودی تێکستەکەش مانای نەدەما و لەدایک نەدەبوو. بەم پێیە شکاندنی واقع، دوورکەوتنەوە لێی مەرجی یەکەم و سەرەکی لەدایکبوونی ئەدەبە. واقعییەت بۆیە نەخۆشییە، چونکە لە جەوهەردا لە یاسای هەرە سەرەکی ئەدەب لادەدات، لە جەوهەرە راستەقینەکەی، کە مەرجی ڕێکەوتنە لەسەر ئیشکردن لەسەر تەواوی شتە نامومکینەکانی دونیا، لەسەر ڕەهەندە شاردراوە و ئەستەمەکان. ئەدەب هیچ کات نابێتە ئەدەب گەر لە سنووری واقعییەتدا بوەستێت. بەجۆرێک من بڕوام وایە

هەتا ئەو جۆرە ئەدەبەش کە بە ڕواڵەت شتی سەیر و سەمەرەی تێدا ڕوونادات، وەک ڕۆمانەکانی زۆلا یان تولستوی، کەمتر لە ئەدەبی فەنتازیی یان خەیاڵکار لە واقع دوور نییە.

با تەماشای گرنگترین تێکستی سەرەتاکانی مێژووی ئەدەب بکەین، ئۆدیبۆسی سۆفۆکلیس. سەرەتای چیرۆکەکە بە شتێکی ناواقعی دەست پێدەکات، بەو بوونەوەرە باڵدارە خورافییەی کە مەتەڵە بەناوبانگەکە لە ئۆدیبۆس دادەهێنێت تا ڕێگای بدات بچێتە شاری تیباوە. هەموو دەزانین بوونی سفینێکسی وا بەرهەمی خەیاڵ و ئەفسانەیە، بۆ ئێمەیەک کە لەسەردەمی زانست و واقعیەتدا دەژین، باوەڕهێنان بە سەرەتای وا زەحمەتە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمجۆرە لە ناواقعییەت کەمتر سەرنجمان ڕادەکێشێت وەک لە ئەگەری بوون و نەبوونی خێزانێکی وەک خێزانی ئۆدیبۆس خۆی. گەرچی دونیای چیرۆکەکە دوای ئەوە هیچ شتێکی ئەوتۆی تێدا ڕوونادات بکرێت بیخەینە خانەی خورافەتەوە، بەڵام ڕیزبەندی و سروشت و بەیەکداچوونی ڕووداوەکان ناخرێنە خانەی واقعیەتەوە. ئاخۆ دەکرێت لەسەر زەوی خێزانێکی وەک خێزانی ئۆدیبۆس بدۆزینەوە. دایک و باوکێک هەوڵدەدەن منداڵەکەیان بکوژن، منداڵەکەیان گەورەدەبێت دەگەڕێتەوە و باوکی خۆی دەکوژێت، دایکی خۆی دەکات بە ژنی خۆی، منداڵی لێدەبێت، دوای چەند ساڵ گوناهەکە ئاشکرادەبێت، ئۆدیبۆس خۆی کوێردەکات، جۆکستا خۆی دەکوژێت... هەڵبەت خێزانی وەها و چیرۆکی وەها بەوجۆرە پاشخان و ڕیزبەندییەوە لەسەر زەوی ڕووی نەداوە. لە ڕاستیدا ئەوەی ئۆدیبۆس هەنگاو بخوێنێتەوە دەبینێت، تێکستەکە دەخرێتە هەموو خانەیەکەوە خانەی واقعییەت نەبێت. ئەوەشی لە هەموو شتێک کەمتر سەرسامماندەکات بوونی جانەوەرە خورافییەکەی ناو چیرۆکەکەیە، چونکە ڕووداوەکانی تر کە شتگەلێکی خورافیان تێدا نییە، بە ئەندازەی شتە خورافییەکان

سەیر و ناڕاستەقینەن. لێرەوە دەبێت دان بەو راستییەشدا بنێین کە لادان لە خودی واقیع تەنیا بەوجۆرە نییە کە وەک لای کافکا بینیمان، بەڵکو دەشێت بێ هیچ بوونەوەرێکی ناواقعی وەک گریگۆر سامسا، بێ هیچ کاراکتەرێک یان رووداوێکی خورافی شتێک بنوسین پەیوەندییەکی بەواقعەوە نەبێت. واقعی نەبوون تەنیا ئەوە نییە کە شتگەلێک دروستبکەین کە بوونیان نییە، بەڵکو ئەوەشە ریزبەندی رووداوەکان و گێرانەوەکانمان وەها دارێژین، جۆرە جوگرافیایەکی ژیان رەسمبکەین کە لەگەڵ ریزبەندی و مەنتیقی سروشتیدا نەگونجێت.

لەوە بترازێت واقعیبوونی ڕووداوەکانی ڕۆمانێک چەند لە ژێر گوماندایە، واقعیبوونی زۆر لە رووداوەکانی ناو ژیان و مێژووش بە هەمان پلە لە ژێر گوماندان. دەشێت بپرسین ئاخۆ سەفەری پاڵەوانەکەی جول ڤیرن بەدەوری زەویدا لە هەلومەرجی ئەو سەردەمەدا، بە هەشتا ڕۆژ بە ڕاست هەقیقی بووە؟. بەڵام ئەم پرسیارە کە واقعییەت و ناواقعییەتی تێکستەکەی ڤیرن دەخاتە ژێر پرسیارەوە، دەشێت بۆ زۆر ڕووداوی ڕاستەقینە و مێژوویش ڕاست بێت.

جارێکی تر دەگەرێمەوە بۆ لای ئەمبرتۆ ئیکۆ و یەکێک لە نمونەکانی. ئاخۆ بەراست ئەمریکییەکان لە سەر مانگ نیشتوونەتەوە. ئاخۆ راستی و دروستی ئەم چیرۆکەش، بە هەمان ئەندازە لە ژێر گوماندا نییە، وەک راست و دروستی هەر چیرۆکێک کە لە رۆمانێکدا دەیبینین؟. کێ دەڵێت واقیع خۆی یەقینێکی براوە و بێگەرد و بێ چەند و چونمان دەخاتە بەر دەست کە گەورەتر لە یەقینێک چیرۆک لامان دەیچێنێت... ئایا مێژوو پر نییە لەو رووداوانەی کە هەرگیز تێیدا ناگەینە راستی، واقیع خۆی پر نییە لە رووداوی لە خورافەت سەیرتر... لە راستیدا گەر ورد بروانین واقیع خۆشی جگە لە ڕووبەرێکی پڕ گومان هیچی تر نییە. ڕەنگە یەکێک لە هۆ گەورەکانی ئیفلاسی واقعییەت لەوەدا بێت، کە

هیچ کات ناتوانین بە وردی بیسەلمێنین کە خودی مێژوو نوسین، خودی گێڕانەوەی واقیع، خودی دۆکۆمێنتکردنی ڕووداوێک، کارێکی واقعی تر و ڕاستتر و وردترمان لە کاری ڕۆماننوسان پێشکەشدەکەن.

## ٣

کاتێک لە بیمارستانی واقعییەتدا دەگەڕێین، جۆرە نەخۆشی دیکەشمان تووش دێت. نەخۆشانی بیمارستانی واقعییەت هەر لە ئاست ڕەتکردنەوەی خەیاڵ و فەنتازیادا ناوەستن، هەر داوامان لێ ناکەن لۆژیک بپارێزین و لە یاسا سروشتییەکان لا نادەین، بەڵکو جۆرێکی دی لە بیمارانی واقعییەتمان هەیە توانای نییە چیرۆک و حەقیقەت لە یەک جیابکاتەوە. سەرەتا دوو نمونە لە ئەمبرتۆ ئیکۆ دەهێنمەوە، دواتریش هەندێک نمونە لە ئەزموونی خۆمەوە دەگێڕمەوە، تا بە وردی لە سروشتی ئەم نەخۆشە تێبگەین.

ئەمبرتۆ ئیکۆ لەسەرەتای فەسڵی چوارەمی کتێبەکەیدا چیرۆکێکی تایبەت دەگێڕێتەوە کە دوا پادشاهی ئیتالیا «فیتۆریۆ ئەمانۆئێلی سێهەم» پاڵەوانێتی. ئەم پادشایە «کە دەڵێن جگە لە بواری کاروباری سەربازی و ئابووری زانیارییەکی ئەوتۆی لە هیچ بوارێکی دیکەدا نەبووە» وا ڕێدەکەوێت جارێک پێشانگایەکی نیگارکێشان دەکاتەوە، کاتێک بەسەر تابلۆکاندا دەگەڕێت، دەچێتە بەردەم دیمەنێکی سروشتی و ماوەیەکی درێژ بەدیارییەوە ڕادەوەستێت، زۆر لە نیگارەکە ڕادەمێنێت، وێنەکە وێنەی گوندێکە لە قەدپاڵی چیایەکدا، دوای وردبوونەوەیەکی زۆر، پادشا ڕوو لە بەڕێوەبەری پێشانگاکە دەکات و لێی دەپرسێت «ئاخۆ ژمارەی دانیشتوانی ئەم گوندە چەندە بێت؟».

پادشا نمونەیەکی باشی ئەو نەخۆشەیە کە ناتوانێت هونەر و واقیع لە یەک جیابکاتەوە، لێرەوە پێیوایە گوندی سەر تابلۆکە گوندێکی ڕاستەقینەیە، گوندێکە جیاوازییەکی نییە لەگەڵ هەر گوندێکدا کە لە

وێنەیەکــی فۆتۆگرافــدا دەیبینێــت.

نمونــەی دووەمــی ئەمبرتــۆ ئیکــۆ نمونەیەکــی شەخســیترە. لــە ڕۆمانــی «بەندۆڵــی فوکــۆ» دا، لــە شــەوی ٢٣ لەســەر ٢٣ ی حوزەیرانــی ســاڵی ١٩٨٤ دا، حیکایەتخوانــی ســەرەکی ڕۆمانەکــە لــە پاریــس لــە ڕوێ ســانت مارتینــەوە بــە ژمارەیــەک شــەقام و ســەنتەر و چوارڕێدا دەڕوات و ســەفەرەکەی تــا پــلاس دس فۆســگس درێــژەی دەبێــت. ئیکــۆ بــۆ ئــەوەی وێنەیەکــی تــەواو واقعــی بدات بــە گێڕانەوەکــەی خــۆی، بــە ئامێــری تۆمــارەوە چەنــد جارێــک ئــەو ڕێگایــە ســەر و خــوار دەبڕێــت و بــەوردی هەمــوو تێبینییــەک تۆمــاردەکات و چــی بێتــە ڕێــگای کــە شــایەنی ســەرنج بێــت دەیخاتــە حیســابی خۆیــەوە، مەبەســتی لــەو کارەش ئەوەیــە هەســتێکی ورد و واقعیانــەی پاڵەوانەکــەی خۆیمــان بــۆ بگوازێتــەوە. ئیکــۆ هەتــا دەچێتــەوە ســەر تۆمارەکانــی کــەش و هــەوا و ئــەوە دەدۆزێتــەوە ئاخــۆ لــەو شــەوەدا ئاســمان ســاف بــووە یــان هەوریــن، بــەوردی حیســاب بــۆ جوڵــەی مانگیــش دەکات، تــا بزانێــت مانــگ لــە چ ســاتێک و لــە چ دەلاقەیەکــەوە دەشــێت بــۆ حیکایەتخوانەکــە دەرکەوتبێــت. بــەڵام نوســەر چەنــد ورد و واقعــی بێــت، هەمیشــە شــتێک ڕوودەدات و ڕێکەوتێــک دێتــە پێــش دەمــی واقعپەرســتان دەکاتــەوە. گەرچــی ئیکــۆ وزەیەکــی زۆر لــە وەســفی شــەقامەکانی پاریســدا ســەرفدەکات و مەبەســتێتی تــا دەکرێــت واقعــی بێــت، بــەڵام شــتێک ڕوودەدات کــە ئــەو حیســابی نەکــردوە. دوای بڵاوبوونــەوەی ڕۆمانەکــە، ئیکــۆ نامەیەکــی لــە خوێنەرێکــەوە بــۆ دێــت و دەڵێــت لــە هەمــان ئــەو شــەوەدا کــە تــۆ باســیدەکەیت، لــە هەمــان ئــەو کاتــەدا کــە حیکایەتخوانەکــەی ئێــوە لــە شــەقامی ناوبــراوەوە تێدەپەڕێــت و دەڕوات، لەســەر ســوچی «ڕۆی ڕۆێمــۆر» ئاگرێکــی گــەورە کەوتۆتــەوە، نابێــت و ناکرێــت حیکایەتخوانــی ڕۆمانەکــەی ئێوە نەیبینیبێــت. لــە ئیکــۆش دەپرســێت، چ عەجــەب باســی ئــەو ئاگــرە گەورەیــە لــە ڕۆمانەکــەی ئێــوەدا نەهاتــووە؟.

لێرەشــدا واقعپەرســتێکی گەورەمــان هەیــە. خوێنەرێکمــان هەیــە وەک

پادشاکەی ئیتالیا ناتوانێت واقع و هونەر لێک جیابکاتەوە. ڕەنگە هۆکە لێرەدا و لە نمونەی یەکەمیشدا ئەوە بێت کە نوسەران و هونەرمەندان زۆر بە لایەنەوە گرنگە ناواقعی دەرنەکەون، بە جۆرێکی ورد دەکەونە گواستنەوەی هەندێک لە وردە کارییەکان، هەوڵێکی گەورە دەدەن وا لە خوێنەران یان بینەران بکەن بڕوا بهێنن سەروکاریان لەگەڵ ئیشێکدایە کە هەر لە بنەڕەتدا بەبێ لادان لە واقیع بەڕێوە دەچێت.

بەڵام باوەڕدەکەم ئەمبرتۆ ئیکۆ تەنیا ڕۆماننوس نییە کە بەر ئەوجۆرە لە خوێنەری واقعپەرست و تاڕادەیەک گەمژە کەوتبێت. لە دونیای ئێمەدا کە کولتووری خوێندنەوە و زەمینەی تیوریی بۆ تێگەیشتن لە ئەدەبیات لاوازترە، واقعپەرستی شێوەی جۆراوجۆر و دەرکەوتەی سەیرتری هەیە.

بەر لە ساڵێک لە مەوبەر دوو نامەم لە خوێنەرێکەوە بۆ هات کە هەردووکیانم هەڵگرتووە، هەردوو نامەکە یەک داوای سەیریان لە خۆ گرتووە، خاوەنی نامەکە کوردێکی دانیشتووی بریتانیایە، داوام لێدەکات هەر چۆنێک بووە ژمارە تەلەفونی «سەوسەن فیکرەت» پاڵەوانی ڕۆمانی کۆشکی باڵندە غەمگینەکانی بۆ بنێرم. سەرەتا وام هەستکرد خوێنەرەکەم کەسێکە لەو قۆشمەچییانەی گاڵتەی ناخۆش دەکەن، بەڵام چەند جارێک نامەکەم خوێندەوە و بینیم بە ڕێزێکی زۆرەوە بۆ من و سەوسەن فیکرەت نوسراوە و زۆریش گەڕاوە تا ئیمەیلی منی چنگ کەوتووە. ئەوەی لە هەردوو نامەکەدا جوانە ئەوەیە کە خوێنەرەکە دەڵێت، هیوادارە من خەیاڵم بۆ هیچ نیازێکی خراپ نەڕوات، چونکە ئەو خاوەنی ژن و منداڵە و مەبەستی نییە کە پەیوەندییەکی عاشقانە لەگەڵ سەوسەندا دابمەزرێنێت، بەڵام هێندەی دەوێت بەتەلەفون جارێک قسەی لەگەڵ بکات.

ئەمجۆرە لە خوێنەر دەچێتە ترۆپکی واقعییەتەوە، هەموو شتێکی ناو ڕۆمان بە ڕاست وەردەگرێت، ئەو داخوازییە تیورییەی واقعییەکان و خاوەنانی مەزهەبی سروشتی بانگەشەی بۆدەکەن لای ئەو تەواو دێتەدی.

گەر واقعییەکانی دی داوای لانەدان لە واقع بکەن، ئەم داوا ناکات، بەڵکو ئەم هەر لە بنەڕەتدا توانای جیاکاری لە نێوان واقع و تێکستدا نییە. ئەمجۆرە خوێنەرە هەر لەسەرەتاوە ئەو بنەما سەرەکییەی ئەدەب لە بیردەکات، کە ئەدەب چالاکییەکە لەسەر لادان لە واقع دامەزراوە، واتە هەر کات کارێکی ئەدەبی و هونەری دەگرین بەدەستمانەوە دەبێت پێشوەخت ئامادەبین بۆ بینین و خوێنینەوەی شتێک کە لە واقیعدا بوونی نییە. بەڵام ئەمجۆرە خوێنەرانە توانای ئەو جیاکارییە لەدەستدەدەن. من دەپرسم: چ کارێکی گەمژانە دەبێت گەر بەدوای ئەو جووتە پێڵاوەدا بگەڕێین کە ڤان کوخ نیگاری کێشاوە تا بەراوردبکەین و بزانین ئاخۆ تابلۆکە لە پێڵاوە واقعییەکە دەچێت یاخود نا، ئاخۆ ڤان کوخ باشی نیگارکردوە یاخود نا، ئایا هیچی پەڕاندوە و لە خۆیەوە شتێکی خستۆتە سەر کە لە پێڵاوە ڕاستەقینەکەدا نەبووە؟. پێڵاوەکانی ڤان کوخ بۆیە لە پێڵاوی هەموو سەرۆک و پادشا و ئەکتەر و یاریزانەکانی دونیا گرانتر و جوانتر و نەمرترن، چونکە پێڵاوێکی واقعی نین... پێڵاوێکن لە هیچ جێگایەکی دونیادا نایاندۆزینەوە. بەڵام کێشەی سەرەکی نەخۆشەکانی بیمارستانی واقعییەت ئەوەیە لەم ڕاستییە سادەیە تێناگەن.

لە ڕاستیدا خوێنەری سەیرتر و واقعپەرستتریشم لەو دوو جۆرە خوێنەرەی پێشوو بینیوە، خوێنەرانێک کە تێبینییەکانیان دەچێتە ئاستی کۆمیدییەوە. سەیرتر و ناماقوڵترین خوێنەرێک دیبێتم کە شایستەی خەوتنە لەسەر تەختەکانی بیمارستانی واقعییەت، گەنجێکی زانکۆیی بوو لێی پرسیم «چۆن سمایل لە ڕۆمانی جەمشید خانی مامدا دەتوانێت فەرهەنگێکی وەک مەورید بەدەستێک هەڵبگرێت؟». ئەوەی لای ئەو خوێنەرە بەلاماوە سەیر بوو، ئەوەی لا نەبوو بووە پرسیار کە چۆن جەمشید خان دەفرێت، ئەوەی بەلاوە سەیر نەبوو کە چۆن دەشێت کەسێک وەک کۆلارە بە ئاسماندا هەڵدەین، بەڵام ئەوەی بەلاوە سەیر بوو

چۆن دەکرێت سمایل کتێبێکی بەدەستەوە گرتبێت کە سەنگی لە کتێبی ئاسایی قورسترە. دیارە من دەیان وەڵامی واقعییانەم بۆ پرسیارەکەی ئەو هەبوو، بەڵام سوور بووم لەسەر ئەوەی بیگێڕمەوە بۆ تێکستەکە تا جارێکی دی بیخوێنێتەوە و لەوێدا وەڵامەکەی بدۆزێتەوە. ئەمجۆرە نەخۆشە دەردەکەی ئەوە نییە کە شتەکان بە واقعی وەردەگرێت و داوای تەلەفونی کارەکتەری ڕۆمانەکان دەکات، بەڵکو ئەم خوێنەرە، ناتوانێت کون و کەلێنەکانی تێکست پڕبکاتەوە، نەخۆشی واقعییەت وای لێکردوە هەر شتێک تەفسیری واقعی بۆ نەکرێت و نەخزێتە ناو لۆژیکی ژیانی ڕۆژانەوە، ئەو نەتوانێت بە خەیالی خۆی پڕیبکاتەوە. کێشەی ئەمجۆرە لە خوێنەر وەک ئەمبرتۆ ئیکۆ و کۆمەڵێک ڕەخنەگری دی پێی لەسەر دادەگرن ئەوەیە کە هەرگیز تێناگات کە تێکست «هەموو تێکستێکی ئەدەبی بە گشتی و بەتایبەت ڕۆمان» لە چەندەها کون و کەلەبەر و دەلاقە دروستبووە کە دەبێت خوێنەر خۆی پڕیان بکاتەوە، ڕۆمان و سینەما و هەموو جۆرێک لەجۆرەکانی حیکایەتکردن، بەبێ هاریکاری خەیاڵی خوێنەر بە مەبەستی خۆیان ناگەن. هیچ نوسەرێک نییە، بتوانێت هەموو وردەکارییەکانی ڕەفتار و ژیانی پاڵەوانەکانی بگێڕێتەوە، بەڵام نەخۆشەکانی بیمارستانی واقعییەت ئەو توانایە لەدەستدەدەن بتوانن ئەو کون و کەلێنانە پڕبکەنەوە.

گەر نمونەیەک لە سینەماوە وەربگرم روونتر تێدەگەین بۆ واقعییەت و لەدەستدانی توانای کون و کەلێن گرتن، خوێنەر یان بینەرێکی نائاسایی دروستدەکات.

لە سینەمادا دیمەنێک هەیە زۆر دووبارەدەبێتەوە، کاتێک پاڵەوانی ژن و پیاو لە جێگایەکدا لەیەک نزیک دەبنەوە و ئیدی دەزانین نیازیانە پێکەوە سێکس بکەن، کە دێتە سەر دیمەنی ئەنجامدانی خودی کاری سێکسی، کامێرا هەمیشە بەجۆرێکی هێمن لادەچێت و دەچێتە سەر هەر جێگایەکی دیکە کە دەرهێنەر هەڵیدەبژێرێت. چەندساڵێک لەوەوبەر وا ڕێکەوت لە

کاتـی سـەیرکردنی فیلمێکدا کـوڕ و کچێـک لـە پێشـدەممدا بـوون، کـە هاتـە سـەر ئـەو دیمەنـە و کامێراکـە بـە هێمنـی جـولا و دەرهێنـەر خـودی کارە سێکسـییەکەی نیشـان نەدایـن، کچەکـە لـە هاوڕێکـەی پرسـی «چـی بـوو، کردیـان؟». کوڕەکـە گووتـی «وادەزانم کردیان». کچەکە دووبارە پرسـی «ئەی بـۆ پیشـانی نـەدا؟». کوڕەکـە وەلامیـداوە «لـە بـەر ئـەوەی ئەمـە فیلمێکـی ئاسـاییە». کچەکـە گووتـی «بـا فیلمێکـی ئاسـایی بێـت، بـۆ دەبێـت پیشـانی نـەدا»، ئەمجـارە کوڕەکـە هیچـی نەگـووت و بێدەنـگ درێـژەی بەسـەیرکردنی فیلمەکـە دا. ئـەو کچـە گەنجـەش یەکێـک بـوو لـە نەخۆشـەکانی بیمارسـتانی واقعییـەت. بـۆ ئێمـە بینـەران و خوێنەرانێـک کـە نەخۆشـی واقعییەتمـان نییـە، دەزانیـن گـەر دەرهێنـەر وای نەکردبایـە، فیلمەکـە دەگـۆڕا بـۆ کارێکـی پۆرنـۆ. بـەلام ئێمـە لەبەرئـەوەی واقعپەرسـت نیـن، بەخەیاڵـی خۆمـان ئـەو ماوەیـە پڕدەکەینـەوە و دەزانیـن کـە دەشـێت دوای لاچوونـی کامێراکـە چـی روویـدا بێـت، بـەلام نەخۆشـی بیمارسـتانی واقعییـەت هەمـوو جارێـک ئـەو کارەی بـە باشـی بـۆ ناکرێـت. لـە تێکستیشـدا کار هەمـان شـێوەیە، دەبێـت خوێنـەر بتوانێـت شـوێنە بۆشـەکان پڕبکاتـەوە، ئـەو نەگووتراوانەی نوسـەر نەیویسـتووە باسـیانبکات خـۆی تەواویانبـکات.

٤

تێکسـت هەمیشـە پـڕە لـە کەلێنـی پڕنەکـراوە، هـەر بۆیـەش هەمیشـە پـڕە لـە خـرۆش و چاوەڕوانـی. کاتێـک دەنوسـین «ئەحمـەد لـە بـەردەم ماڵـدا تاکسـییەکی گـرت و دوای نیـو سـەعات لـە بـەردەم بیرۆکـەی خۆیـدا دابـەزی». ئـەم دێـرە کۆمەڵێـک شـتمان پێدەڵێـت و کۆمەڵێـک شـتی زۆری دیـش دەشـارێتەوە. ئێمـە خوێنەرانـی ئاسـایی دەتوانیـن خەیاڵـی خۆمـان بخەینـە کار تـا کـون و کەلێنـە نەگووتـراوەکان پڕبکەینـەوە، بـەلام نەخۆشـەکانی بیمارسـتانی واقعییـەت ئـەو کارەیـان بـە ئاسـان بـۆ ناکرێـت.

بۆ نمونە ئێمە پێشوەخت کە ناوی ئەحمەد دەبیستین خۆمان بۆ هەموو ئەگەرێک ئامادەدەکەین، ئێمە لە دونیای ئەدەبداین و لە واقعدا نین، لە دونیای ئەدەبدا دەشێت ئەحمەد پشیلەیەک بێت وەک تۆمی، دەشێت کچێک بێت و خۆی کردبێتە کور و ناوی خۆی گۆڕیبێت، نوسەر گەر بیەوێت پێمان بڵێت ئەحمەد مرۆڤ نییە و پشیلەیە کارێکی عاجباتی نەکردوە، بەڵام هێندە هەیە دەبێت چاوەڕوان بین لە چ ساتێک و بە چ شێوەیەک پێماندەڵێت. خوێنەری راستەقینە لە پشت هەموو دێڕێکەوە خۆی بۆ شتێکی کتوپڕ ئامادەدەکات. خوێنەری واقعی نەوەک ناتوانێت خۆی بۆ ئەم ئەگەرانە ئامادەبکات، هەتا بۆشایی و کەلێنە ئاساییەکانی تێکستیشی بۆ پڕ ناکرێتەوە، هەتا هەندێک پەڕاندنی بەڵگەنەویست و سروشتی لێ دەبێتە گرفتی گەورە. بۆ نمونە لەو ڕستەیەی پێشوودا کە دەڵێین «ئەحمەد لەبەردەم ماڵدا...» هەرگیز پێویستمان نییە بپرسین «ماڵی ئەحمەد» لە کوێیە، چونکە گەر شوێن گرنگییەکی هەبێت چیرۆکنوس پێماندەڵێت، یان گەر شاردوێتییەوە لە بەر گرنگییەکی نەزانراو شاردوێتییەوە، ئیشی ئێمە وەک خوێنەر ئەوەیە بوەستین و فەنتازیای ماڵی ئەحمەد بکەین، لەوانەیە ماڵی ئەحمەد کۆشکێکی گەورە بێت، لەوانەشە کۆڵیتێکی داڕوخاو بێت، لەوانەیە ماڵی ئەحمەد خۆی بێت یان ماڵی کەسێکی تر بێت، لەوانەیە بەردەم ماڵ شەقامێکی قیرتاو بێت یاخود ڕێگایەکی پڕ چاڵ و لیتاوی. بەڵام چیرۆکنوس تەنیا لە کاتی زۆر پێویستدا ئەو زانیاریانەمان دەداتێ، زۆربەی وەختیش ناماندادتێ، هەندێجاریش لە بەرئەوەی پێویستە بماندادتێ، دەبێت هەڵیگرێت بۆ کاتی مانا‌داری خۆی، هەندێجاریش گەر بماندادتێ دەبێت بە گەمژە. نەخۆشەکانی بیمارستانی واقعییەت ئەو هێزی خۆگرییەیان نییە بوەستن و نەپرسن تا بەرچاویان ڕوونتردەبێتەوە، ئەو لۆژیکەیان نییە لە هونەری گوتن و نەگوتن لە کاری هونەریدا تێبگەن.

نەخۆشی واقعییەت هەندێجار چیرۆکنوسانی بە ئەزمونیش دەگرێتەوە. پارساڵ کە گەڕامەوە بۆ کوردستان ئێوارەیەک بۆ کەمێک گفتوگۆ و قسەکردن لەسەر ڕۆمان لە جێگایەک لەگەڵ کۆمەڵێک ئەدەبدۆستدا کۆبووینەوە، یەکێک لە ئامادەبووان برایەکی چیرۆکنوس بوو کە ڕێزی تایبەتی هەیە لام، پرسیارێکی لێکردم سەبارەت بە جەمشید خان و گوتی «من تێناگەم چۆن جەمشید خان لە ئێرانەوە گەڕایەوە بۆ کوردستان؟»، ئاشکرا برای چیرۆکنوس دەیویست بڵێت پێویست بوو من هەنگاو هەنگاو دوای جەمشیدخان بکەوم تا لە باشووری ئێرانەوە دەیکەمەوە بەناو گوندەکەی خۆیدا. گەر خوێنەرێکی نەشارەزا لە چیرۆک، گەر بیمارێکی تەقلیدی بیمارستانی واقعییەت ئەو پرسیارەی بکردبایە ئاسایی بوو، بەڵام پرسیاری وا بۆ چیرۆکنوسێکی بە ئەزموون جێگای سەرنجە. ڕۆمان چەندە واقعی بێت، هەمیشە بریتییە لە زنجیرەیەک پەڕاندن و بازدان و خولادان. هیچ ڕۆمانێک سات سات و وێستگە وێستگە دوای پاڵەوانەکەی ناکەوێت، تێکست ملکەچی ریتمی واقع نییە، تێکست کۆیەکی گەورەیە لە ئامارژە و دەلالەت کە پێکرا فەزایەکی ئامارژەیی دەخولقێنن، ئەوەی لە تێکستدا گرنگە تەواوکردنی ئامارژەکانە بۆ یەکتر، یان جەنگی ئامارژەکانە لەگەڵ یەکتردا، ئەوەی لە ڕۆماندا ڕیتمی زەمەن دیاریدەکات، تەنیا گواستنەوەی بەتاڵ نییە لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی تر، بەڵکو گواستنەوەیە لە ئامارژەیەکەوە بۆ ئامارژەیەکی دی، لە ڕووداوێکەوە بۆ ڕووداوێکی دی. بەڵام نەخۆشی بیمارستانی واقعییەت، هێندەی پاراستنی ڕیتمی زەمەنی واقعیانەی بۆ گرنگە، توانای دواکەوتنی جوڵەی ئامارژەکان و سیستمی دەلالەتەکانی ناو تێکستی نییە. پتەوی تێکست لە بازدان و بازنەداندا نییە بەسەر مانگ و ڕۆژەکاندا، لە گرێدانەوەی هەموو کاتە گرنگ و ناگرنگەکاندا نییە بەجۆرێک وەک لە ڕۆژژمێردا هاتوون، بەڵکو گرنگ ئەو یەکێتییەی مانایە، ئەو ئاوێتەبوونەی ئامارژەکانە کە تەعبیر

لە جیهانی فیگەرەکان دەکەن. ئیشی چیرۆکنوس ئەوە نییە ڕۆژێک یان مانگێک یان ساڵێک لە ژیانی پاڵەوانەکەی نەپەڕێنێت، ئیشی ئەوەیە بیرکردنەوە گرنگەکان، خەیاڵاتە سەرەکییەکان، ناکۆکییە قووڵەکان و دەلالەتە ماناداره‌کانی ژیانی بەوردی بگوازێتەوە. ڕۆماننوس ئەوەندە زانیاری دەدات کە گرنگە بۆ وێناکردنی فەزای ژیانی پاڵەوانەکەی، لەو ڕووەوە دەبێت چیرۆکنوس لە یاداشتنوسێکی گەمژە جیابکەینەوە کە بەسەر هەر وردەکارییەکی بێمانـاوە دەوەستێت و وەک پالۆمارەکەی «کالفینۆ» کە دەیەوێت ساتە بەتاڵەکانی ژیانیش نیگاربکاتەوە.

بەگشتی واقعییەت بەوجۆرەی لە ژیاندا هەیە ناگوازرێتەوە بۆ ناو تێکست، کەسێک کە لە ژیاندا واقعییە و هەنگاوەکانی خۆی دەژمێرێت، ناتوانێت بە هەمان لۆژیک ڕۆمانێک بخوێنێتەوە. ڕۆمان چنراوێکە لە هەندێک جێگادا بانگهێشتی ئەزموونی واقعییانەی ژیانمان دەکاتەوە، بەڵام مەرج نییە وەک خۆی بیپارێزێت. کاتێک دەڵێین «ئەحمەد لە بەر ماڵدا تاکسییەکی گرت»، گەر هەرگیز سوار تاکسیش نەبووبێتین، دەبێت بزانین کە وەزیفەی تاکسی چییە، بۆ ئەوەش پێویستیمان بە ئەزموونی واقعیمان دەبێت. بەڵام ئەوە تەنیا بەشێکی تێکستەکەیە، واقعییەت و چێوەکانی تەنیا ئەو ژێرخانە گشتییەن کە هەستەکانمان پێویستی پێیەتی تا لە شتە ناواقعییەکانیش بگەین، بەڵام هیچ بەهانەیەک نییە وابزانین ئەو تاکسییەی ئەحمەد سواری بووە، تاکسییەکی واقعییە، چونکە دەشێت ڕستەکە بەمجۆرە تەواو بێت «ئەحمەد لە بەر ماڵدا تاکسییەکی گرت، بینی شۆفێرەکەی لەبری کەپوو خەرتومێکی درێژی هەیە و گوێکانی وەک گوێی فیل وان». نوسەر دەتوانێت زامنی ئەوە بۆ خوێنەر بکات کە لە ژیاندا شۆفێرێکی تاکسی لەوجۆرە نابینیت، بەڵام گەر ویستی زامنی ئەوە بکات لە ئەدەب و هونەر و سینەمادا شتی وانابینیت، ئەوە کەسێکی لە هونەر دوور و بێئاگایە... تێکست لە

چوارچێـوە گشـتییەکانی ئەزموونـی واقعیمـان زۆر دوورناکەوێتـەوە، بـەڵام لـە خیانەتێکـی بەردەوامدایـە لـە وێنەکانـی واقـع، دەبێـت لـە هەمـوو ئـان و سـاتێکی خوێندنـەوەی ئەدەبدا چاوەڕێـی شـتێک بیـن کـە پێشـتر لـە دونیـادا نەبـووە، هـەر تەنهـا ئەوەشـە وادەکات ئـەدەب گرنـگ و ئەبـەدی و بێسـنوور بێـت.

تەسـلیمبوون بەواقعییـەت هەمیشـە هەڵـەی کۆمیـدی لێدەکەوێتـەوە. کـە لـە ڕۆمانـدا دەڵێیـن « لـە سـلێمانی لـە شـەقامی کاوە پیاسـەماندەکرد»، دەبێـت دەمودەسـت تێبگەیـن ئـەو سـلێمانییەی لەوێـدا هاتـووە دەشـێت شـارێک بێـت تـەواو جیـاواز لەگـەڵ ئـەو شـارەی کـە خوێنـەر دەیناسـێت، ئـەو شـەقامی کاوەیـە شـەقامێک بێـت شـانۆی ماجەراگەلێکـی خەیاڵـی کـە هەرگیـز لـەو شـەقامەدا ڕوویـان نـەداوە، دەبێـت بزانیـن چیرۆکنـوس هەتـا لەساتگەلێکدا کـە زۆر خـۆی لـە بەرگـی کەسـی واقعیـدا نیشـاندەداتەوە، کـە نـاوی شـوێنەکان بـە ڕاسـتی و سـاڵڕۆژەکان بـە وردی دەستنیشـاندەکات، هیـچ نییـە جگـە لـە مەکربازێـک کـە دەیەوێـت کاڵایەکـی ناواقعیمـان بداتـێ. زۆربـەی چیرۆکنوسـەکانیش وایـان کـردوە. ناپلیـۆن کـە لـە شـەڕ و ئاشـتی تۆلسـتۆیدا دەردەکەوێـت، ناپلیۆنـی نـاو ئەدەبـە نـەوەک ناپلیۆنـی نـاو مێـژوو. هـەر هەمـان ناپلیـۆن کـە لـە فیلمـی «وداعـا بونابارت»ـی یوسـف شـاهێندا دەردەکەوێـت، نـە ناپلیۆنـی واقعییـە و نـە ئـەوەی تولسـتۆی، ناپلیۆنێکـی تـرە. نەخۆشـەکانی بیمارسـتانی واقعییـەت ناتوانـن جیـاوازی لـە نێـوان ئـەم هەمـوو ناپلیۆنـە جیـاوازەدا بکـەن و هەمیشـە لـە ژێـر ئـەم ناپلیۆنانـەوە بـۆ یـەک ناپلیـۆن دەگەڕێـن. خوێنـەر دەبێتـە گاڵتەجـاڕ گـەر نەتوانێـت ناپلیۆنـی نـاو هونـەر لـە ناپلیۆنـی ڕاسـتەقینە جیابکاتـەوە. کالیگـۆلای کامـۆ تەنیـا هەنـدێ سیفاتی گشـتی لەگـەڵ کالیگـۆلای ڕاسـتەقینەدا کۆیدەکاتـەوە، بـەڵام کالیگـۆلای کامـۆ کەسـێکی تـرە جیـاواز لـە کالیگـۆلای مێژوویـی. بـۆ ئـەوەی لـە ناپلیـۆن یـان کالیگـۆلای ڕاسـتەقینە تێبگەیـن، ناچینەوە بۆ لای تۆلسـتۆی

یاخود کامۆ، دەچینەوە بۆ لای مێژوونوسان. بەڵام گەر بمانەوێت فێری هونەریی گێڕانەوە بین دەچینەوە بۆ لای کامۆ و تۆلستۆی. ڕۆمان و شانۆ دوو شێوازی هونەریی گێڕانەوەن، نەوەک دوو شێوازی هونەریی ناسینەوە و نوسینەوە و تۆمارکردن «هەڵبەت مەبەستم ناسینەوەی واقعە». ئەو بۆچوونە بۆ ژەنراڵەکەی ماکیزیش دروستە. مارکیز تەنیا چوارچێوەی گشتی ژیانی بۆلیڤاری واقعی وەردەگرێت، نەوەک هەموو بۆلیڤار... نوسەر هەر کات کە کارەکتەرێکی واقعیش هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەیە بە دیدە ناواقعییەکانی خۆی باریبکات.

تاکە ڕێگایەک بۆ ئەوەی مرۆڤ نەخۆشی بیمارستانی واقعییەت نەبێت، ئەوەیە هەمیشە واقع نەکات بە مەرجەع، تێکست بە یاساکانی جیهانی دەرەوە نەپێوێت. ئەدەب پرۆسەی گواستنەوەی وێنەیەک و تێگەیشتنێکی ئامادەی واقع نییە بۆ ناو تێکست، بە پێچەوانەوە ئەدەب پرۆسەی دروستکردنی واقعێکی تەریبە، واقعێکی جیاواز کە یاسا گەلی تایبەت و لۆژیکی تایبەت دەبیات بەڕێوە کە لە دونیای واقعیدا بوونیان نییە. ئەوە سەرەتای گەورەی دەستدانە بە کاری نوسین و سەرەتای بنەڕەتی کاری تێگەیشتنیشە لە ئەدەب. بەڵام لە ئەدەبگەلێکی وەک ئەدەبی ئێمەدا کە بیمارانی واقعییەت بە ژمارە زۆرن، ئەدەبی ڕاستەقینە هەمیشە ناچارە بۆ ڕزگارکردنی خۆی، بۆ ڕزگارکردنی خەیاڵ، بۆ ڕزگارکردنی دیوە نەبینراوەکانی واقعیش جەنگی مان و نەمان لەگەڵ ئەم دەردەدا بکات.

# چەشنەكانی خوێنەر

## خوێنەر وەك نوێنەری كۆمەڵگا

خوێنەر بوونەوەرێكی نادیار و بێشوناسە، نوسەر پێی ناگات. یەكێك لە تراژیدیاكانی پەیوەندی نوسەر و خوێنەر لەوەدایە، جگە لە كتێب هیچ شتێكی دی كۆیان ناكاتەوە، لە كتێبدا نوسەر قسەدەكات و خوێنەر بێدەنگە، بەڵام هەم نوسەر دەیەوێت بزانێت خوێنەر چۆن دەیخوێنێتەوە و هەم خوێنەریش دەیەوێت هەندێك پرسیار لە نوسەر بكات، هەندێك ڕاز بەیانبكات، هەندێك گلەیی، هەندێك ترس كە لە ناوەوە دەیخۆن. كێشەی گەورەی نوسەر و خوێنەر زۆر جار بەر لە خوێندنەوەی كتێبیش دەستپێدەكات، هەم نوسەر پێش نوسین كۆمەڵێك پێشداوەری لەسەر خوێنەر هەیە و هەم خوێنەریش زۆرجار دەرهەق بە نوسەرە گەورەكان پڕە لە خەیاڵات و پێشداوەری. واتە لە ڕووی سۆسیۆلۆژییەوە ناكرێت پەیوەندی نوسەر و خوێنەر كورتبكەینەوە بۆ ساتی نوسین، بۆ ناو تێكست... هەڵبەت باشترین و گونجاوترین پەیوەندی لە نێوان نوسەر و خوێنەردا ئەوە بوو تەنیا لە سنووری تێكستدا بمێنێتەوە، لەگەڵ دەستكردن بە كتێبێكدا دەست پێبكات و لەگەڵ تەواوبوونی كتێبەكەدا كۆتایی بێت، بەڵام لە دونیای ئێمەدا، لە خۆرهەڵاتی دژە كتێبدا ئەمە خەونێكی دوورە، خودی كتێب كەمترین نرخی لەم پەیوەندییەدا هەیە.

لێرە بە گشتی پەیوەندی خوێنەر و نوسەر لەوە ئاڵۆزترە کە سەرەتا دەردەکەوێت، پەیوەندییەکی پڕ لە پێکدادان و سۆز و عەشق و زویریی، لە هەوڵی کوشتن و فەرامۆشی و تێکشکاندن... هەم نوسین و هەم خوێندنەوە لە کولتووری ئێمەدا بەشێکن لە مەیدانی جەنگ، زۆرجار وادەردەکەوێت وەک ئەوەی ئیشبن لە مەیدانی شەڕدا نەوەک ئیشبن لە کایەی مەعریفیدا. بەدرێژایی مێژوو، لەکتێبە ئاسمانییەکانەوە تا ئەمڕۆ، نوسین ئەکتێکی جەنگاوەرانە بووە، نەوەک ئیشکردن بێت لەسەر پرسیار و کێشەی فیکریی. ڕستەگەلی لە بابەت «خەباتکردن بە وشە» «شەڕ بە تفەنگ و قەڵەم» «گۆڕینی وشە بۆ چەک» بەشێکن لەو کولتوورەی کە تێکست وەک چەکێکی ناو مەیدانی جەنگ تەماشادەکات. دینییەکان و مارکسییەکان و ناسیونالیستەکان هەر سێکیان بەو جۆرە لە نوسینیان ڕوانیوە، بەجۆرێک ئێستا لە نەستی دەستەجەمعیماندا نوسین هەر بە جەنگ و پێکدادان و ململانێوە گرێدراوە، نەوەک وەک ئیشی ناو کایەیەکی ئەدەبی و مەعریفی. ئەوە وایکردوە جۆرێک لە خوێنەر لەدایک بێت، نوسەر یان وەک «نوێنەری میللەت» «کوڕی کۆمەڵگا» یاخود وەک «دوژمنی میللەت» تەماشابکات... لەو دوو سیفەتە زیاتریش هیچی دی لە نوسەردا نەبینن. بەڵام جگە لەم ڕەهەندە کە وادەکات لە ئێستادا پەیوەندی نوسەر و ئەوجۆرە خوێنەرانە گەلێک خراپ و پڕ گومان بێت، کۆمەڵێک ڕێگری ئۆرگانی دیکەش هەن وادەکەن پەیوەندییەکە ئاڵۆزتر بێت. ئەوەی کە ئەم پەیوەندییە زۆر ئاڵۆزدەکات، ئەو دوورییە گەورەیە یە کە خوێنەر لە نوسەر جیادەکاتەوە... خوێنەر و نوسەر هەمیشە دوورن لە یەک، پەیوەندییەکەیان تا ئەبەد مەحکومە بە دووری... هەتا گەر بۆشمان هەڵبکەوێت جارێک بۆ چەند سەعاتێک نوسەرێک ببینین، دەزانین ناتوانین لەو ماوەیەدا وەها لەم مرۆڤە ئاڵۆزانە نزیک ببینەوە تێیانبگەین، کە جۆرە مرۆڤێکن زۆرجار خۆشیان بە دروستی ناتوانن

پێناسەی خۆیان بکەن، یاخود هەر لە بنەڕەتەوەرا نایانەوێت خۆیان پێناسەبکەن. گومانی نوسەران لە خوێنەر تەنیا گومان نییە دەرهەق بە توانای تێگەیشتنیان، بەڵکو گومانیشە دەرهەق بە نییەتیان. خوێنەر لای نوسەر کەسێکی دیاریکراو نییە، دەموچاوێکی ڕۆشن و ڕوونی نییە. بەڵکو یەکەیەکی تێکەڵاو و ئاڵۆزە، بێروخسار و بێشوناسە، فرەسەرە، ڕازیکردنی هەموو سەرەکانیشی لەیەک کاتدا کارێکی سەختە، یاخود ئیشی سەخت و نەکردەی وەک کاری سیحربازانی دەوێت. نوسەر لەگەڵ خوێنەردا بەر تەواوی فەزای کولتووری خۆی دەکەوێت، کاتێک نوسەر باس لە خوێنەر دەکات... خوێنەر بە گشتی، خوێنەر وەک بوونەوەرێکی دەستەجەمعی، وەک نوێنەری ئەو فەزا کولتوورییە دەبینێت کە لە سەرەوەیە و باڵادەستە. لێرەدا خوێنەر دەستکردی کۆگەلێکی گەورەیە کە نوسەر دەیەوێت لە یاسا و سروشتیان هەڵبێت و جیابێتەوە، وەک نوێنەری بیرکردنەوەی گشتی دەیانبینێت... ئەمجۆرە لە خوێنەران هێزێکن نوسەر هەقێتی لێیان بترسێت، تاقمێکن عەقڵییەت و تێڕوانینیان ئاوێنەی عەقڵییەت و تێڕوانینێکی سەتحی و کۆقەبووڵە. هەڵبەت نوسەری زۆریش هەن بەڕاستی دەکەونە داوی ئەمجۆرە خوێنەرە، کە زۆربەی کات کەسانێکن زەوقیان لە خوار و هەستیان زۆر لە نزمییە. ئەمجۆرە خوێنەرە هێندەی پاسەوانی زەوقی گشتی و هەڵگری چێژی باون، شتێکی دی بە دونیای ئەدەبیاتەوە نایانبەستێتەوە. جۆرە خوێنەرێکن هەمیشە پێوەری مردو و حوکمی دڵرەقانەیان هەیە، چاوێکی قووڵیان نییە بتوانێت چینە تاریکەکانی تێکست ببڕێت، بەڵام بە پێوەرە بەسەرچووەکانیان تێکست دەخەنە بەر جۆرە دادگاییەک کە یاساکانی لە سات و کاتی تردا نوسراون و سیفەتی پیرۆزییان پێبەخشراوە. بە واتا نوسەر هەمیشە بەرخوردی لەگەڵ بڕێک خوێنەردا هەیە کە نوێنەری ڕابوردوون... نوێنەری سەردەمە بەسەر چووەکانن، نوێنەری جۆرە تێکستێکن تەعبیریان

لەم سەردەمە بۆ ناکرێت. نوسەر هەقێتی دەرهەق بەم خوێنەرانە بە گومان بێت، هەقێتی فەرامۆشیانبکات... هەقێتی رێز بۆ خواست و ئارەزوویان دانەنێت، ئەمانە نوێنەری دیوە ترسناکەکەی خوێنەرن، ئەو دیوەی بە پێشداوەرییە کوشندەکانیان نوسەر گەمارۆدەدەن. نوسەر ناتوانێت نوسەرێکی نوێگەر بێت، نوسەرێک بێت سەر بە سەردەمی خۆی، گەر بکەوێتە ژێر ترسەوە لەمجۆرە خوێنەرە. ئەمجۆرە خوێنەرە زۆربەی کات وەک پاسەوان و قازی و حاکم سەیری ئەدەب دەکات، لەخوێندنەوەدا هێندەی پراکتیکی سادییەتی خۆی دەکات، کارێکی تر ناکات، هێندەی لە تێکستدا بە دوای ئەو شتانەدا دەگەرێت کە خۆی دەیەوێت، بە دوای دەنگی تێکستەکەدا ناگەرێت... هیچ کات گوێ بۆ تێکست شل ناکات، بەڵکو خۆی گۆرانییەکی هەیە دەیڵێت و دەیەوێت تێکست لەگەڵیدا بیڵێتەوە. شەرکردن لەگەڵ ئەم خوێنەرەدا شەرکردنە لەگەڵ کولتوورێکی دێرینی خوێندنەوەدا. ئەمجۆرە لە خوێنەر، بوونەوەرێکی سیاسی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییە کە بە کۆمەڵێک پێوەری سیاسی و ئەخلاقی تێکست دەپێوێت. ئەمجۆرە خوێنەرە تێکستی بۆ گرنگ نییە، بەڵکو ئەوەی بۆ گرنگە تێکست ئەو دونیایەی بۆ بەرهەمبهێنێتەوە کە باوەری پێیەتی، هەر خوێنەرێکیش لە تێکستدا تەنیا بەدوای برواکانی خۆیدا گەرا، لەو پەرەگراف و برگانە ترسا کە گومان دەخەنە سەر ئەو دونیایەی لە خەیاڵیدایە... پێشوەخت لە بۆتەکەی خۆیدا نوسەری گەمارۆداوە و نوسەری خستۆتە ناو قاڵبی خۆی، خستویێتییە سەر «تەختی خەوەکەی بروکست» و بەو پێیە دەیپێوێت. ئەمجۆرە خوێنەرە لەوانە نییە بیەوێت بگاتە نوسەر، نوسەر و تێکستی بۆ گرنگ نییە، بۆ رۆحی نوسین و بۆ قووڵایی دەرونی مرۆڤ ناگەرێت، تەنیا ئارامی و سەلامەتی خۆی لامەبەستە، لە ناو تێکستەکاندا بەدوای هەرەشەیەکی نادیاردا دەگەرێت بۆ سەرخۆی، لەو تێکستانە

دەترسێت کە دونیا وەک ئەو نابینن، لەو تێکستانە دەترسێت کە جۆرە ژێرخانێکی بونیادی و جۆرە تێڕامانێکی تری ئەدەبی دروستیکردون. لەبەرئەوە کەم و زۆر نوسەری وەک مرۆڤ بۆ گرنگ نییە، نوسین لای ئەو دۆخێکی ئایدۆلۆژییە، دەرکەوتەیەکی سیاسی و ئەخلاقی ڕووتە، ئیدی جگە لەوەی بە پێوەری سیاسی و ئەخلاقی تێکستەکان بپێوێت، توانایەکی دی بۆ نزیکبوونەوە لە تێکست نییە. تێکستی ئەدەبی ڕاستەقینە وەک دارستانێکی چڕ و قووڵ و فرەنهێنی و پڕ تەلیسم وەهایە، وەک جێگای وەستان و تێڕامان، بەڵام ئەمجۆرە لە خوێنەر تەنیا لە سەرەوە، لە بەرزاییەکی دوورەوە تێکست دەبینێت، شتێکی گشتی و دیمەنێکی کاڵی ئەو دارستانەی دێتە پێشچاوی. ئەمجۆرە خوێنەرە بەردەوام لە خزمەت بچوککردنەوەی تێکستدایە، نایەوێت جیهان کتێبێکی تێدا بێت بڕواکانی ئەو لەقبکات، دڵنیایی بشێوێنێت، غروری بریندار بکات. کتێبی گەورە هەمیشە بچوکی ڕوانینەکانی خۆی بیردەخاتەوە، بچوکی جیهانەکەی خۆی دەخاتە پێشچاو، ئەوەی بۆ دەسەلەمێنێت کە لە دەرەوەی ئەو دونیا ئاسۆی تری هەیە. «خوێنەری کۆمەڵگایی یاخود کولتووری» لە قووڵاییدا خوێنەرێکی فوبیادارە، ترسەکانی وادەکەن نەفرەت لەو جیهانە جیاوازانە بکات کە دەشێت کتێب دروستیانبکات. دەزانێت لە ڕۆحی هەندێک نوسەردا جۆرە غرورێک هەیە، وای لێدەکات دونیای تر و ئاسۆی دی ببینیت.. لەبەرئەوە هەموو بەهانەیەک دەدۆزێتەوە نەهێڵێت ئەو ئاسۆیانە لەخۆی و لای ئەوانی تر دەرکەون. ئەمجۆرە خوێنەرە کوڕی شوێن و جێگایەکی دیاریکراوە، لەو کتێبانە ناترسێت کە لە دوورەوە دێن، لەو ڕۆمانانە ناترسێت کە وەردەگێڕدرێن، چونکە مەترسی لە هیچ بەرهەمێک نییە لە فەزایەکی ترەوە هاتبێت، مەترسیشی هەبێت، وەک تێکستێکی خۆماڵی تورە و نیگەرانی ناکەن... سڵی گەورەی لەو نوسەرانەیە کە لە دونیاکەی ئەو رادەمێنن، لە باوەشی هەمان فەزا

و هەمان جێگا و هەمان کاتدا گەورە بوون، هەمان شانس و ئەگەریان لە بەردەستتدا بووە وەک ئەو، بەلام لە هەمان ئەو جیهانەی ئەو، جیهانێکی تریان سازاندوە... توانیویانە سنوورەکانی روانینی ئاسایی تێکبشکێنن، جۆرە چاوێکی تر لەخۆیاندا دروستبکەن بتوانێت ئەودیوی دیوارەکان ببینێت. زۆرجار دەبینی بۆ ئەوەی ئەو تێکستانە بکوژێت کە لە نزیکی خۆیەوە لەدایکدەبن، کە لە نوسەرەکانی ژینگەی خۆیەوە بەرهەمدێن، پەنادەباتە بەر تێکستی بیانی، ئەوەی تێکستی بیانی بەرز رادەگرێت لەوەوە نایەت کە زۆر قووڵ بە کولتووری میللەتانی تردا چۆتە خوار و زۆر رێزی بەرهەمی خەیاڵ و فیکری نەتەوەکانی تر دەگرێت... لەڕاستیدا ئەمجۆرە خوێنەرە بەدەگمەن لە بەرهەم و تێکسی کولتوورەکانی تریش تێدەگات یان مەبەستێتی بزانێت چی دەڵێن وچی دەگوزەرێت، هێندەی بەسە کە تێکستێکی تری بەدەستەوە بێت لەڕێگایەوە لە نرخی ئەو نوسەرانە کەمبکاتەوە کە لە سەر دونیای ئەو کاردەکەن. کە دەڵێت «ئەدەبی بێگانە لە کوێ و ئەدەبی ئێمە لە کوێ؟».. ئەم بۆچوونەی لە دڵسۆزییەوە نەهاتووە بۆ ئەدەبیاتی خۆی، بەڵکو بە مەبەستی بچووککردنەوەی نرخی نوسین و تێفکرینی ناوخۆ دەیانخاتەگەڕ. ئەم خوێنەرە هیچ کات ناچێتە ناو پەیوەندییەکی دۆستانەوە لەگەڵ نوسەردا، هەمیشە لە جەنگ و لەیەکداندان، دەیانەوێت نوسەر نەبینن، فەرامۆشیبکەن، وا حیساب بکەن وەک لە دونیادا نەبێت... ئەمە جۆرە خوێنەرێکن تەنیا کاتێک ئاسوودە دەبن کە بڕی هەرە زۆری نوسەرانێک کە لەو ناچن بمرن و ئاسەواریان نەمێنێت.

## خوێنەر وەك نوێنەری ئێستا

خوێنــەر لەڕوانگــەی نوســەرەوە هیــچ نییــە جگــە لــە کەســێکی نادیــار کــە لەســەردەمێکی تایبەتــدا دەژی. یەکێــک لــە کێشــە گەورەکانــی نوســەر پەیوەندیەتــی بــەو ڕەهەنــدە زەمانییــەی خوێنــەرەوە، ئەوانــەی مــردون چیتــر کتێــب ناخوێننــەوە، بــەڵام ئەوانــەی هێشــتا لەدایــک نەبــوون، هەموویــان ئەگــەری خوێنــەرن. لێرەوە نوســەر کــە دەنوســێت دەزانێــت خوێنەرەکانــی دەشــێت ســەر بــە یــەک کولتــوور یــان یــەک زەمــان نەبــن... هیــچ زامنێکــی وەهــا لــە گــۆڕێ نییــە ئــەو چیرۆکــەی ئەمــڕۆ دەینوســین دووســەد ســاڵی تریــش دووبــارە نەخوێندرێتــەوە. گــەر زامنــی وەهــا لەگــۆڕێ بایــە، نوســەران نیگەرانــی پاشــەڕۆژ نەدەبــوون. هەڵبــەت خوێنەرێــک کــە دوو ســەد ســاڵی تــر کتێبــی ئــەم ســەردەمە دەخوێنێتــەوە، وەک خوێنــەری ئەمــڕۆ نییــە، وەک چــۆن ئێمــە هیچمــان لەخوێنەرانــی زەمانــی شکســپیر و ڕاســین ناچێــت. نوســەر دەبێــت بزانێــت کــە ســەردەمێک دێــت، جــۆرە خوێنەرێــک لەدایکدەبێت هیچــی لەخوێنــەری ئێســتا ناچێــت. بــەڵام وەک چــۆن ئێمــە ئەمڕۆ دۆنکیشــۆت و ئۆلیڤــەر تویســت و مــادام بۆڤــاری دەخوێنینــەوە، دەشــێت لــە ســەردەمانی تریشــدا تێکســتی ئەمڕۆی ئێمــە ببینــن، لەڕاســتیدا ئــەو خوێنــەرە نادیارانــەش ترســی خۆیــان هەیــە. ڕاســتە ناکرێــت لــە تێکســتێکدا کــە ئەمڕۆ دەینوســین، حیســاب بــۆ ئــەم بوونــەوەرە نادیارانــە بکەیــن، بەڵام ئــارەزووی نهێنــی و هەرە گــەورەی تێکســت ڕوو لەوانــە... هەمــوو تێکســتێکی بــاش دەیەوێــت هەڵگــری هێزێــک بێــت بیکاتــە تێکســتێکی دەرەکات و دەرشــوێن، کۆمەکــی بــکات بگاتــە هەمــوو جێــگا و ســەردەمەکانی دی. هیــچ نوســینێک نییــە لەقووڵایــی خۆیــدا، لــە خەونــە شــاردراوەکانیدا نەیەوێــت بگاتــە ســەردەمەکانی دیکــە. پەندێــک هەیــە دەڵێــت «ســوودی چییــە تــۆ بەرمیلێــک داینەمیتــت پێبێــت و پەتــی تەقاندنەوەکــەت تەنیــا دوو ســانتیم درێــژ بێــت». نوســەرانی گەمــژە تێکســتێک دەنوســن، پەتیــان وەهــا کورتــە گــەر وەک داینەمیتیــش تەقییــەوە،

تەنیا خۆیان و كەسانی نزیكیان بەر ئاگری دەكەون. نوسەری ڕاستەقینە دەیەوێت پەتی ئاگربەری وەها درێژ بێت، بشێت خۆی دووربكەوێتەوە و لە دوورەوە گوێی لە دەنگی تێكستی خۆی بێت، كاتێك لە سەردەمانی دیكەشدا دەتەقێتەوە. هیچ كات «داهێنان» ناتوانێت خۆی لەخەونی نەمریی ڕزگاربكات، نەمرییش هیچ نییە جگە لەوەی تێكستەكانمان لەسەردەمەكانی دیكەشدا بخوێنرێنەوە و ببیسترێن و عاشقیان هەبێت. بەڵام داهێنان چەندە هەوڵە بۆ جاویدانەگی، چەندە ڕەهەندێكی خەیاڵاوی و فەنتازی تێدایە، هێندەش هونەرێكی پراگماتییە. هێندەش نیازە بۆ كاركردن لەسەر سەردەمی خۆی، بۆ تەعبیركردن لە شتێكی ناوەكی كە دەیەوێت ئێستا دەریخاتەوە، كەواتە ناكرێت خوێنەری ئێستا نادیدە بگرێت و فەرامۆشیبكات. خوێنەر هەمیشە چەمكێكی پارادۆكسە، جۆرێك لەخوێنەر هەن كە هاودەمی نوسەرن، لەسەردەمی ئەودا دەژین، دەیانەوێت ئێستا و ئێرە بكەنە زیندانی نوسەر. زۆرجار گوێمان لە كەسانێك دەبێت دەڵێن «پێویستە نوسەر ڕێزی هەستی خوێنەرانی بگرێت».. ئەمە بێماناترین ڕستەیە كەسێك بتوانێت بینێتە سەر كاغەز. نوسەران دەتوانن بپرسن «هەستی كام خوێنەران»؟ خوێنەرانێك ئێستا لە بازنەی كولتووری نوسەردان، لەبازنەی زمانی نوسەردان، لە بازنەی سەردەمی نوسەردان، یان هەزاران خوێنەری تر كە دەشێت دوای مردنی نوسەر لەدایكبن. نوسەر نازانێت خوێنەر كێیە، لەبەرئەوە ناچارە بۆ هیچ كەس نەنوسێت، ئەوە ئەو حەقیقەتەیە كە نوسەری ڕاستەقینە بڕوای پێیەتی. كێشەكە لە نوسەردا نییە، نوسەر دەبێت كاری بەخوێنەرەوە نەبێت، لە كاتی نوسیندا خوێنەر لای نوسەر ئامادە نییە... نوسەر ناتوانێت بۆ هیچ خوێنەرێكی واقعی بنوسێت، ئەو خوێنەرەی بۆی دەنوسێت خوێنەرێكی خەیاڵییە، خوێنەرێكی ئیدیالی فەنتازی فرەزانە كە نوسەر لای وایە هەموو شتێك دەبینێت و تێیدەگات. خوێنەری واقعی درەنگ

لای نوسەر لەدایکدەبێت، دوای تەواوبوونی تێکستەکە و دوای چاپبوونی بەرهەمەکەی... خوێنەری هەنوکەیی، خوێنەری هاودەم، کەسێک نییە نوسەر لەکاتی نوسیندا تووشی ببێت، بەڵکو دواتر لەسەر جادە و لە نێو کوچە و بازاڕدا تووشی دێت. کێشەکە لە خوێنەردایە، ئەو خوێنەرانەی لە بازنەی کولتووری و جوگرافی نوسەردا دەژین، ئەوانە کە دەبنە نوێنەری سەردەم و خوازیارن نوسەر بۆ ئەوان بنوسێت. سروشتی ئەم «بۆ نوسینە» چۆنە؟ خوێنەر خۆی شتێکی ورد و دیاریکراوی لەلا نییە لەسەری. زۆر لە خوێنەرانی هاودەمی نوسەر و نزیک لەزمان و جوگرافیای ئەو هەوڵدەدەن نوسەر بۆ ئەمڕۆ بنوسێت، بۆ ژینگەیەکی دیاریکراو. گەر «خوێنەری کۆمەڵگایی یان کولتووری - ئەو جۆرە خوێنەرەی لە بەشی پێشوودا باسمکرد» نوێنەری بەها ئەخلاقی و دینی و کولتوورییەکان بێت، ئەوا خوێنەر کە دەبێتە نوێنەری شوێنکاتێکی دیاریکراو، لە تێکستدا تەنیا ئەو شتانەی بۆ گرنگە کە ئاماژە بە دونیای خۆی دەدات. ئەوخوێنەرانەی لەڕێگای مەرجەعییەتێکی کولتووری و ئەخلاقییەوە حوکم بەسەر نوسەردا دەدەن، داوای ئەوە دەکەن، نوسەر بەها و نرخ و موقەدەسات بپارێزێت. بەڵام «خوێنەری ئێستاکێی» مەبەستێتی نوسەر لەو خولیا و کێشانە دوورنەکەوێتەوە کە تایبەتن بەسەردەم و ژینگەی ئەو. ترسناکی ئەمجۆرە لە خوێنەر لەوەدایە کە خەیاڵێکی زۆر واقعی هەیە. تەنیا خولیای ئەوەیە ئەو شتە لە تێکستدا بدۆزێتەوە کە خۆی دەیناسێت، خۆشحاڵ دەبێت لە نێوان دونیای خۆی و دونیای تێکستدا پرد بدۆزێتەوە، تەنیا بۆ ئەوپردەش دەگەڕێت، تەنیا دەیەوێت بەسەر ئەو پردەدەدا بپەڕێتەوە، گەر ئەو پردانەی نەدۆزییەوە بۆ ناو زەمەنی خۆی و دونیای خۆی، ئیدی تێکستی بۆ گرنگ نییە. ئەم خوێنەرە واقعییە بەو مانایەی کە دەیەوێت تێکست دڵسۆزی ئەزموونی واقعی ئەو بێت، لە سنووری دونیای ئەو نەترازێت، گەر خوێنەری کولتووری

مەبەستی بێت ئەخلاق و جیهانبینی تێکست لە ئەخلاق وجیهانبینی ئەو دوورنەکەوێتەوە، ئەوا ئەمجۆرە خوێنەرە، ئەخلاق و کولتووری زۆر بۆ گرنگ نییە، بەڵکو دەیەوێت تێکست بەشێک بێت لەدنیای ئەو... وێنەیەکی جیهانی لەسەردایە، واقعی خۆی بە شێوەیەکی دیاریکراو دەبینێت، دووبارەبوونەوەی ئەو وێنەیەی بۆ گرنگە، ئەمجۆرە خوێنەرە تێکستێکی دەوێت بە ئەندازەی یادەوری خۆی بێت، دەیەوێت بتوانێت هەموو شوێنەکان لە ناو شارەکەی خۆیدا بناسێتەوە، هەموو کاراکتەرەکان لە ناو ژینگەی خۆیدا بدۆزێتەوە، ڕووداوەکان بشوبهێنێت بە ڕووداوی مێژوویی، هەموو ئامـاژەکان بەو سیستمە ئامـاژەییە تەفسیربکات کە لە لای خۆی داڕێژراوە، هەموو ماناکان و واتاکان لەو قاڵبانەدا دیلبکات کە ئەو دەیانزانێت. ئەمجۆرە مەخلوقە جیهانێکی خۆی هەیە، هەر شتێکی دی بکەوێتە دەرەوەی ئەو جیهانەی خۆی تێیناگات، ناتوانێت بچێتە ناو تێکستەوە، لەبەرئەوە بەناچاری تێکست بەرەو دونیای خۆی دەهێنێتە دەر. خوێنەری ئێستاپەرست لەو جۆرە خوێنەرانەیە کە گۆتە باسیاندەکات و دەڵێت «دەپرسن ـ شیعر بە کەڵکی چی دێت؟ ـ منیش لە تۆ دەپرسم ئەی خوێنەر، تۆ پێم بڵێ واقیع بە کەڵکی چی دێت؟». ئەو خوێنەرەی کە گۆتە لێرەدا قسەی لەگەڵ دەکات، ئەوخوێنەرە واقعییەیە کە نوێنەری ئێستایە، بۆ شاعیرییەت ناگەڕێت، بەڵکو بۆ حەقیقەتێکی پێشوەخت دەگەڕێت، بۆ نیگارێکی پێشوەختی دونیا دەگەڕێت کە لەسەری خۆیدایە، نایەوێت شیعر.. هێماسازی... فەنتازیا... وێنەی ئەو دونیایەی لاڵێڵبکات، مەبەستێتی تێکست ژیانی خۆی وشارەکەی و جوگرافیاکەی بە زمانێک بۆ بگێرێتەوە تێیبگات. لێرەوە ناچارە تێکست بەدوای ئەو شتانەدا هەڵوەشێنێت کە هاوشێوەی شتگەلێکن لە ژیان و یادەوەری خۆیدا، ئەمجۆرە خوێنەرانە قسەیەکی نیتشەم بەیادا دەهێننەوە کە دەڵێت «خراپترین خوێنەر ئەوانەن کە وەک سەربازی فەرهودچی وەهان،

ئەوەی دەتوانن بیبەن دەیبەن، ئەوەی پیس وپێشێلی دەکەن دەیکەن. سووکایەتی و گاڵتەش بە کۆی ئیشەکە دەکەن». پێموایە ئەم وەسفەی نیتشە باشترین وەسفە بۆ ئەوخوێنەرانە کە تێکست بەدوای یەک نیاز و یەک وێنە و یەک خواستدا هەڵدەوەشێنن و پارچەپارچەیدەکەن. زۆرجار من خوێنەرم بینیوە کەدەڵێت «لەم تێکستەدا، یان لای فلانە نوسەر ئەوەم نەدۆزییەوە کە بۆی دەگەڕێم». من بەردەوام دەڵێم «لە کتێبدا دەبێت بۆ ئەوە بگەڕێیت کە نوسەر دەیەوێت بیڵێت، نەوەک بۆئەوەی تۆ بۆی دەگەڕێیت»، کتێب شار و شانشینی نوسەرە، ئەوەی دەچێتە ناوی دەبێت بزانێت شەقام و کوچەکانی لەسەر خواست و ئارەزووی خوێنەر دروست نەکراون، بەڵکو هەموو ئەم وشە و وێستگە و نیگارانە خولقێنەرێکی تریان هەیە، خواستی تریان لە پشتە، بۆ یەک کەس و یەک سەردەم نەنوسراون، نامەن بۆ کەسێکی نادیار کە بەشێکی ئەو کەسە لە ناو تۆدایە، وەک چۆن بەشێکی دیکەی لە ناو کەسانێکی دیدایە، لەسەردەمانێکی دیدا.

خاڵێکی تر کە وادەکات ئەم خوێنەرە ترسناک بێت، ئەوەیە لە رەهەندە دەرەکات و دەرەشوێنییەکەی نوسین تێناگات.

نوسین بەرهەمی ئەزموونی مرۆڤێک نییە لە یەک شوێندا بژی و بمرێت. بەرهەمی تێکەڵکردنی ئەزموونی مرۆڤە بە گشتی، لە هوشیارییەکی هەتیوەوە نایەت کە لە چوار دیواریماڵی خۆی نەچووبێتە دەرەوە، بەڵکو بەرهەمی هوشیارییەکی «گەردونی ـ یونفێرسالە» کە ڕیشەی لە سەردەمە دوورەکانی پێش خۆیدایە و ڕووشی لە سەردەمەکانی ترە. ئیشی نوسەر ئەوە نییە غەمی سەردەمێک یان شارێک یان جۆرە مرۆڤێکی تایبەتی نیشانبداتەوە، غەمی نوسەرە هەلومەرجی بوون و ژیانی مرۆڤ بە گشتی، وەک دۆخێکی وجودی، لە چیرۆکێکی واقعی یان فەنتازیدا جێگابکاتەوە... ئەو هەر کات باس لەشارێکی دیاریکراو دەکات، مەبەستی

هەموو شارەکانی دونیایە، هەر کات باس لە سەردەمێکی دیاریکراو دەکات مەبەستی ئاماژەیە بۆ تراژیدیا مێژووییەکەی مرۆڤ، کە باس لە مرۆڤێکی دیارکراو دەکات، دەیەوێت لە ڕێگای ئەو مرۆڤەوە شتێکمان لەسەر مرۆڤ بە گشتی پێبڵێت، مرۆڤێک کە لێرەیە و لێرەش نییە، مرۆڤێک بەشێکی لە ئێمەدایە و بەشێکی لەوانی دیدا، ئاماژەیە بۆ ئێمە و ئاماژەشە بۆ وێنەکانی ترمانە لەسەردەمەکانی دی و کۆمەڵگاکانی دیدا. نوسەر هیچ کات ناتوانێت بەجۆرێکی میکانیکی کوری ئێستا و ئێرە بێت، بەپێچەوانەوە هەمیشە لە ڕۆحە یۆنفێرسال و دەرە زەمانییەکەیەوە دێتەوە بۆ ئەمڕۆ. نوسەر تەنیا کاتێک دەتوانێت روون لەسەر ئێستا بنوسێت کە لە ئەبەدییەتەوە گەڕابێتەوە، واتە ڕەچاوی هەموو ئەو مەرجانەی کردبێت کە هەقیقەت لەسنوورێکی بچوکدا دیل ناکەن.

## خوێنەر وەك بوونەوەرێکی بێدەنگ

جۆرێک لە خوێنەر هەیە، بێدەنگە... هیچ کات نایبینیت، هەستی پێ ناکەیت، خوێنەرێکە دەموچاوی خۆی ئاشکراناکات، نازانیت تەواو چۆن بیردەکاتەوە، ناتوانیت تێبگەیت نوێنەری چییە... بەڵام هەیە... خوێنەرێکی نهێنییە... خوێنەرێکە بێسیما کە نوسەر تێیناگات، ئاڵۆزە، قسەنەکەرە. نوسەر کە دەنوسێت دەزانێت بەشێک لەپەیامەکەی دەگاتە هەندێ کەس کە نازانێت کێن. ئەوەی ئەو نەزانین و گومانە لە نوسەردا دەچێنێت، خوێنەرانی بێدەنگن. خودی ئەو خوێنەرە بێدەنگە نادیارە، خودی ئەو مەخلوقە کە هەمیشە ئاڵۆز و تەلیسماوی دەمێنێتەوە، بەشێکی گرنگی دونیای خوێندنەوە دروستدەکات، بەشی هەرەزۆری خوێنەران لەم چەشنە بوونەوەرە بێدەنگەن، هیچ شتێکی دیاریکراو دەرناخەن، لە ڕووبەرێکی تاریک دەچن کە هەموو جۆرە تیشکێک هەڵدەمژێت و هیچ ناداتەوە، وەرگرێکی ڕەهان، تەنیا وەردەگرن و هیچ نابەخشن،

هیــچ نادەنــەوە. ئەمجــۆرە خوێنــەرە بێدەنگانــە فرەشــێوەن، فرەئاســتن، لــە خوێنــەری گەمــژەوە تیایانداپــە تــا خوێنــەری بلیمــەت. بــەڵام ناســین و جیاکردنەوەیــان ئاســان نییــە، چونکــە پێکــڕا بێدەنگــن، هیچــی دیاریکــراو نادرکێنــن، بــەڵام هــۆ و بەهانــەی بێدەنگیــان جیــاوازە، لێــرەدا هەوڵــدەدەم هەندێــک پۆلێنــی ســەرەتایی بــۆ ئــەم گروپــە گەورەیــە لــە خوێنــەران بکــەم، بەپێــی دەلالەتەکانــی بێدەنگیــان.

## بێدەنگی وەك ئاماژە بۆ گەمژەیی

جــۆرە خوێنەرێــک هەیــە هیــچ جــۆرە کتێبێــک کاری تــێ نــاکات، هیــچ تێکستێک نایجوڵێنێت، کاتێک تێکست بە بەردەمیــدا دەڕوات، نــە هەســتی نــە بیــری ناخرۆشــێن، هیــچ هێزێــک توانــای قســەکردن و بیرکردنــەوەی ناجوڵێنێــت، ئەمجــۆرە خوێنــەرە ناتوانێــت لــە هەمــوو ئاســتەکانی تێکســت تێبــگات، هیــچ ئایدیایەکــی وەک خــۆی نایگاتــێ، ناتوانێــت بیرۆکەکانــی تێکســت بڵێتــەوە یــان چڕیانبکاتــەوە یاخــود هیچیــان لەســەر بڵێــت. بێدەنگییەکــەی لەبــەردەم تێکســتدا بێدەنگــی ناحاڵیبوونــە... بێدەنگــی کەســێکە ناتوانێــت بەرامبــەر تێکســت هیــچ بڵێــت، تێکســت لــەلای وەک جیهانێکــی نادیــار یــان شــوێنێکی ئاڵــۆز و دووردەســت دەمێنێتــەوە. ئــەم بێدەنگییــە بێدەنگــی کەســێکە نەیتوانیــوە بگاتــە تێکســت... راســتە ئەوانــە کتێــب دەکــڕن، لاپەڕەکانــی هەڵدەدەنــەوە، دەخوێننــەوە، بــەڵام هەمیشــە لــەدەرەوەی تێکســتن... هەمیشــە لــە پێــش دونیــای تێکســتەکاندا دەمێننــەوە و هەرگیــز ناتوانــن رووبکەنــە نــاوەوە. تێکســت بــۆ ئــەم خوێنەرانــە شــارێکە هەرگیــز ناتوانــن بچنــە نــاوی. هەڵبــەت خوێنــەری گەمــژەی تــەواو بوونــی نییــە، تەنیــا بوونەوەرێکــی ئیفترازییــە، هەمــوو یەکێــک لــە ئێمــە بەرامبــەر جــۆرە کتێبێــک و چەشــنە تێکســتێک گەمژەیــن، مــەرج نییــە ئــەوەی لــە ئاســتێکدا خوێنــەری گەمژەبــوو، بــۆ هەمــوو تێکســتێک و کتێبێکــی دیکــە

خوێنەری گەمژە بێت... بەمانایەکی تر زۆر جار ئەوە کتێبە شوناسی خوێنەر دیاریدەکات، نەوەک خوێنەر شوناسی کتێب دیاریبکات. مەرج نییە ئەوەی لە ئەنشتاین تێدەگات، بتوانێت لە ڕۆمانێکی بەلزاکیش تێبگات، ئەوەی وەک خوێنەری بەلزاک گەمژە دەردەکەوێت دەشێت وەک خوێنەری ئەنشتاین بلیمەت بێت. هەموومان دەبێت باوەڕ بەوە بهێنین کە لە بەرامبەر کۆمەڵێک تێکستدا هەمیشە لە دەرەوە دەوەستین و هیچ کات ناتوانین بڕۆینە ناو نهێنییەکانی. خوێنەری گەمژە بوونەوەرێکی نەگتێڤ نییە، بەڵکو بەشێکی گرنگە لە هەر یەکێک لە ئێمە، ئەو بەشەیە کە غرورمان دەشکێنێت و سنوورێک بۆ لە خۆڕازیبوونمان دادەنێت. چونکە هیچ خوێنەرێک لەسەر زەوی بوونی نییە، بتوانێت لە هەموو تێکستەکان تێبگات و بچێتە ناویان و بیاندوێنێت... ئەمجۆرە لە بێدەنگی گەمژانە، بێدەنگییەکی دروستکەرە کە تەنیا خوێنەرە بەتواناکان دەتوانن هەیان بێت.

## بێدەنگی وەك ئاماژە بۆ بێلایەنی

جۆرە بێدەنگییەکی دیکە هەیە کە ئاماژەیە بۆ ساردی، بۆ بێباکییەکی قووڵ دەربارەی دونیا. بەشێک لە خوێنەران درێژکراوەی ئەو بەشەن لە مرۆڤ کە بەرامبەر دونیا بێباک و بێلایەنن، لە شتەکان تێدەگەن، لەگەڵ ماناکاندا دەژین، بەڵام ئارەزوو یاخود ئازایەتی تێکەڵاوبوون و گفتوگۆیان نییە. ئەمانە خوێنەری زیرەکن، بەڵام هۆیەک و بەهانەیەک شک نابەن کە بێدەنگی خۆیان بشکێنن، وەک چۆن بەرامبەر واقیع کەمتەرخەم و بێلایەنن، بەرامبەر تێکستیش بێرۆح و ساردن. وەک چۆن هەڵوێستی ڕاستەقینەی خۆیان لە دونیا بەیان ناکەن، هەمان شێوە هەڵوێستی ڕاستەقینەی خۆشیان لە تێکست بەیان ناکەن... ئەمانە تێدەگەن تێکست دەڵێت چی، لە چ بەرەیەکدایە، بۆ چی نوسراوە، بەڵام بێدەنگ دەخوێننەوە و

بێدەنگ کتێبەکان دادەخەن و وادەرناخەن کە دەبێت شتێک بڵێن یان هەڵوێستێک نیشانبدەن... تێکست لای ئەمانە کەرەستەیەک نییە بۆ گۆڕینی خود یان دونیا، بەڵکو بەشێکە لە هەموو شتەکانی دی، شتێکە لە ناو شتەکاندا، چۆن هەواڵی رووداني کۆمەڵکوژییەکی مرۆیی لە شارێک یان وڵاتێکی نزیکدا نایانجوڵێنێت، چۆن بینینی کارەساتێک لە تەلەفزیۆندا کاریان تێناکات و هیچ لە ژیان و بیرکردنەوە و ئیقاعیان ناگۆڕێت، هەمان شێوە خوێندنەوەی تێکستیش لە بێلایەنی دەریانناهێنێت. ئەمانە بێلایەنە ئەبەدییەکانن، تەنیا بە بێدەنگی و لە دوورەوە سەیری دونیادەکەن... بێدەنگیان جۆرە قەڵغانێکە دەیانپارێزێت، چونکە نازانن گەر لە ژێر ئەو سوپەرە ئەستوورەی بێدەنگییەوە هاتنەدەر، چی دەبێت. هەموومان بەرامبەر زۆربەی تێکستەکانی دونیا خوێنەری بێدەنگ و بێلایەنین.

## بێدەنگی وەك ئاماژە بۆ عەشق

هەندێک خوێنەر هەن تەنیا عاشقی خوێندنەوەن، کتێب و تێکستە گەورەکان سەرسامیاندەکەن. ناخوێننەوە بۆ ئەوەی قسەبکەن، بەڵکو دەخوێننەوە بۆ ئەوەی ئەو عەشقە قووڵەی خۆیان تێربکەن. بێدەنگیان بێدەنگی عاشقانە، نایانەوێت قسەیەک لە قسەی مەحبوبیاندا بکەن، بەڵکو دەیانەوێت چێژ ببینن. پەیوەندیان بە تێکستەوە پەیوەندییەکی رۆحی - ئیرۆتیکییە. لەخوێندنەوەدا بۆ ئارامی و لەزەت دەگەڕێن. دەیانەوێت لە ناوەوە لەگەڵ تێکستدا بژین، چێژی لێببینن، وەک چۆن عاشقێک تامی جەستەی مەحبوبی دەکات تامی وشەکان دەکەن، بەجیهانی تێکستدا رۆدەچن. ئەمانە هەستناکەن پێویستیان بە قسەبێت، خوێنەری راستەقینەن... خوێنەرن بەمانا قووڵەکەی، چێژ لە خوێندنەوە دەبینین، بۆ لەزەت دەخوێننەوە. خوێندنەوە لایان جەنگ نییە لەگەڵ بیروڕای نوسەردا... دیالۆگ نییە... بەڵکو لەزەتبردن و عەشقە. وەک

چۆن عاشقێک بەسەرسامییەوە گوێ لە مەعشوقەی دەگرێت، ئەوانیش تەنیا گوێدەگرن. بە بێدەنگییەکی قووڵەوە گوێدەگرن... بەدەنگی خۆیان مۆسیقا و چێژی خوێندنەوە ناشێوێنن، هەستناکەن گەر شتێک بڵێن بەوە زیادەیەکیان خستۆتە سەر ماهییەتی تێکست. بێدەنگییان بێدەنگی کەمتەرخەمی یان گەمژەیی نییە، بەڵکو بێدەنگی خۆشەویستییە ساتێک تێدەگات ناتوانێت تەواو لە هەقی تێکست بێت. ئەمجۆرە بێدەنگییە جوان و شاعیرییە، بەرەنجامی بڕوای خوێنەرە کە ناتوانێت لە تێکست جوانتر بدوێت. وەک سالم دەڵێت بەحەیا دێنە حزور و بەئەدەب سوژدە دەبەن، چونکە خوێندنەوە لایان جۆرێکە لەخەڵوەت لەگەڵ دولبەردا. بە بڕوای من هەر کەسێک هەوای ئەم خوێنەرە عاشقە لە ناویدا نەبێت، ناتوانێت خوێنەرێکی چێژبین بێت. هەموومان لە بەردەم هەندێک تێکستدا دەبێت عاشقی بێدەنگ بین، دەبێت شەڕانگێزێتی ڕەخنەگرانە بخەینە لاوە و لەزەتی عاشقانەی بخەینە جێ.

## بێدەنگی وەك ئاماژە بۆ ترس

هەندێک خوێنەر هەن، خۆیان و تێکست دەچنە پەیوەندییەکی قووڵەوە، خوێندنەوەیان دیالۆگێکی ناوەکی دروستدەکات... لەگەڵ تێکستدا دەرگیر دەبن، شەڕدەکەن، نارازییدەبن، قەبووڵدەکەن، ڕەخنەدەگرن، ستایشدەکەن، بەڵام هەموو ئەم جەنگ و جەدەلە وەک دیالۆگێکی داخراوی ناوەکی دەمێنێتەوە، وەک دیالۆگێک کە کەس گوێی لێ نییە و کەس نایبیستێت خوێنەر خۆی نەبێت. خوێنەر لێرەدا بوونەوەرێکی ئەکتیڤە، بەڵام ترسی لەوە هەیە کە دەنگی ناوەکی خۆی بەڕوونی و بەرزی لە دەرەوە ببیستێتەوە. ترسی لەوە هەیە دەنگی خۆی بەرزبکاتەوە... دەیەوێت بدوێت، بەڵام ترسی لەدەنگی خۆی هەیە. ئەمجۆرە خوێنەرانە زیرەکن، ئایدیای خۆیان هەیە، بەڵام لەوە دەترسن

ئەو بیروبۆچوونانەی لەگەڵ خۆیاندا دروستیدەکەن بۆ دەرەوە دەریبخەن، جۆرە مرۆڤێکن تەنیا لە فەزا و ژینگەی ناوەکی خۆیاندا دەتوانن بدوێن، لە بەردەم گشتدا، نزیک لە خەڵک دەچنەوە ناوەوە و قسەکانی خۆیان دەشارنەوە. من لەو چەندین ساڵەدا چەندەها جار ئەو جۆرە خوێنەرانەم بینیوە کە لەخودی تێکست ناترسن، دەتوانن بیروبۆچوونی خۆیان هەبێت، زۆرجاریش جوان بیردەکەنەوە، بەڵام بێدەنگن، نەلەبەر ئەوەی لە تێکست یان نوسەر دەترسن، بەڵکو لەبەرئەوەی لە کۆمەڵگا، لەخوێنەرانی تر، لە فەزای گشتی دەترسن. بێدەنگی ئەمانە، بێدەنگی کەسانێکە کە هیچ ئارەزوویەکیان نییە جەنگاوەربن، ئایدیاکانی خۆیان خۆشدەوێت، بەڵام هەمیشە گومانیان هەیە لەوەی بتوانن لەم دونیا جەنجاڵەدا جێگایەکی بۆ بکەنەوە. پلەی ئەمجۆرە خوێنەرە بێدەنگانە لای من، زۆر لە پلەی هەموو ئەو نوسەرانە باڵاترە، کە هیچی ڕاستەقینەیان نییە و بەردەوام خۆیان دووبارەدەکەنەوە.

## بێدەنگی وەك ئاماژە بۆ توڕەیی

چەند ساڵێک لە مەوبەر لە سوید خوێنەرێکی زۆر زیرەکم بینی، یەکێک بوو لەو خوێنەرە وردانەی تا ئەمڕۆ بینیومە... تێبینی ورد و جوانی لەسەر زۆربەی تێکستەکانی منیش هەبوو، دوای ئەوەی قسەمانکرد، لێمپرسی بۆ بۆچوونەکانی نانوسێتەوە، بەغەمگینییەوە گوتی «من زۆر توڕەم لە خۆم. من خوێنەرم و هەتاهەتایە وەک خوێنەریش دەمێنمەوە... لەوە توڕەم کە ناتوانم لەخوێنەر بەولاوە هیچی تربم». لەوساتەدا بۆ یەکەمجار تێگەیشتم کە خەڵکانێک هەن، مەحکومن بە خوێنەریی، شتێک هەیە ناوی «قەدەری خوێنەربوون» ـە. ئەوجۆرە خوێنەرانە پێیانوایە لەو ساتەدا کە بێنە دەنگ، بنوسن، بیروبۆچوونی خۆیان بخەنە سەر کاغەز لەوە دەردەچن خوێنەربن. کەسانێکن شوناسی

خوێنەربـوون ئازاریانـدەدات، ئاواتەخوازبـوون خوێنـەر نەبـن... نوسـەرێکی بێدەنگ و بێدەسـەڵات و تێکشـکاو لـە ناخیاندایـە کـە هەرگیـز نایەتـە قسـە و نایەتـەدەرێ، تـوڕەن لـەوەی نوسـەرەکەی ناخیـان ناتوانێـت بێتـە قسـە، بێدەنگیـان لـە بێدەنگـی زیندانییـەک و مەحکومێـک دەچێـت کـە ڕێگایـەک نادۆزێتـەوە دەنگـی خـۆی بگەێنێتـە دونیـا. ئەمانـە «خوێنەربـوون» وەک جۆرە مەحکومییەتێک تەماشادەکەن کە بـە جەوهـەر جۆرێک لـە بێدەنگی دەسـەپێنێت، خوێنەربـوون لای ئـەوان لـە بێدەنـگ بـوون جیانابێتـەوە. هـەر کاتێـک خوێنـەر کەوتـە قسـە و نوسـین لەوەدەکەوێت خوێنـەر بێـت و دەچێتـە شـوێنگەیەکی دیکـە. ئـەم بێدەنگییـە پتـر بەرەنجامـی توڕەبوونێکی وجودیانەیـە... تورەبوونـی ئەمانـە لەوەیـە کـە خۆیـان وەک خوێنەرێکـی ئەبـەدی دەبینـن، خوێنـەر بوونیـش لایـان هاوشـانی بێدەنگییـە، چونکـە هـەر کات لـە بێدەنگـی هاتنـەدەرێ تاکـە شـتێکی ڕاسـتەقینە دەدۆڕێنـن کـە هەیانـە، ئەویـش جێـگا و پایـەی «خوێنەربوون»ـە، ترسـیان لـە نوسـین لـەوەوە دێـت، نەبـا نوسـین ئـەو شـەرەفەیان لـێ بسـتێنێتەوە کـە بـۆ هەتـا هەتایـە خوێنـەری بێدەنـگ بـن. ئەمانـە لای مـن جوانتریـن و تراژیدیتریـن کەسـانێکن مـرۆڤ لـە دونیـای نوسـین و خوێندنـەوەدا ڕێکەوتیـان دەکات، نوێنـەری ئـەو جوانیـە ئەسـتەمەن کـە هەرگیـز نابینرێـت و نایەتـەدەر.

## بێدەنگی وەك ئاماژە بۆ چاوەڕوانی

جـۆرە خوێنەرێکـی تـر هـەن کە تەنیـا دەیانەوێت ڕوو بە ڕوو نوسـەر ببینن و قسـەبکەن. ئەوەنـدەی مەبەسـتیانە دەنگـی خۆیـان بـە نوسـەران بگەێنـن، مەبەسـتیان نییـە بـۆ خوێنەرانـی دیکـەی وەک خۆیـان قسـەبکەن. بـەردەوام دەخوێننـەوە و سـەرنج کۆدەکەنـەوە و بێدەنگـن، چونکـە لەچاوەڕوانییەکـی هەمیشـەییدان، چاوەڕوانـی ئـەوەی بگەنـە نوسـەر. هـەر شـتێکیان هەیـە هەڵیدەگـرن و چاوەڕوانـی ئـەوەن بشـێت ڕۆژێـک نوسـەر ببینـن و قسـەی

خۆیانی پێبڵێن. ئەمانە پێیانوایە بێدەنگی نێوان نوسەر و خوێنەر تەنیا کاتێک دەبێت بشکێت کە خوێنەر ڕوو بەڕوو بەرامبەر نوسەر دانیشت. بێدەنگیان بێدەنگی چاوەڕوانییەکی دوور و درێژە بەدیار نوسەرەوە... هەتا گەر نوسەرەکانیش مردبن، ئەو جۆرە خوێنەرانە هەر چاوەڕوانیان دەکەن، زۆربەی کاتیش هەموو ژیان بێدەنگ دەبن و ناتوانن نوسەر ببینین، بەڵام لە قووڵاییدا بڕوایەکیان هەیە کە دەبێت چاوەڕوان بن. ئەوەی لەمجۆرە خوێنەرەدا جوانە، ئەوەیە پەیوەندی خوێنەر و نوسەر بە پەیوەندییەکی دووقووڵی و تایبەتی دەزانن کە پێویستی بەدانیشتنی داخراو و تایبەتی هەیە... ئەمانە مەبەستی ئەوەیان نییە لای کەسانی تر خۆیان دەربخەن، بەڵکو ڕازێک و نهێنییەکیان هەیە و دەیانەوێت بۆ نوسەری ئاشکرابکەن... بێدەنگیان بێدەنگی کەسێکە پەیامێکی نهێنی هەیە و دەیەوێت تەنیا بیگەێنێتە دەست خاوەنی خۆی.

## خوێنەر وەك نوێنەری پاشەڕۆژ

لەبەشەکانی پێشوودا باسم لەو خوێنەرە نادیارە دوورە کرد کە لەداهاتوودا تێکستەکان دەخوێنێتەوە، خوێنەرێک کاتێک دەژی و دەست بۆ کتێب دەبات، چیتر ئێمە لەسەر زەوی نەماوین. جۆرە خوێنەرێکە کوڕی سەردەمێکی تر و سەر بەدونیایەکی ترە. هەر نوسەرێک بیر لەمجۆرە خوێنەرە بکاتەوە کەم تا زۆر سەرسام و دەستەپاچە دەبێت، ناچاردەبێت بپرسێت: ئایا بۆ کێ بنوسین، بۆ خوێنەرانێکی دوور کە نایانناسین و لەگەڵماندا نازین و نایانبینین وگوێمان لە ڕەخنە وستایشیان نابێت، یان بۆ خوێنەرانی ئەمڕۆ، کەسانێک لەگەڵماندا دەژین و بەباری داواکانیان ئەرکمان قورسدەکەن و ڕاستەوخۆ پاداشت و سزامان دەدەنێ؟ بۆ کێ بنوسین... بۆ خوێنەرێکی نادیار یان بۆ خوێنەرێک کە ڕۆژانە سەروکارمان لەگەڵیاندا هەیە. ئایا کامیان چارەنوسی تێکست زۆرتر

دیاریدەکەن، ئەوخوێنەرانەی ئەمڕۆ لەتەکمانن، یان ئەوانەی سبەی لەدایکدەبن؟ .

پرسیارێک هەموو نوسەرێک لەخۆی بکات ئەوەیە ئاخۆ تێکستێک بۆ خوێنەرانی ئەمڕۆ جوان ودانسقە بێت، مەرجە بۆ خوێنەرانی داهاتووش وەهابێت؟. ئایا تێکستێک کە لەپاشەڕۆژدا دەشێت بژی، چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ تێکستێکدا کە تەنیا ئێستا و لەم سەردەمەدا دەشێت برەو و دانپیانان بەدەست بهێنێت؟.

هەڵبەت تێکستگەلێک کە دەتوانن لەپاشەڕۆژدا بژین و بیانکرێت خوێنەرانی داهاتووش بخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە، دەبێت کۆمەڵێک سیفەتیان هەبێت جیاواز لە تێکستگەلێک کە تەنیا بۆ بەکارهێنانی ڕۆژانەی ئێستا نوسراون. ڕاستە ئێمە ئێستا هیچ شتێک لەسەر خوێنەرانی داهاتوو نازانین، بەلاّم ئەمە دۆخێکە دەشێت تێیدا «نائامادە بە ئامادە بپێوین ـ قیاس الغائب بالحاضر»... بەوەدا ئێمەش ڕۆژێک لەڕۆژان لەسەر زەوی نەبووین، سەردەمانێک کە مۆلێر و ڕاسین و فیکتۆر هۆگۆ، خەیام و ئەبوعەلا نوسیویانە ئێمە لەم جیهانەدا نەژیاوین، کەچی ئەمڕۆ دەتوانین بیانخوێنینەوە، باشتر لە هاوچەرخەکانیشمان تێیانبگەین و لەزەتیان لێ ببینین، وادەکات بکرێت خۆشمان بەراورد بەو نوسەرانە وەک خوێنەری پاشەڕۆژ ببینین... کەواتە هەڵەیە واتێبگەین کە خوێنەرانی پاشەڕۆژ تەنیا ئەوانەن کە لە داهاتوودا دێن، بەڵکو دەکرێت ئێمە خۆشمان وەک خوێنەری پاشەڕۆژ ببینین. ڕەنگە زۆر کەس کێشەی لەگەڵ ئەدەبی نوێدا هەبێت، ڕاشکاوانە ڕەخنە لەنوسەرانی ئەمڕۆ بگرێت و بوغزی خۆی بەسەریاندا خاڵیبکاتەوە، بەلاّم کەم کەس جورئەتدەکات بڵێت چێژ لە مەحوی یان شکسپیر نابینم. ئاساییە مرۆڤ بە نوسەرێکی سەردەمی خۆی بڵێت بێبەهرە و نوشوستکار، بەلاّم ئەستەمە کەس جورئەتبکات بە ئەحمەدی خانی یان فیردەوسی یان سێرڤانتس وابڵێت. ئەوە بۆ خۆی

نیشانەیەکی گەورەیە کە خوێنەرانی پاشەڕۆژ هێزێکی گەورەتریان لە خوێنەرانی ئەمڕۆ هەیە، شەرعییەت و قودسییەتێک بە تێکست دەبەخشن کە ئەمڕۆ ئێمە ناتوانین بە تێکستی سەردەمی خۆمانی ببەخشین... دۆن کیشۆت لەبەرئەوە گرنگە چونکە خوێنەرانی سەدەکانی دواتریش بە گرنگ سەیریانکردوە. هەر کات تێکست توانی خوێنەرانی دوور، منداڵانی سەردەمەکانی تر بۆ خۆی ڕابکێشێت ئەوکات دەتوانێت لە توانای خۆی دڵنیابێت. بەڵام کێ دەزانێت خوێنەری پاشەڕۆژ چی دەوێت؟. چۆن لە خواستی بوونەوەرێک تێبگەین کە هێشتا لەدایک نەبووە؟. لەڕاستیدا ناکرێت بڵێین خوێنەری پاشەڕۆژ مەخلوقێکی سەد دەر سەد جیاواز دەبێت لە ئێمە کە لە ئێستا دەژین، ناشکرێت بڵێین کە مەخلوقێک دەبێت وەک ئێمە. بەڵام لەو باوەڕەدام ناسینی خوێنەری پاشەڕۆژ زۆر سەخت نییە، هێندە هەیە مرۆڤ دەبێت بەرخوردی خۆی بەرابەر تێکستە دێرینەکان بپشکنێت، تا لە خوێنەرانی دواڕۆژیش تێبگات. ئێمە خۆمان خوێنەری پاشەڕۆژین کە لەئێستادا دەژین. ئێمە بۆ شکسپیر و دۆستۆفسکی خوێنەری پاشەڕۆژین... ئەوخوێنەرە زۆر دوورەین کە ئەوان نەیانتوانیوە بزانن لە چ ژیان و لە چ سەردەمێک و چ کولتوورێکدا دەژین.

ماوەیەک لەوەوبەر شانۆگەری هێنری چوارەمی شکسپیرم لەسەر شانۆ بینی. پرسیارێک لە دوای نمایشەکە لام بوو، ئەوەیە چی ئێمە لەگەل ئەم تێکستەدا کۆدەکاتەوە، ئێمەیەک بەردەوام بە لاپتۆپ و ئایفۆن و ماشێنەکانەوە خەریکین. ئایا چوون بۆ بینینی هێنری چوارەم بۆ مرۆڤی مۆدێرن چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ چوون بۆ باغی ئاژەڵان بە نیازی بینینی پاندایەکی قەشەنگ و ناوازە؟ ئاخۆ هاملێت، یاگۆ، لەیدی ماکبەس لای ئێمە چیین؟ ئێمە کە بۆ شکسپیر خوێنەری پاشەڕۆژین، چ شتێک لە شکسپیردا هەیە سەرنجمان ڕابکێشێت. شتێک کە ئێمە نوسەرانی ئەمڕۆ دووبارەیبکەینەوە تا خوێنەرانی پاشەڕۆژی دوور سەرسامبکەین.

لەراستیدا خوێنەری پاشەڕۆژ خوێنەرێكی راستەقینەیە، خوێنەرێكە جەوهەری تێكستی بەلاوە گرنگە. ئەوخوێنەرەیە كە بێ هیچ حوكمێكی پێشوەخت ڕووبەڕووی تێكست دەبێتەوە، نوسەر لەلای كورتدەبێتەوە بۆ تێكستەكانی، ئەمرۆ كە دۆن كیشۆت دەخوێنینەوە، بۆمان گرنگ نییە، كە سێرڤانتس كێ بووە، سەر بەچ گروهێكی سیاسی بووە، ئیماندار بووە یاخود نا، تەنیا ئەوەمان بۆ گرنگە لەزەت لە دۆن كیشۆت خۆی ببینین، چیتر حوكمەكانی ئێمە لەسەر كەسایەتی نوسەر كاریگەرییەكی لە سەرخوێندنەوەمان نییە، لێرەدا خوێنەری پاشەڕۆژ وەك خوێنەرانی هاوسەردەم لەوەدەكەوێت خوێنەرێكی ئەخلاقی یان سیاسی بێت. ئەمرۆ لای بەشی هەرە زۆری ئەو خوێنەرانەی كە ئیماندار نین گرنگ نییە مەحوی سۆفی بووە، گرنگ نییە حەلاج خوداناسێكی گەورەبووە، چیتر خوداناسی رابیعەی عەدەوی و كافری ئیبن موقەفەع تورەمان ناكەن، ئێمە هێندەی بۆ مانای تێكست دەگەڕێین، بۆ ئەو شتە هاوبەشە مرۆڤانەیە دەگەرێین كە ئێمەی ئێستا بەوانی رابوردووەوە گرێدەدات، شتەكانی تری نوسەرمان بۆ گرنگ نییە... زەمەن حوكمە پێشوەختەكان و پێشداوەرییەكان زۆر كزدەكات. نوسەرێكی هاوچەرخ گەر بێت و وەك ئەبی نەواس بژی و بنوسێت، تووشی نەفرەتێكی كۆمەڵایەتی گەورە دەبێت، بەڵام ئێمە خوێنەرە دوورەكانی ئەو بۆمان گرنگ نییە ئەبی نەواس چی بووە، كێ بووە، چی كردوە... چ باك گەر شەرابخۆر بووە یان نوێژكەر، وەلی بووە یان هاوجنسباز. هیچ خوێنەرێك نییە ئەمرۆ بتوانێت ئۆسكار وایلد نەخوێنێتەوە لە بەر ئەوەی هۆمۆسێكسوێل بووە... هۆمیسێكسوێل بوونی وایلد هیچ مانایەكی بۆ ئێمە نییە، ئێمە خوێنەری پاشەڕۆژی ئەوین، بەڵام وایلد لە سەردەمی خۆیدا لە پای گوناهی هۆمۆسێكسوال بووندا گەورەترین ئازار و ئەشكەنجە و سووكایەتی چەشتووە.

خوێنەری پاشەڕۆژ بەدوای شتە قووڵ و مانا نەمرەکەدا دەگەڕێت. تێکستێک کە دەتوانێت لە پاشەڕۆژدا بژی و خۆی لە تەپوتۆزی سەردەمی خۆی بتەکێنێت و بە زەماندا سەفەربکات، تێکستێکە لەگەڵ کێشە هەمیشەییەکانی مرۆڤدا کاردەکات. ئەوەی دەتوانین تا ئێستا رامبۆ بخوێنینەوە، ئەو سەرکێشی و خەیاڵە نەگیراو و یاساشکێنەیە کە پێشتر بەسەلیقە و هۆشی ئەدەبی دونیا نائاشنا بووە، بەڵام والت ویتمان لە بەر هۆگەلی تر بە نەمری ماوەتەوە. چەندین ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی بکرێت لەرێگایەوە ئەدەبێک ببێت بە ئەدەبێکی نەمر، بەڵام لە هەموویان گەورەتر ئەوەیە تێکست لە فۆرمێک و مانایەکدا نەگیرێت و قەتیس نەبێت... تێکستی نەمر ئەوەیە کە بێشومار مانای هەیە، زیاد لە ڕوخسارێکی هەیە، زیاد لە ئاستێکی هەیە. تێکستی نەمر کە خوێنەرانی پاشەڕۆژ مسۆگەردەکات بوویەکی فرەچینە، لەیەکێک لە چینەکانیدا خوێنەرانی ئەمڕۆ، هاودەمانی نوسەر خۆیان دەبیننەوە، لە چینێکی دیکەدا خوێنەرانی پاشەڕۆژ و سەردەمەکانی تر. لە هەموو تێکستێکدا ڕۆحی سەردەمی خۆی ئامادەیە، چینێک هەیە ئەو دەلالەت و مانایانە لە خۆی دەگرێت کە تایبەتن بەو سەردەمە کە تێیدا لەدایکبووە، دۆن کیشۆت بۆ ئێمە چەندە نەمربێت، ئاستێکی مانای هەیە کە گرێدراوی سەردەمی سێرڤانتسە، هاملێت نەمرە، بەڵام وەک ئەو فۆرم و ماناگیری و داڕشتنەی کە هەیە دەکرا تەنیا لە سەردەمی شکسپیردا بنوسرێت. خوێنەرانی سەردەمی شکسپیر ئەو چینەی مانایان بۆ مەبەست بووە کە تایبەتە بەسەردەمی خۆیان. بەڵام بۆ ئێمە چینێکی تری مانا هەیە، ئاستێکی دیکەی گوتار هەیە کە لەگەڵ دۆخە ئینسانییە گشتییەکەدا دەگونجێت. لە سەردەمی شکسپیردا هاملێت شانۆگەرییەکی ڕەخنەیی سیاسی بووە، بەڵام بۆ ئێمە تێکستێکی وجودی و فەلسەفیانەیە. بەکورتی خوێنەری پاشەڕۆژ جۆرە ستایلێکی خوێندنەوەیە... ئێمە

دەتوانیـن تێکسـتە هاوچەرخەکانـی خۆشـمان بـە عەقڵییەتـی خوێنەرانـی پاشـەڕۆژ بخوێنینـەوە، هەوڵبدەیـن ئـەو چینـەی مانـا دیلمـان نـەکات کـە ئاماژەیـە بۆ ئەمڕۆ... تێکسـت جگـە لـە دونیـای خـۆی دەبێـت ئامـاژە بێـت بـۆ ئـەو شـتە هەمیشـەییانەی کـە پابەندنیـن بـە کات و شـوێنەوە. خوێنـەری پاشـەڕۆژ دیـوە یۆنفێرسـالەکەی تێکسـتی بـۆ گرنگـە. خوێنـەری ڕاسـتەقینە هەمیشـە بەعەقڵییەتـی خوێنـەری پاشـەڕۆژ دەخوێنێتـەوە، لـە سـەردەمی خۆیـدا نوقـم نابێـت، سیسـتمی تەفسـیر و ئامـاژەی ڕۆژگاری خـۆی نـاکات بـە تەنیـا پێـوەر، بەڵکـو لـە هەمـوو تێکسـتێکدا بـۆ مانـا ئەبەدییـەکان دەگەڕێت. ئیتـر ئـەو تێکسـتە نوسـەرێک بینوسـێت هاوڕێمـان بێـت، یاخـود نوسـەرێک نوسـیبێتی چوارسـەد سـاڵ لـە مەوبـەر لەوپـەڕی دونیـا ژیابێـت. لێـرەوە خوێنـەری پاشـەڕۆژ تەنیـا ئەوخوێنـەرە نییـە کـە لـە داهاتـوودا لەدایکدەبێـت، بەڵکـو خوێنەرێکـە هەمیشـە هەیـە، خوێنـەرە ڕاسـتەقینەکەی ئەدەبـە کـە ڕەهەنـدە کاتییەکـەی تێکسـت سـیحری لێنـاکات، بەڵکـو ئـەو ڕەهەنـدەی نوسـین دەیبـات کـە بـۆ هەمـوو شـوێن و هەمـوو کاتێکـە.

# ڕەخنەگرتن لە درەخت

## دەربارەی مێژووی نیگاکردنمان بۆ دونیا

یەکێک لە کێشە گەورەکانی درەخت ئەوەیە، چەندە شێوەی بگۆڕێت، چەندە تامی میوەکان و ڕەنگی گەڵاکان و بۆنی گوڵەکانی جیاوازبن، لەوە ناکەوێت درەخت بێت... لە هەر کوێ درەختەکان ببینین، دەزانین درەختن، هەمیشە بە یەک سیستمی کارکردن ئیشدەکەن و بە یەک فۆرمی دەرکەوتن دەردەکەون. مرۆڤیش هەر بەو جۆرەیە هەر کاتێک لەدوورەوە سەیەری دەرکەوت، بێ ئەوەی بزانین نێرە یان مێ، سەر بە چ نەتەوەیەک یان ئاینێکە دەزانین مرۆڤە... درەختیش بێئەوەی بزانین چ میوەیەک دەگرێت و ناوی چییە، دەزانین درەختە. هەمەڕەنگی توخمەکانی، جەوهەرە هاوبەش و دووبارەکەی ناشارێتەوە. شێوەی گەڵاکانی چەند جیاوازبن، بەڵام هەر گەڵان. نەبووە درەختێکی سروشتی گوڵەکانی لە ژێر زەوی و ڕەگی لە هەوادا بێت... نەبووە درەختێک قەدی نەبێت، گەڵاکانی لە سەر لق نەوەستابن، لقی بە قەدەوە نەنووسابێت. دیارە لێرەدا مەبەستم نییە وەسفی درەخت بۆ کەسێک بکەم کە نەیبینیوە، بەڵکو وێنەی درەخت ئاماژەیە بۆ سیستمێکی داخراو، سەمبولێکە بۆ بونیاد و پێکهاتێک کە دەرچوون و گۆڕان و دەربازبوون قەبووڵ ناکات، هێڵی ڕاکردن و ئەگەری دروستکردنی شتی نوێی هەڵنەگرتووە... سیستمێک سروشت

لەسەر ڕیتمێکی ئەبەدی دووبارەیدەکاتەوە. فەیلەسوفی فەرەنسی «ژیل دۆلۆز» جیاوازییەکی گرنگ لە نێوان «مۆدێلی درەخت» بۆ وێناکردنی دونیا و مۆدێلی «ریزیۆم ـ ڕەگەتۆڕ»دا دەکات. لەم بەشەدا مۆدێلی درەخت بەمجۆرە کورتدەکەمەوە. درەخت هەمیشە لە ڕەگەوە دەست پێدەکات، خاڵێکی سەرەتای هەیە، بنکێکی لە زەویدا هەیە، هێدی هێدی سەردەکەوێت، لە نێوان سەرەتا و کۆتاییدا هەمیشە هەمان یاسای جەبری گەشەکردن لە کاردایە، تواناکانی جوڵەمان هەردەم لە نێوان ڕەگەکانی خوار و گوڵەکانی باڵادایە. ڕەگ کۆنترۆڵی وەستان و ژیانی درەخت دەکات، هەمیشە بۆ ئەوەی قەدێکمان هەبێت دەبێت ڕەگمان هەبێت، بۆ ئەوەی لقمان هەبێت دەبێت قەدمان هەبێت، بۆ ئەوەی گەڵا یان گوڵمان هەبێت دەبێت لقمان هەبێت... هەمیشە هێڵی جوڵاندنەوەمان یەک هێڵە، لەسەرەوە بەرەو خوار بچین یاخود لە خوارەوە بۆ سەرەوە سەربکەوین، هەمیشە بە یەک ڕێگادا دەڕۆین، سیستمێکی باڵابەند و بێدەرچوونمان هەیە، لەدرەختدا ڕیزبەندی ڕەگەزەکان پێشوەخت دیاریکراون، ئاڕاستەی جوڵە پێشوەخت تەنیا لەسەر ڕۆشنایی یەک نەخشەدا بەڕێوە دەچێت... لە هەر لقێکەوە بجوڵێینەوە دەگەینەوە سەر هەمان خاڵ، شتی لە ناکاو ڕوونادات، لە ڕێگادا ڕەگەزگەلی نوێمان تووش نایەت، چەند سەفەرەکەمان خاوبکەینەوە و لەسەرەوە ڕا لە ناو لقەکاندا هاتوچۆبکەین، هەمیشە لە ناو هەمان سیستمی داخراوداین، لە ناو هەمان ستراکتورداین... لە هەمان گەردونداین کە دەرچوونی تێدا نییە.

مۆدێلی درەخت لای دۆلۆز جۆرە میتافۆرێکە بۆ هەموو سیستمێکی داخراو... هەتا کتێب بە فۆرمە کلاسیکییەکەی و تێکست بە تێگەیشتنە ئەکادیمییە تاک ڕەهەندەکەی، لە فۆرمی درەخت دەچن. گردبوونەوەی پەرەگراف و ڕستەکان لەسەر هێڵێکی گەشەی دیاریکراو، کە دەبێت خاڵ بە خاڵ و بیرۆکە بە بیرۆکە لەسەر ڕیتمی لۆژیکێکی گەشەکردن بڕۆن،

سـەرەتایەکی دیاریکـراو، ناوەڕاسـتێکی چاوەڕوانکـراو و کۆتاییەکـی لۆژیکیـان هەبێـت. ئەوانـە وادەکـەن شـوبهاندنی دەق بـە مۆدێلـی درەخـت کارێکـی زۆر سروشـتی بێـت.

لـە تێڕوانینـی دێرینـدا بـۆ دونیـا، خـودی گـەردون وەک یەکەیەکی باڵابەنـد «هیرارشـی» داخـراو وێناکـراوە، وەک ڕیزبەندییەکـی پلـەدار کـە لەسـەرەوە دێتـە خـوارێ، وەک هێڵێکـی یـەک ئاڕاسـتە کـە خالیقـی بـاڵای گـەردون بـە بنکـەی نزمـی مەخلوقاتـەوە دەبەسـتێتەوە. واتـە لـە تەفسـیری دێرینـدا خودی گـەردون وەک درەختێکـە لـە سـەنتەرێکی بـاڵاوە دەسـتپێدەکات، لـە خاڵێکەوە دەچێتـە سـەر خاڵێـک، بـە هێڵێکـی یـەک ئاراسـتە دەمانبـات. سیسـتمێکە چەقێـک و بازنەیەکـی دیاریکـراوی هەیـە، هێڵێکـی ڕاسـت، یـان چەنـد هێڵێکی ڕاسـت لـە نێـوان بەشـەکانیدا دێـن و دەچـن، ناوەندێـک هەیـە مانا دەبەخشـێتە ئەوانـی تـر، هـەر ڕەگەزێـک لـە نـاو ئـەو سیسـتمەدا پەیوەندیەکـی نەگـۆڕی بـە ڕەگـەزی پێشـخۆی و بـەوی پاشـخۆیەوە هەیـە، بـازدان لـە یەکێـک لـەم ڕەگەزانـەوە بـۆ ئـەوی تـر بـە بـێ ڕەچاوکردنـی ڕیزبەنـدی و یاسـاکانی نـاو درەختەکـە کاری نەکردەیـە. لادان لـە کـۆی ئـەو ڕێکخسـتنەدا نەشـیاوە، یـەک هەمیشـە دووی بـەدوادا دێـت، شـەو هەمیشـە بـە ڕۆژ کۆتاییدێـت، خـودا لـە باڵایـە و مـرۆڤ لـە خـوارەوە، فریشـتەکان لـە ئێمـە لـە مەلەکـوت نزیکتـرن و ئێمـەش لـە جانـەوەران. مـرۆڤ ناتوانێـت بچێتـە جێـگای فریشـتە و فریشـتە ناچێتـە جێـگای ئێمـە. سـیفاتی بوونـەوەران و وەزیفـە و شـوێنیان نەگـۆڕە. هەموومـان بوونـەوەری پێشـوەخت دروسـتکراوین، ماهییەتمـان پێبەخشـراوە، هیچمـان تـرازان نیـن لـە فۆرمێکـی ژیانـەوە بـۆ فۆرمێکـی تـر، بەڵکـو جوڵەیەکـی یـەک هێڵیـن کـە لـە ترۆپکـی درەختـی گەردونـدا خالیقێـک دانـەر و سیسـتماتیزەکەرمانە، تـەواوی جوڵـەی هێڵـەکان دەچنـەوە بـۆ لای ئـەو، بـە هـەر ئاڕاسـتەیەکدا بجوڵێیـن ڕەگـەزەکان دەمانبەنـەوە سـەر هەمـان سـەرچاوە. سـەر و خـوار ئاشـکرایە، ڕاسـت و چـەپ دیـارە. مـرۆڤ دڵنیایـە خـۆی لـە

كوێدایە و شتەكانی تر لە كوێدان.

باوەڕهێنان بە مۆدێلی درەخت، واتە باوەڕهێنان بە سیستمێكی داخراو، كە ناوەندێكی هەیە، هیچ ڕەگەزێك بەبێ یاسا داڕێژراوەكانی سیستمەكە ناتوانێت لادات و شتێكی نوێی هەبێت. هەمیشە دەزانین چی لە دوای چی دێت، دەزانین ڕەگەزی یەكەم بەدوایدا لە ریزبەندیدا دەبێت كامە ڕەگەزی دی بانگبكات. ئەم وێنەیە قاڵبێك بۆ خەیاڵ و لۆژیكێكی نەگۆڕ بۆ بیركردنەوە لە ژیان و لە دونیا دەسەپێنێت... بۆیە ڕەخنەگرتن لەم مۆدێلە، لە جەوهەردا رەخنەگرتنە لە هەموو جۆرە مۆدێلێكی داخراوی بینین و بیركردنەوە. ئەم وێنەیە بۆ گەردون و ژیان چەندەها وێنەی دی بۆ گەردون و ژیان كوشتوە.

بۆ ئەوەی قسەكانی خۆم روونتر بكەمەوە. هەوڵدەدەم لە دونیای هونەری شێوەكارەوە دوو نمونە وەرگرم. لە هونەری كلاسیك و هونەری سەدەی نۆزدەشدا هەزاران تابلۆمان هەیە كە نیگاری دیمەنێكی سروشتی دەكێشن، قوتابخانەكانی نیگاركێشان جیاوازن، شێوەكانی نیگاركێشان جیاوازن، بەڵام وەك چۆن درەخت هەمیشە درەختە، سروشتیش بە كۆ هەمیشە هەمان سروشتە، واتە هەمان بونیاد و یەكڕەنگی هەیە. تەنیا بۆ نمونە با تابلۆی «كەوتنەخوارەوەی ئیكارۆسی» پێتەر برۆگڵ وەرگرین. بۆیە برۆگڵ وەردەگرم چونكە برۆگڵ سەرەتای تێكشكاندنی وێنەی تەقلیدیی گەردونە لە هونەری شێوەكاردا، سەرەتاكانی تێكشكاندنی ئەندازەی تەقلیدی هێڵ و سەرەتای دەركەوتنی جوڵەی فرە ڕوانگەی چاوە، بەڵام لای برۆگڵ درەختی گەردون هەمیشە وەك خۆیەتی، شتەكان گەرچی بۆ مەبەستی گەیاندنی مانایەكی نالۆژیكی نیگاركراون، بەڵام ئەو شانۆ گەردونییەی ڕووداوەكانی لەسەر ڕوودەدات ملكەچی هەمان وێنەی لۆژیكی ئێمەیە بۆ دونیا. لە كەوتنە خوارەوەی ئیكارۆسدا وەك زۆربەی تابلۆ كلاسیكییەكان خواستی نیگاركێش خواستێكی ئەفسانەییە، بەڵام ئەو شانۆیەی كە

نمایشـەکەی لەسـەر دەکرێت، هـەر هەمـان ئـەو جوگرافیـا تەقلیدییەیـە کـە ئێمـە بـە هەستی خۆمـان و بـە بینینـی سـادەی خۆمـان دەیبینیـن. ئـەوەی بگەڕێتـەوە بـۆ تابلۆکـە دەبینێـت ئەنـدازەی گـەردون وەک خۆیەتـی، سـەروو خـوار روونـە، بـەرزی و نزمـی، دوور و نزیکـی، لێکجیابوونـەوەی ڕەگـەزەکان، وەزیفـەی شـتەکان، هەمـوو شـت لـە جێـگای خۆیەتـی، ئاسـمان هیـچ نییـە جگـە لـە بڵندیـی و کەشـتی هیـچ نییـە جگـە لـە ئامێرێکـی دەریایـی. لـە هەمـوو نیـگارە سروشـتیيە کلاسـیکییەکاندا هـەر کات لـە بەشـێکی دیمەنـە سروشـتییەکەوە دەسـتمان پێکـرد، دەزانیـن دوای ئـەو چـی دێـت، دەزانیـن حەتمـەن لـە دوای ئاسـمان زەوی دێـت، کـە کەشـتی هـات ئـاو دێـت و کەنـار دێـت، کـە شـاخ هـات بـاڵای ئاسـمانە و کـە هـەور هـات ژێـری زەمینـە. نزیـک جوانتـر لـە دوور دەبینرێـت، دوور لێڵتـرە لـە نزیـک، نیـگا لـە ڕوانگـەوە کـە بـۆ خـوار ڕۆدەچێـت دەزانێـت نزمدەبێتـەوە، کـە ئاسـۆیی دەڕوانێـت دەزانێـت دووردەکەوێتـەوە. ئەمجـۆرە ئەنـدازە لۆژیکییـە بەرهەمـی وێنەیەکـی گەردونـە کـە تێیـدا هەمیشـە یـەک لـە دوای یـەک و ڕیزبەنـدی ڕەگەزەکانـی ئاشـکران، ئەنـدازەی شـوێن پارێـزراوە، چەنـدە چیرۆکەکەمـان ئەفسـانەیی بێـت، ناگاتـە ئـەوەی ببینیـن هیـچ شـوانێک مەڕەکانـی خـۆی لەسـەر هـەور دەلەوەڕێنێـت، نابینیـن دوورییـەک روونتـر لـە نزیـک دیاربێـت، وەک دواتـر لای سـوریالییەکان و نیگارکێشـانی تـری سـەدەی بیسـت دێتـە ڕێگامـان و دەیبینیـن.

کـە بـاس لـە مۆدێلـی درەخـت دەکەین، مەبەسـتمان ئـەو وێنـە یەکانگیرەی گەردونـە کـە لۆژیکـی سـەر و خـوار، بـەرز و نـزم، ڕاسـت و چـەپ تێیـدا پارێـزراوە. وێنەیـەک ئەوەنـدەی قاڵبێکـی عەقڵییـە، ژێرخانێکـی بینینـە کـە کولتـوور و ئەزموونـی سـادە و تێگەیشـتنێکی سـادەی فیزیـای گـەردون لـە ناومانـدا چاندوویەتـی، ئاوێنـەی ئـەو دیـوە نالۆژیکـی و بێسـەنتەر و هەڵپـژاوەی خـودی گـەردون نییـە.

لای بـرۆگڵ و بەشـی هـەرە زۆری نیگارکێشـانی دونیـا، ئەنـدازەی گـەردون و

ڕەهەندەکانی شوێن وەک خۆیان پارێزراون، هەتا سوریالییەکی وەک دالیش، کە لە هەر کەس زیاتر لۆژیک و پەیوەندییە مەنتیقییەکانی تێکشکاندوە، زۆرجار هەستدەکەین ئەندازەی شوێن، لۆژیکی فەزای گەردونیی وەک خۆی و بێدەستکاری بەجێهێشتووە، پەیوەندی نێوان ڕەگەزەکانی تێکشکاندوە، بەڵام ئەو شانۆ گەردونییەی کە ئەو نمایشە سوریالی و دەرەعەقڵەی لەسەر دەکرێت، هێشتا وەک خۆیەتی.

یەکێک لەو نیگارکێشانەی کەمێک ئەم وێنە ساختەیەی گەردون، بەجۆرێکی مەجازی و لە فۆرمی میتافۆریکدا تێکدەشکێت «مۆریس ئیشەر»ـە. دەبێت بڵێم کە بەبڕوای من شاعیران و نیگار کێشان هەمیشە پێش فەیلەسوف و زاناکان دەستکاری وێنەی دونیایان کردوە، سیاسییەکان و دینییەکانیش بە هەموو جۆر و چیزەکانیانەوە لە نزمترین ئاستی ئەو پلە بەندییەدان، ئەوان لە هەرجۆرە کەسانێکی دی کەمتر لە دەستکاریکردنی نیگاری دونیادا بەشداربوون. پیاوانی ئایین پارێزەری وێنەی گەردونن وەک درەخت، وەک یەکەیەکی یەکانگیری لۆژیکی کە سیستمێکی سەرتاسەری یەک یاسا دەیبات بەڕێوە . سیاسییەکانیش هەمیشە کۆمەڵگا و دەسەڵات لە سروشتی درەختێکدا دەبینن کە لەسەرەوە بۆ خوارەوە حوکمدەکرێت، وەک بونیادێک کە چەقێکی هەیە وە پێویستی بە ڕێساگەلێکی لۆژیکی توندە تا یەکانگیریی بپارێزێت.

لای ئیشەر جیهان تەنیا ئەندازەی کۆنی فڕێنادات، بەڵکو لۆژیکی خۆشی تەواو دەدۆڕێنێت. ڕەنگە کەم کەسمان هەبێت خولیایەکی کەمی فیکر یان هونەری هەبێت و وێنەی پلەکەکانی ئیشەری نەبینبێت، کە کارێکی لیتۆگرافییە، ئیشەر ساڵی ١٩٥٣ بە ناوی ڕێلێتیڤیتییەوە کێشاویتی. لەوێدا چەند مرۆڤێکی بێ شوناس و بێڕوخسار و وەک یەک لە ناو وێڵگەیەکی گەورەی پێپلەدا سەردەکەون و دەڕۆن و وەستاون و دێنەخوارێ، بێئەوەی نە سەر دیار بێت نە خوار، نە ڕاست و نە چەپ،

هێندەی هێڵێک دەگرین و وادەزانین کە بۆ باڵا دەڕۆین، دەبینین لەسەر هەمان ئاستین و لە سەر هەمان ئاسۆ لەگەڵ ئەوانی دیدا وەستاوین، لۆژیکی بەرز و نزم، دانان و هەڵگەڕانەوە، جوڵە بە ئاڕاستەیەکی دیاریکراو لێرەدا دیار نییە، ئەوەی دڵنیابین ئایا لە خوارەوە سەردەکەوین یان لە سەرەوە دێینە خوارێ کاری نەکردەیە. فیگەرەکان هەموو بەرەو باڵا یان خوارەوە دەجوڵێن، بەڵام وەک لە گەردونێکی ئەفسوناویدا بن، هەموو هەمیشە لە هەمان شوێنن. ئیشەر ئەو تێکشکانی لۆژیکە لە هەموو کارەکانیدا بەڕێوە دەبات. گەر تابلۆیەکی تری وەربگرین کە یەکێکە لە کارە هەرە ناودارەکانی، کارێکە بە ناوی «دونیایەکی تر»ـەوە، ساڵی ١٩٤٧ کێشاویەتی، تێکشکانی هەمان لۆژیک دەبینینەوە، لە یەک کاتدا کە تەماشادەکەین، هەم سەردەکەوین و هەم دادەبەزین، بینەر لە یەک نیگادا، هەم لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەڕوانێت، هەم لەسەرەوە بۆ خوارەوە، هەم بە ئاسۆییش. لە مۆدێلی گەردونی درەختدا لە یەک کاتدا ناتوانین لە سەرەوە سەیری خوارەوە و لە خوارەوە سەیری سەرەوە بکەین، بۆئەوەی بتوانین وابکەین، دەبێت قاڵبەکانی خەیاڵ و فۆرمە ئەندازەییەکانی نیگار تێکبشکێنین و دونیا بەجۆرێکی تر ببینین.

هەڵبەت تێکشکاندنی ڕوانگەی کلاسیکی لە نیگارکێشاندا پێش ئیشەر لای بیکاسۆ ئەنجامدرابوو... ئەو زنجیرە لۆژیکییەی کە نیگارکێشانی کۆن ڕەچاویان دەکرد تێکشکا. لە وێنەی دێریندا کە پۆرترێتی کەسێک دەکەین، هەمیشە چەناگە لە خوارەوەیە، لێو دواتر، کەپوو باڵاتر، چاو بەدوایدا. بەڵام پیکاسۆ هەموو ئەو ڕیزبەندیی و یەک لەدوایەکییەی تێکشکاند، لای پیکاسۆ چەناگە دەچێتە شوێنی چاو و چاو دەچێتە ژێر کەپووەوە. پیکاسۆ گەمژە نەبوو کە وایدەکرد، بەڵکو وێنەیەکی دونیا و واقعی دەشکاند تەمەنی هەزاران ساڵ بوو. ئەو یەک لە دوای یەکی و زنجیرە سازییەی دەپچڕاند کە بەرەنجامی ئەو وێنە سروشتییەی گەردون

بوو وەک درەخت. ئەو شکاندنە مەرج بوو بۆئەوەی دواتر ئیشەر نیگارێکی ئەندازەیی ڕۆشن بۆ نەمانی هەرجۆرە ڕوانگەیەکی نەگۆڕ و تاک ڕەهەند بکێشێت. نەمانی سەرو خوار لای بیکاسۆ، سەرەتایەکی گرنگی نەمانی سەر و خواریش بوو لای دۆلۆز.

لە جێگایەکدا وێنەی جیهان وەک وێنەی درەخت بێت، جۆرە فەلسەفەیەک سەر هەڵدەدات تێیدا بیرکردنەوە بە هەمان لۆژیکی ئاسنین و هەنگاوبە هەنگاو دەڕوات. شکاندنی مۆدێلی درەخت لە هەمانکاتدا بەخشینی فەزایەکی نوێیە بە بیرکردنەوە. بیرکردنەوەی فەلسەفی لە ئەفلاتونەوە تا دەگەینە سەر پۆست ستراکتورالیستەکان مەحکومە بە ڕیز بەندییەکی لۆژیکی، سیستمی فەلسەفی دەبێت بەجۆرێک بێت توانای تەفسیرکردن و لە خۆگرتنی هەموو بوونی هەبێت، واتە ڕەوشێکی هەبێت دونیا و مێژوو لەسەرەتاوە تا کۆتایی تەفسیربکات. لێرەوە تەواوی فەلسەفەکان لە ئەفلاتونەوە تا هایدگەر یان فەلسەفەی سەراپاگیرن «وەک لای ئەفلاتون، هیگڵ، مارکس» دەبینین، یان ڕێخۆشکەرن بۆ ئەو جۆرە بیرکردنەوە «سەراپاگیرە» «وەک لای دیکارت، کانت» بەرچاوماندەکەوێت. لێرەدا گەڕان هەمیشە بەدوی «یەک لە دوای یەکی مەنتیقی» دایە. دەستنیشانکردنی ڕێگایەکی ڕاست و ڕوونە بۆ جوڵەی بیرکردنەوەمان کە ئەرکێتی بە وردی یاساکانی جوڵەی ناو دونیاش بخوێنێتەوە. هەر بیرکردنەوەیەک ئەو ڕیزبەندییە لۆژیکییە بشکێنێت، ئەو توانای ڕیزکردنە ماتماتیکییە بۆ حەقیقەت لە دەستبدات، سروشتی بیرکردنەوەی فەلسەفیش لەدەستدەدات. تەنیا لەگەڵ پۆست ستراکتورالیستەکانی وەک فۆکۆ و دۆلۆز و دێریدا دا، فەلسەفە بە ڕوونی لە خواستی دروستکردنی سیستمی یەکانگیر و داخراو و سەرتاسەر ڕزگاریدەبێت و بیرکردنەوەی فەلسەفی لەوە دەکەوێت عەودالی سیستمی ئەفلاتونی داخراو بێت. لەگەڵ ئەواندا بیرکردنەوە دەبێت بە پرۆسەی «کردنەوەی ڕووبەری نوێی بیرکردنەوە». واتە بیرکردنەوە وای

لێدێت بتوانێت «ئارپێککگەرا» یان ئانارشی بێت، ئانارشی بوون لێرەدا ڕزگارکردنی بیرکردنەوەیە لە فەزای داخراو، لە خزاندنی بەردەوامی فیکر بۆ ناو سیستمی سەراپاگیر. پرۆسەی بیرکردنەوە پرۆسەی هاتوچۆ نییە بە شەقامێکی یەک ئاڕاستەدا، بەڵکو جوڵەیە بە هەموو لایەکدا، بازدانە، لادانە، دووبارەنەکردنەوەیە، خیانەتکردنە، باوەڕنەبوونە بە ئامانجێکی گشتی یان بە سیستمێکی ئاسنینی لۆژیکی. واتە چیتر ئەرکی فیکر نییە بە جۆرێکی ئەندازەیی وێنەیەکی ئەندازەیی بۆ جیهان بکێشێت... لەوەدەکەوێت گەڕانێکی سیستماتیزەکراو بێت بۆ حەقیقەت و لەبری ئەوە خۆی دەبێت بە دروستکەر و بەرهەمهێنی حەقیقەت. بە مانایەکی گشتی تر، چیتر فەیلەسوف ئەو نیگارکێشە نییە کە نیگاری دونیا لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی دەکێشێت، ئەو کەسە نییە کە سیستمێک دادەڕێژێت وەڵامی هەموو پرسیارەکانی تێدایە، وێنەیەکی گەردون و کۆمەڵگا و مۆراڵمان پێدەبەخشێت کە یەک یەکدی تەواو دەکەن. بە پێچەوانەوە فەیلەسوف لە بری نیگارکێش دەبێتە کەرەستەساز، لە بری ئەوەی ئەو وەڵامانەمان پێشکەشبکات کە دەبێت بیدەینەوە، ئەو ئامێرانە دروستدەکات کە دەتوانین لە کاتی گەڕانماندا بەدوای وەڵامدا بەکاریانبهێنین. فۆکۆ گەلێک ڕوون ئەو وەزیفە نوێیەی فیکری ڕوونکردۆتەوە، ئەو لە چاوپێکەوتنێکدا کتێبەکانی خۆی بەمجۆرە وەسفدەکات «هەموو کتێبەکانم، گەر بتەوێت، سندوقی کەرەستەن. خەڵکی گەر سەریان هەڵبدەنەوە و بیانەوێت ئەم ڕستە یان ئەو بیرۆکە یاخود ئەو شیکارە وەک دەرنەفیز بەکاربهێنن، بۆ ئەوەی شۆرتێک لە سیستمی دەسەڵاتدا دروستبکەن، یان هەڵیوەشێنن، یان بیتەقێننەوە. کارێکی باشە، زۆر زۆر چاکە، هەتا ئەگەر لە بەرابەر ئەو سیستمی دەسەڵاتەشدا بێت کە کتێبەکانی منی لێوە دەرچووە». فیکر چیتر دونیا وێناناکاتەوە، بەڵکو وەک کەرەستە لە کویادا ڕێگاکان داخرابوون، هەوڵدەدات بیانکاتەوە.

کـە فیکـر خـۆی بـوو بـە کەرەسـتە، لـەوە دەردەچێـت ئامانجێـک و سـەنتەرێکی هەبێت. فۆرمـی درەخـت، فۆرمێکـی سـەنترالیزەکراوە، چەقێکـی هەیـە، شـاڕەگێکی هەیـە لەسـەری وەسـتاوە. بـەڵام لەگـەڵ دۆلـۆز و فۆکـۆ و دریدایـە، بیرکردنـەوەی بێسـەنتەر، کتێبـی فـرە بـاڵ و فـرە بابـەت و فـرە زمان دەردەکەوێت، ڕاپسـکاندنی شـتەکان لـە ناوکۆیـی خۆیـان، دێتـە مەیـدان.

ئەگـەر فۆرمـی کلاسـیکی بیرکردنـەوە لەسـەر گـەڕان بـۆ جەوهـەر، گـەڕان بـۆ سـەلماندنی مەنتیقـی، بـۆ کۆکردنـەوەی شـتەکان لـە نـاو یـەک ناوکۆییـدا بەنـد بێـت، ئـەوا شـکاندنی سـەنتەر، وشـککردنی شـاڕەگ، لێـدان لـە قـەدی درەخـت «وەک ئـەو کۆڵەکـە گەورەیـەی هەمـوو شـتەکان ڕادەگرێـت» دەبێـت بـە ئامانجـی فەلسـەفە.

دۆلـۆز کـە وەک نیتشـە دوژمنێکـی سەرسـەختی ئەفلاتونییەتـە «وەک باوکـی هەمـوو کلاسـیک و کۆنزەرڤاتیڤەکانـی نـاو فەلسـەفە»، ڕەخنـە لـەو هـەرەم و ڕیزبەندییـە ئەفلاتونییـە دەگرێـت کـە هەموو فەلسـەفە بە کێشـەکانی خۆیـەوە سـەرقاڵدەکات. هەمـوو دەزانیـن ئەفلاتـون لـە نێـوان دونیـای ئێمـە و دونیـای ئایدیاکانـدا جیاکاریـدەکات، هەمـوو شـتەکانی دونیـای ئێمـە وێنەگەلـی شـتی ئۆرگینالـن کـە بوونـە ڕاسـتەقینە و ڕەسـەنەکەیان لـە دونیـای ئایدیاکاندا هەیـە. بـەڵام ئەفلاتـون لـە نێـوان دوو جـۆر وێنـەی دیشـدا جیاکاریـدەکات. ئەوانـەی لاسـایکردنەوەی ڕەسـەنی وێنـە ئۆرگینالـەکان، واتـە لـەو دەچـن، لەگـەڵ سـیموکولارەکاندا کـە وێنـە سـاختەکەن و لـە وێنـە ڕەسـەنەکە ناچـن. واتـە سـیموکولارەکان وێنـەی شـتەکە هەڵدەگـرن، بـەڵام ماهییەتـی ئەویـان نییـە، مـرۆڤ وێنـەی خـودا هەڵدەگرێـت، بـەڵام ماهییەتـی خـودای نییـە، مـرۆڤ سـیموکولارێکە، لادانـە لـە جەوهـەری ئیلاهـی، لـە ڕێـگای هەوڵدانـەوە بـۆ دووبـارە لێکچـوون بـەو نمونـە باڵایـە، دەتوانێـت هەوڵبـدات لـە ئیدیـال نزیـک بێتـەوە.

تێکدانـی ئـەم هەرەمـە ئەفلاتونییـە، ئـەم ڕیزبەندییـە کلاسـیکییە کـە

تێکدانی زۆربەی دوولانە گرنگەکانی دی ناو فەلسەفەشی لێدەکەوێتەوە، وەک دوولانەکانی «نەگۆڕ و راگوزەر» «ئۆرگینال و کۆپی» «ناواخن و ڕوکەش» «بالآ و نەوی»... ئامانجی فەلسەفەی پۆست ستراکتورالیستییە. لای دۆلۆز جیهان ئەو فۆرمە هەرەمییەی نییە، سیموکولارەکان لادان نین، کەوتن و هەرەس نین، هێزی نەفیکەرن، بوونن لە جۆرێکی دیکە، ساختە نین، چونکە لە بنەرەتدا ساختە و ئۆرگینال بوونیان نامێنێت. بەڵکو دەبن بە پارچەی جوڵاو لە ناو تۆڕێکی مەزندا کە سەنتەری نییە.

دۆلۆز لە بری وێنەی درەخت وێنەی ڕەگەتۆڕ وەردەگرێت، جێگایەک کە سەنتەری نییە، جیهانێک کە راست و چەپ، سەر و خواری تێدا نییە، شاڕەگ بوونی نییە، شادەمار بوونی نییە، تاکە قەدی ڕاگر بوونی نییە، بەڵکو تۆڕێکی زۆر گەورەی فرە باڵ و فرە ئاڕاستە هەیە کە هیچ پنتێک تێیدا لەوانی تر سەنتەرتر و بنەڕەتیتر نییە. مرۆڤ دەتوانێت لە هەر خاڵێکەوە دەست پێبکات و ئازادانە دەست بۆ هەر خاڵێکی دی بەرێت. بەپێی ئەم وێنەیە مرۆڤ لەسەر هێڵێکی دیاریکراو ناجولێت و لەو خاڵانەشدا کە تیا دەوستێت وردە وردە و تنۆک تنۆک حەقیقەت کۆناکاتەوە، هێڵی مەعریفەت هێڵێکی ڕاست نییە، بەڵکو گەشتێکی گەورەی بێئاڕاستەیە بە سەر کۆمەڵێک شوێنپێی دیکەدا، بەسەر ئاسەوارگەلێکدا ئەوانی دی پێش ئێمە جێیان هێشتووە. جیهان چیتر پێکهاتێک نییە بە ڕیزبەندییەکی لۆژیکی و مەنتیقیەوە کە دەبێت دوای دۆزینەوەی لۆژیکەکەی بکەوین. بەڵکو لەیەکدان و لەیەکگیربوونی کۆمەڵێک ماشێنی گەورە گەورەیە لەگەڵ یەکدا کە وەردەگرن و دەدەنەوە. لەم جیهانەدا گەڕان بۆ سیستمێکی بیرکردنەوەی داخراو ئەستەمە، مرۆڤ لە بەردەم هەزاران ڕێگادایە، لە ناو تۆڕێکدایە، دوا خاڵ و دوا ئامانج بوونی نییە تا پێیبگەین. بەڵام وەک فۆکۆ دەڵێت دەکرێت لە هەر جێگایەکدا سندوقی کەرەستەکانمان دەربهێنین و دەستبکەین بە ئیشکردن، بە هەڵوەشاندن، بە جێهێشتنی شوێن دەستمان.

لێرەدا هیچ ڕاستییەک ڕاستی ڕەها نییە وەک لە ناو سیستمێکی هەرەمیدا یان لە مۆدێلی درەختدا دەیبینین، بەڵکو شوێندەستێکە دەکرێت وەزیفە و مانای ئاسەوارەکانی بەپێی ناوکۆییەکان بگۆڕێن. لەم جیهانەدا پەیامەکان کە دەردەکرێن ئاڕاستەیان نییە، گوێگرەکانی دیار نین، ئەوانیش لە ناو تۆڕێکی نادیاردا دەسوڕێنەوە. لێرەوە چۆن کاری هونەر چیتر ئەوە نییە کە نیگاری دونیامان بۆ بکێشێت، بەڵکو دونیامان بۆ گەورەتربکات، کەناڵی تازەی تیا لێبدات، ڕێگای نوێ و هەرێمی نوێی تیابکاتەوە، فەلسەفەش لە ناو تورێکی وەها گەورەدایە... هەموو چەمکێکی، گرێیەک و پنتێکە لەسەر هێڵێک کە لەسەدان هێڵەوە هاتووە، دەکەوێتەوە سەر سەرە ڕێی سەدان هێڵی تر، کە بە ناویدا دەڕۆن و کاریگەریان جێدەهێڵن... ئەم بە ناویاندا دەڕوات و کاریگەریی جێدەهێڵێت.

جیهان چیتر درەختێکی سادە نییە بە هەندێک وەسف وپۆلینکاری بتوانین بەسەر قەدەکەیدا سەربکەوین و لەوێوە سەرمەستانە هاواربکەین و بڵێین نهێنی وجودمان دۆزییەوە. بەڵکو ئۆقیانوسێکی بێمەودایە لە جیاوازی کە دەبێت ئازادانە تا دەتوانین و تا ئەو جێگایەی هێزی باڵمان لەگەڵماندا دەیکات مەلەی لە ناودا بکەین. فیکر و هونەریش لێرەدا هێندەی خۆیان دەبن بە کەرەستەی دروستکردنی جیاوازی و هەمەڕەنگی، هێندەی کەرەستەی گەورەکردنی دەریاکەن، هێندەی ڕێگای تازە و شەپۆلی نوێی تێدا دەخولقێنن، لە خەیاڵی ئەوەدا نین بتوانن نیگارێکی سەراپاگیر بۆ تەواوی ئۆقیانوسەکە بکێشن. جاران حەقیقەت سیستمێک بوو فێری دەبوویت و باوەرت پێدەهێنا، ئێستا مرۆڤ لە هەر جێگایەکدا بوەستێت «لە ناو زانستدا بێت یاخود هونەر یان فەلسەفە» دەزانێت حەقیقەت لە ملیۆنەها وردە حەقیقەت دروستبووە، کە هیچ سیستمێکی سەرتاسەریی هەمووی لە ئامێز ناگرێت، مرۆڤیش جگە لەوەی بە ناو ئۆقیانوسەکەدا مەلەبکات چارەیەکی تری نییە.

# لە چاوەڕوانی بەربەرییەکاندا

ترسی مـرۆڤ لـە نادیـار یاخـود ئومێدی مـرۆڤ بـە نادیـار، بابەتێکـی سـەرەکی ئەدەبیاتـە. چـی لـە نادیـارەوە دێـت , دڕندەیـەک کـە هێنـدەی دی تـرس و سـامی ژیانمـان لا گـەورەدەکات، یاخـود خودایـەک کـە ڕزگارمانـدەکات؟... چی لـە تاریکیدا خـۆی حەشارداوە، چـی لـە زوڵمەتـەوە دێـت، سـبەینێ زەمـان چـی شـتێکی پێیـە بـۆ ئێمـە؟ ئـەوە پرسـیارە هەمیشـەییەکانی مرۆڤـە. نادیـار شـوێنی ئـەو شـتانەیە کـە روویـان نـەداوە، یـان لەوانەیـە هەرگیـز ڕوونـەدەن. بـەڵام قورسـاییان لەسـەر مـرۆڤ لـە قورسـایی ئـەو شـتانە کەمتـر نییـە کـە ڕوودەدەن. مـرۆڤ هەمیشـە بـەدوای شێوەبەخشـیندا بـە نادیـار دەگەڕێـت، گەشـبینەکان لـەو دیـو تاریکییـەوە فریشـتەی فریـادرەس دەبینـن و ڕەشـبینەکان هێـزی تاریـک و ترسـناک. بـەڵام لـە هەمـوو حاڵەکانـدا نادیـار قورسـایی و ئـازاری خـۆی هەیـە.

«لـە چاوەڕوانـی گـۆدۆ دا» دەبینیـن، ئـازاری ئەوانـەی چاوەڕوانـی فریادرەسـن لـە ئـازاری ئەوانـە کەمتـر نییـە، کـە چاوەڕوانـی هێزێکی ترسـناک و دڕنـدەن. ئـەوەی بـۆ فریادرەسـێک دەڕوانێـت، بەدبەختییەکانـی لەوانـە سووکتر نییـە کـە پێیانوایـە جگـە لـە جانـەوەر و دڕنـدە هیـچ لـە نادیـارەوە نایـەت. لـە ڕاسـتیدا پەیوەنـدی بـە نادیـارەوە پتـر لـە هـەر پەیوەندییەکـی دی جەوهـەری مـرۆڤ دەستنیشـاندەکات. چـۆن سـەیری نادیـار دەکەیـن، ئـەوە وەڵامـی زۆر پرسـیاری گرنگـی دیکـەی مـرۆڤ دەداتەوە، لایەنیکەم شـتگەلێکی

زۆرمـان دەربـارەی ناخـی خۆمـان و دەوروبەرمـان پێدەڵێت. مـرۆڤ هـۆی زۆر و بەهانـەی جیـاوازی هەیـە تـا هەمیشـە لـە نادیـارەوە چاوەڕوانـی ترسـێک یـان موعجیزەیـەک بێـت، بـەڵام لـە زۆربـەی نمونەکانـدا وێنەمـان بـۆ نادیـار دەرکەوتنـەوەی ئومێـد و ترسـە ناوەکییەکانـی خۆمانـە. مـرۆڤ هەمیشـە دۆخـی دەرونـی خـۆی لەسـەر دونیـای دەرەوە نیگاردەکاتـەوە. زۆرجـار ژیـان، هەمـوو ژیـان کورتدەبێتـەوە بـۆ سـەیرکردن و چاوەڕوانکردنـی نادیـار. بـەڵام لـە هـەر سـات و لـە هـەر جێگایەکدا ئـەو نادیـارە ناوێکـی هەیـە... ئـەوەی مـن لێـرەدا دەربـارەی دەدوێـم، ئـەو سـاتەیە کـە نادیـار، نـاوی «درنـدە نەناسـراوەکان» یاخـود بەواتایەکـی تـر نـاوی «بەربەرییەکان»ـە. مـرۆڤ لـە سـەرەتای بونیادنانییـەوە بـۆ شـار و نیشـتەجێی خـۆی، هەسـتدەکات لـە هـەر سـاتێکدا بێـت، هێزێکـی نادیـار، لەشـکرێکی ترسـناک و نەناسـراو دەدات بەسـەریدا، مـرۆڤ هەمیشـە پێویسـتی بـە دڕندەیـەک هەیـە لـە خەیاڵیـدا بێـت و بپرسـێت کـەی پەلامـارم دەدات، خـودی ئـەو ترسـەیە وادەکات شارسـتانییەتەکان بناغـەی خۆیـان بەهێزتربکـەن و لەشـکری بەهێزتـر دانێـن و هێرشـی پێشـوەخت دەسـت پێبکـەن. باشـترین پیشەسـازییەک مـرۆڤ دەیزانێـت، پیشەسـازی دروسـتکردنی دوژمنـی خەیاڵییـە، مـرۆڤ بـەردەوام پێویسـتی بەوەیـە باوەڕبهێنێـت کـە دڕندەکان لـەو دیـو دەرگان. لـە دونیـای کۆنـدا ئـەو ترسـە لـە نادیـار، هـۆکار و بەهانەیەکـی کۆنکرێـت بـۆ خـۆی دروسـتدەکات و دەبێـت بـە تـرس لـە بەربەرییـەکان. «بەربەریـی» ئـەو هێـزە ترسـناک و نادیـار و بێشوناسـەیە کـە لەودیـو سـنوورەوە دێـت، غەریبەیەکـی ترسـناکە، دەدات بەسـەرماندا و تـەواوی دونیامـان لـێ دەشـێوێنێت. بـەڵام دواتـر کـە دەگەینـە سـەردەمی کۆمەڵـگا و ئیمپراتۆرییـەت و دەوڵەتـە ڕێکخـراوەکان، کـە دەگەینـە سـەردەمی تـرس لـە خـودا، «یـان دواتریـش سـەردەمی تـرس لـە نەبوونـی خـودا» کۆمەڵگایـەک وە فەردێکیـش نامێنێـت، ترسـێکی گـەورەی لـە هێـزە کوێـر و نادیـارەکان، لـە شـەیتانەکانی نـاو

تاریکی نەبێت. مرۆڤ چ وەک تاک و چ وەک کۆمەڵگا هەمیشە دەبێت لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بێت، لە دۆخێکدا بێت ئامادە بۆ پێشوازی یان ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە نادیارەکانی ئەو دیو سنوور.

ئەدەب ئەو چاوەڕوانییەی گۆڕیوە بۆ یەکێک لە بابەتە سەرەکییەکانی خۆی. ئەم وەهمە ئینسانییە گەورەیەی تاک و کۆمەڵگای کردوە بە بابەتی تێڕامان. لەو دیوە چاوەڕوانیی نادیارەوە چی دێتە ڕێگامان، گۆدۆ یان بەربەرییەکان؟... ئەگەر بەربەرییەکان لەو دیو دەرگان ئەوا ڕەنگیان چۆنە، ئەگەر بێن چیمان بۆ دەهێنن، ئەگەر نەیەن ئێمە چی بکەین، یاخود لە ساڵان و لە کاتی چاوەڕوانیدا چی لە هەناو و ژیانی ئێمەدا دەگوزەرێت؟.

«ج.م. کۆیتزی» ڕۆمانێکی جوانی هەیە هەر بە ناونیشانی «لە چاوەروانی بەربەرییەکاندا»یە. کەسایەتییەک کە دەشێت هەر بەناوی وەزیفەکەیەوە «ماگسترات»، بەو جۆرەی لە ڕۆمانەکەدا ناوی هاتووە، ناوی بهێنین، لە سەر سنووری جێگایەکی نادیار فەرمانبەرە. شوێنەکە بێ ناوە، دەشێت هەر جێگایەکی دونیا بێت، خاڵێکە لە نێوان سنووری دوو جیهاندا، جیهانی ئێمە و جیهانی ئەویدی، جیهانی ئێمە و جیهانی نادیار، خاکی ئێمە و خاکی بەربەرییەکان، لەوێدا بەرپرسی کاروباری ئیداری و قانونییە. شوێنێکە هەلومەرجێکی ئینسانی وەها باڵی بەسەردا کێشاوە، کە دەشێت هەر شوێنێک و هەر شارێک و هەر سەر سنوورێک بێت. بەڵام هێڵێکە ئەو شارۆچکەیە لە سنووری نادیار جیادەکاتەوە. دەبێت بزانین بۆ ئەوەی چاوەڕوانی بەربەرییەکان بکەین، پێویستە سنوورێکمان هەبێت، دەلاقەیەک لەوێوە بزانین بەربەرییەکان دیارن یان نا. ماگسترات پیاوێکی یاساناسە و باوەڕی بە ڕێزی مرۆڤ و ئیدارەی مۆدێرن و دەوڵەتی ماف هەیە، بەڵام لە سەراسەری مەملەکەتدا وا بڵاوە کە «بەربەرییەکان» هێرشدەکەن، گەرچی ئەم دەنگۆیە هیچ بنەمایەکی

ڕاستەقینەی نییە... بەڵام ترس لە بەربەرییەکان ترسێکی ڕاستەقینەیە. دەوڵەت یەکێ لە ژەنراڵەکانی خۆی بە ناوی «سەرهەنگ جول»ـەوە دەنێرێت تا شەڕی بەربەرییەکان بکات، سەرهەنگ پێچەوانەی ماگستراتە، دڵڕەق و عاشق بە سزا و تۆقاندنە، ئیشی ئەوەیە فەزایەکی وا بخولقێنێت ترس لە بەربەرەکان لە ترسێکی تەماوی و ناڕۆشنەوە ببێتە ترسێکی ڕاستەقینە... وەک هەموو جەنگاوەرە شەڕانییەکان باوەڕی بەوە نییە لە شوێنی خۆی دابنیشێت و چاوەڕوانی دوژمن بێت، دەیەوێت هێزی تەواوی بێت و پەلاماری بەربەرییەکان بدات. تەواوی ڕۆمانەکە لە ڕوانگەی ماگستراتەوە دەگێڕدرێتەوە، ئەو نوێنەری دیوە عەقڵانی و مرۆڤدۆستەکەی ناومانە، نە باوەڕی بەوەیە بەربەرەکان هێرش بهێنن و نە باوەڕی بەو شێوازانەی سەرهەنگ هەیە، کە بەجۆرێکی دڵڕەقانە لەگەڵ خەڵکانی دەرەوەدا دەجوڵێتەوە. دوای ئەوەی سەرهەنگ جول بە کارێک دەڕوات بۆ دەرەوەی شار، ماگسترات وەک تاکە بەرپرسی ڕاستەقینەی ئەو جێگایەی لێدێت. ماگسترات لە زینداندا کچێکی بەربەر دەدۆزێتەوە کە لە ژێر ئەشکەنجەدا زۆر ئازار دراوە. کچەکە دەباتە لای خۆی و بایەخێکی بێوێنەی پێدەدات، ئەوان لە زمانی یەک نازانن، کچەکە قاچی شکاوە، بەڵام ماگسترات هێدی هێدی پەیوەندییەکی دەرونی و جەستەیی لەگەڵدا دروستدەکات. پەیوەندی نێوان ماگسترات و کیژە بەربەرەکە، زۆر دیمەنی ڕۆمانی «ماڵی کیژە خەوتووە جوانەکان»ـی کاواباتا، یان «یادگارییەکانی سۆزانییە غەمگینەکەم»ـی مارکیزمان بەیادا دەهێنێتەوە، هەڵبەت دەبێت بڵێم کە ڕۆمانەکەی کۆیتزی زۆر پێش ئەوەی مارکیز نوسراوە. بەڵام لە دیمەنەکانی عەشق و سێکسدا فەزای ئیشەکان لە هەر سێ تێکستەکەدا زۆر لە یەک نزیک دەبنەوە. ماگسترات بۆئەوەی ئەو پەیوەندییە سێکسییەی خۆی لەگەڵ کیژێکی تێکشکاو و دیلی بەربەردا بەجۆرێکی ناجوامێرانە نەشکێتەوە، بڕیار دەدات کیژەکە هەڵگرێت و

بەرەو نـاو بەربـەرەکان بـڕوات و کچەکەیـان بـۆ بگێڕێتـەوە. ماگسـترات بەو سەفەرەی دەیەوێت پێمانبڵێت مەرج نییە دڕندەیی و وەحشیگەریی هەمیشە لەو دیو دەرگاکانەوە بن، لە ئەویدییەوە بێت، بە پێچەوانەوە وەحشییەت دەشێت سەرچاوەکەی لە ناوەوە بێت، بەرهەمی ئەمدیو سنوور بێت نەوەک ئەودیوی. ماگسترات لەسەفەرێکی درێژدا کیژەکە دەگێڕێتەوە بۆ ناو بەربەرەکان، ئەو لەو دیو دەلاقەکانەوە مەترسییەک و دوژمنێکی ترسناک نابینێت... سەفەرەکەی لەگەڵ هەموو ناخۆشییەکانیدا، سەفەر نییە بۆ ناو خاکی کۆمەڵێک دڕندە. بەربەرییەکان کەسانێک نین، دڕندەترین لە مرۆڤەکانی تر. چاوەڕوانی بەربەرییەکان هێندەی پەیوەندی بە خۆمانەوە هەیە، هێندە پەیوەندی بە خودی بەربەرەکانەوە نییە. ئەوە ئێمەین پێویستمان بە ترسە لە بەربەرەکان، ئێمەین پێویستیمان بە خۆ ئامادەکردنە بۆ شەڕێکی بەردەوام لەگەڵ بەربەرەکاندا. هەڵبەت ئەم لۆژیکە لای خەڵکی سادە و لای شەڕانگێزانی وەک سەرهەنگ جێگای نابێتەوە. هەر پەیوەندییەک بە بەربەرەکانی ئەو دیو سنووری شار، خیانەتە. بەڕای جول بەربەرییەکان بۆیە لەوێن تا جەنگیان لەگەڵ بکەین، گەر دەربکەوێت ئەوانیش وەک ئێمە وان، ئەو کات لە چی بترسێن و ڕقمان لە کێ بێت، کێ ئەشکەنجەبدەین و سوپا بۆ کێ کۆبکەینەوە؟.

هێندەی ماگسترات دەگەڕێتەوە و سەرهەنگ بە چیرۆکی سەفەرەکەی دەزانێت ڕاستە و ڕاست دەیگرێت و دەیخاتە زیندان و سووکایەتییەکی بێوێنەی پێ دەکات. سەرهەنگ سووره لەسەر پەلامار، لەسەر بە گژداچوونەوەی ئەو بوونەوەرە شەڕانگێزانەی لەو دیوی سنووری ئێمەوەن. بەڵام شەڕ لەگەڵ بەربەرەکاندا چارەسەر نییە، هەمیشە شەڕێکی دۆڕاوە... مرۆڤ ناتوانێت دوژمنێکی نەناسراو ببەزێنێت، لەبەرئەوە سەرهەنگ و سوپاکەی بەدەردێکی گەورە دەچن، دوای ئەوەی

دەڕۆن و هێـزە تێكشـكاوەكەیان ئـەو نـاوە جێدەهێڵێـت، ماگسـترات دەسـەڵات وەردەگرێتـەوە، دیسـانەوە خولێكـی نوێـی چاوەڕوانـی دەسـت پێدەكاتـەوە، دووبـارە ئـەو پرسـیارە سـەر هەڵدەداتـەوە ئایـا «بەربەرییـەكان» دێـن یـان نایـەن. ئـەوە خولێكـی ئەبەدییـە... مـرۆڤ دیسـانەوە دەبێـت دانیشـێت و چاوەڕوانـی بەربەرییـەكان بـكات.

كۆیتـزی لـەم ڕۆمانـەدا دەیەوێـت ترسـمان لـە نادیـار بشـكێنێت، دەیەوێـت بپرسـێت بەربەرییـەكان كێـن، ئایـا مـرۆڤ دەبێـت سـەرەتا ترسـی لـە دڕندەكـەی نـاو خـۆی بێـت، یـان دڕندەكـەی دەرەوە؟ كـێ دڕندەیـە، جـول یـان كچـە بەربەرییەكـە؟ دەبێـت لـە چـی بترسـین لـە نادیـار و نامـۆ یاخـود لـە ترسـی قووڵـی خۆمـان لـەو دوو دیاردەیـە؟. بەربەرییـەكان گـەر ئامـاژەبـن بـۆ هێزێكـی نادیـار، بـۆ دوژمنێكـی وەهمـی، ئـەوا بـە دڵنیاییـەوە نایـەن، هەرگیـز ناگەنـە لای ئێمـە، چونكـە كـە گەیشـتن ئیـدی بەربـەر نیـن، ئـەوان هەمیشـە لـەو دیـوەوە دەمێننـەوە و وادەكـەن چاوەڕوانیانبكەیـن. گـەر ئامـاژەش بـن بـۆ دڕندەیـی مـرۆڤ، بـۆ خواسـتی تێكدەرانەمـان، ئـەوا هاتـوون و لـە مێـژە گەیشـتوون و لەناوماندا نیشـتەجێن. كۆیتـزی پێمـان دەڵێـت، مـرۆڤ لـە چاوەڕوانـی زۆری بەربەرییەكانـدا لەوانەیـە خـۆی ببێـت بـە بەربـەری، یـان لەوانەیـە هـەر خـودی چاوەڕوانكردنـی بەربەرییـەكان نیشـانەی بەربەریبوونـی ئێمـە بێـت.

***

مـرۆڤ بوونەوەرێكـە ژیانـی خـۆی بەجۆرێـك ڕێكدەخـات وەك ئـەوەی هەمیشـە دوژمنێـك لـە دەرەوە چاوەڕوانی پەلاماردانی ئەوبێت. سـەردەمانێكی زوو كـە مـرۆڤ هێشـتا لـە ئامێـزی سروشـتدا بـوو، سـەردەمانێك كۆمەڵـگاكان لـە خێڵـی بچـوك و پەرتـەوازە دروسـتبووبوون، سـەردەمانێك شارسـتانییەت بـە مانـا مۆدێرنەكـەی بوونـی نەبـوو... ئـەو ترسـە زەمینـە و هـۆكاری خـۆی

هەبوو. ئەوەی ئێستا جێگای سەرنجە ئەوەیە، ئەم ترسە لە مرۆڤی مۆدێرندا نەوەک کەمی نەکردوە، بەڵکو وەک هەستێکی نهێنی و شاردراوە بەتەواوی ژیانماندا پەلیکێشاوە و برێکی زۆر لە هەست و ڕوانینەکانمان دیاریدەکات، بەجۆرێک دەکرێت بڵێین ژیانی ئێمە لە ناوەوەڕا یەک دینەمۆی گەورە دەیجوڵێنێت ئەویش ترسە لەوانی دی. بەشی هەرە زۆری مێژووی سیاسی مرۆڤ بۆئەوەیە بەهانەسازی بۆ ئەو ترسە بکات... ڕاستە سیاسەت هونەری ترساندن و هێورکردنەوەشە، بەڵام بە پلەی یەکەم هونەری ترساندنە. ئەدەبیات کۆی دیمەنەکە بە جۆرێکی تر دەبینێت و بە شێوەیەکی دیش وێنایدەکاتەوە... سیاسییەکان لەسەر کۆمەڵگا و نەتەوەی خۆیان بە جۆرێک کاردەکەن، ترسێکی هەمیشەییان لە دوژمنی دیار و نادیار هەبێت، ترسێکی ئەبەدی لە پەلاماری بەربەرییەکان. دەبوو ئەدەبیات کۆی دیمەنەکە بە جۆرێکی تر ببینێت، ترس لە بەربەرییەکان لە ژیانی مرۆڤی مۆدێرندا لەوە دەرچووە ترسێکی سیاسی بێت و بووە بە ترسێکی وجودییانەی قووڵ کە ژیانی مرۆڤی بە رەنگی خۆی مۆرکردوە. ئەوەی ئەم بابەتە لە ئەدەبیاتی مۆدێرندا زۆر زەقدەکاتەوە، نادیاربوونی هەرچی زۆرتری خودی دەسەڵاتە لە کۆمەڵگای مۆدێرندا... ئەو نادیاربوونەی کە ترسی مرۆڤ لە ڕووتی و تەنهایی خۆی قووڵتردەکاتەوە. ئەم ترسە لە ئەدەبیاتدا بەر لەوەی بەو جۆرە ناماقوڵە لای بیکیت دەربکەوێتەوە، لای کافکا بە شێوەیەکی رەش و سوریالیستی دەبینرێت. بایەخی کافکا لەوەدایە کە ڕۆماننوسی ترسە نهێنییەکانی مرۆڤە، هیچ کەس وەک کافکا تەعبیری لەو ترس و ونبوون و لاوازییەی مرۆڤ لە بەردەم نادیاردا نەکردوە... ئەو شارەزاییە بچوکەی من لە دونیای کافکادا هەمە، وادەکات بڵێم کافکا مرۆڤ بە گشتی لە چوار وێستگەی سەرەکیدا وێنادەکات. یەک: لە دۆخی چاوەڕوانی «ئەویدی یان بەربەرییەکان» دا «وەک لە بەشی زۆری ڕۆمانی دادگا و هەندێ لە کورتە

چیرۆکەکانیدا دەیبینین». دووەم: لە دۆخی گەڕان بەدوای «ئەویدی یان بەربەرییەکان»دا «وەک لە دادگا و کۆشک دا بە ڕوونی دەیبینین». سێهەم: لە دۆخی کۆبوونەوە و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ «ئەویدی یان بەربەرییەکان»دا «وەک لە نشینگەی سزا دا دەیبینین». چوارەم: لە دۆخی تێڕامانەدا لەو کاریگەرییەی کە «ئەویدی یان بەربەرییەکان» لەسەر بوونمان جێیدەهێڵن «وەک لە ڕموزنبوون دا دەیبینین».

لە دونیای کافکادا ئەویدی و بەربەریم بۆیە پێکەوە گرێدرا، چونکە لای کافکا، ئەویدی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بێڕەحم، سارد، بێهەست، دوور، بێدەنگ، نەگیراو، ناحاڵی دەردەکەوێت... واتە هەڵگری هەموو ئەو سیفەتانەیە کە دەشێت بۆ بەربەرییەک لە خەیاڵماندا بێت.

لێرەدا مەبەستم نییە باس لە کافکا بکەم، بەڵکو دەمەوێت لەسەر ڕۆمانی یەکێک لە نوسەرە کافکاییە ناسراوەکانی سەدەی بیست بدوێم کە ئەویش ڕۆماننوسی ئیتالی دینۆ بۆتزاتییە.

ڕۆمانەکەی «کۆیتزێ» هاوشێوەیەکی گرنگی هەیە، کارێک بە یەکێک لە شاکارە قووڵەکانی ئەدەبیاتی سەدەی بیست حیسابدەکرێت، ئەویش ڕۆمانی «بیابانی تەتار»ی دینۆ بۆتزاتییە. بەبێ گەڕانەوە بۆ بۆتزاتی، تێگەیشتن لەو ژێرخانەی کە تێکستەکەی کۆیتزێی لەسەر بونیادنراوە، کاری نەکردەیە. ئەوەی هەر دوو ڕۆمانەکە بخوێنێتەوە، تێدەگات کە ڕۆمانەکەی کۆیتزێ باوکێکی هەیە چل ساڵ بەر لەو لەدایکبووە. ڕۆمانەکەی بۆتزاتی ساڵی ١٩٤٠ بڵاوبۆتەوە و ئەوی کۆیتزێ ساڵی ١٩٨٠. بیابانی تەتار لای هەندێک لە ڕەخنەگران هەتا دەخرێتە پێشی ڕۆمانێکی گرنگی وەک «گەڕان بەدوای زەمانی بزربوو» ی مارسیل برۆستیشەوە، بەتەواوکەرێکی سروشتی کارەکانی کافکاش تەماشادەکرێت. لێرەشدا «وەک لای کۆیتزێ بینیمان» قسە لە چاوەڕوانی ئەبەدی مرۆڤە بۆ دوژمنێک کە نەیات، دوژمنێک هیچ کەس نەیدیوە. وشەی تەتار لە ناونیشانەکەدا،

ئەو وشەیەیە کە یۆنانییەکان بۆ میللەتانی نەناسراو بەکاریاندەهێنا، پێدەچێت لە «تاتارۆسەوە» داکەوتبێت، کە ئەویش مانای «ئەو کەسەی لە دۆزەخەوە دێت». «جیۆڤانی درۆگۆ»، ئەفسەرێکی گەنجە کە لە یەکەم فەرمانی ڕەسمی خۆیدا دەبێت ڕێگایەکی درێژ ببڕێت و لە جێگایەکی نادیار کە بەسەر بیابانێکی بێسنووردا دەڕوانێت لە قەڵایەک بە ناوی قەڵای باستیانییەوە، یەکەم وەزیفەی خۆی وەربگرێت. کاتێک دەگاتە ئەوێ شوێنێکی لاکەوتە و فەرامۆشکراو دەبینێت کە هیچ کات شتێکی گرنگ تیا ڕووی نەداوە، هیچ کات بەر پەلامارێک نەکەوتووە، جگە لە تارمایی بێدەنگییەکی قورسیش هیچی دی بەدی ناکرێت. بەڵام شوێنێکە یاساگەلێکی توند دەییات بەڕێوە، هەستێکی قووڵ بەترس و چاوەڕوانی زاڵە بەسەر فەزای قەڵاکەدا، ئێشکگرتنی بەردەوام و بێوچان نابێت بە گاڵتەبگیرێت، هەمووان دەبێت لە ئامادەباشی بەردەوامدا بن، چونکە دەشێت تەتارەکان لە هەر ساتێکدا هێرش بهێنن. دەبێت بەردەوام چاو لە بیابان نەتروکێنرێت، هەموو جوڵەیەک چەند بچوک و ناچیز بێت بەهەند وەربگیرێت، چونکە هەر شتێکی گومان لێکراو، هەر جوڵەیەک دەشێت ئاماژەبێت بۆ نزیکبوونەوەی دوژمن. هەموو بەردەوام لەوێ باس لە یەک شت دەکەن، یەک خولیا و ڕەشەخەون ژیانیان دیاریدەکات، ئەویش چاوەڕوانی پەلاماری تەتارەکانە. ئەو تەتارانەی دەشێت لە هەر ئان و ساتێکدا لە ئاسۆ دوورەکانی بیابانەوە دەربکەون و پەلاماربدەن. بەڵام ئەوەی لە ڕاستیدا لە قەڵای باستیانی زاڵە دوو شتە، یەکەم : ئەوەیە کە هیچ ڕوونادات، دووەم: چاوەڕوانییە. بەردەوام ئەو هەستە هەیە کە دوژمن هێرشەکەی خۆی کەمێک دواخستووە، ئەو پەلامارەی ئەمڕۆ ڕووی نەدا، لەوانەیە سبەینێ بێت. درۆگۆ سەرەتا دژ بە حەزی خۆی ڕەوانەی باستیانی دەکرێت، لەگەڵ گەیشتنیدا بەوێ، بە دکتۆری قەڵا دەڵێت «من بە هەڵە ڕەوانەی ئێرە کراوم». وەڵامی

دکتۆر زرینگەیەکی وجودییانەی بەرزی هەیە و دەڵێت «هەموومان بە هەڵە ڕەوانەی ئێرە کراوین». دەبێت لەوێ چوارمانگ بمێنێتەوە، لەو چوارمانگەدا ژیان و ئیقاعی جێگاکە بەجۆرێک لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن کاتێک خزمەتی خۆی تەواودەکات و دەگەڕێتەوە بۆ شار، بۆ رۆتینی مردووی ژیان، بۆ ئەو جێگایەی مرۆڤەکان بە جۆرێکی ڕۆژانە و بەردەوام ئەو ترسە بە چڕی ناژین، بە خۆ ویست دەگەڕێتەوە بۆ باستیانی و لەوێ تا پیربوون و سەرە مەرگ لە دەلاقەکانی قەڵای باستیانییەوە چاوەڕوانی دوژمنێک دەکات کە نایەت و ڕوو بە ڕوو نایبینێت. ئەوەی لە ڕۆمانەکەدا جێگای سەرنجە ئەو ئیقاعەیە کە بەجۆرێکی تەریب لەگەڵ ئیقاعی ناوەوە و ڕەوتی ژیانی درۆگۆدا دەڕوات، تا ساڵەکان زیاتر بڕوات، ژیان خاڵیتر دەبێتەوە لە مانا، ناوەوەی درۆگۆ کاڵتر و هەژارتر دەبێتەوە، درۆگۆ سەرەتا بە خولیای جەنگ و قارەمانێتی و مردنی بڵندگەراوە دەگەڕێتەوە بۆ باستیانی، دوژمنێک هەیە، دەبێت چاوەڕوانی بین و بیبەزێنین، سەرەتا ئیقاعی ڕۆمانەکە چڕ و خێرایە، هەموو سەعاتێک و خولەکێک دەژمێردرێت. هەر ساتە و مانا و سروشتی تایبەتی خۆی هەیە، دە فەسڵی یەکەمی تەنیا لە ماوەی چوار مانگدا ڕوودەدات، دواتر شتەکان مۆنۆتۆن و یەک ڕەنگ دەبن، کات جگە لەوەی دەبێتە دووبارەبوونەوەیەکی ڕێساداری هەمان چاوەڕوانی و هەمان ترس هیچی دیکەی تێدا نامێنێتەوە، درۆگۆ ساڵەهای ساڵ لە چاوەڕوانی هیچدا دادەنیشێت، لەو چاوەڕوانییەدا پیردەبێت، جگە لەو چاوەڕوانی و خۆ ئامادەکردنە بەتاڵەش هیچی دیکە لە ژینیدا نییە، تا هێدی هێدی تەمەن دەیبات، دەچێتە ساڵەوە، پەکی دەکەوێت و نەخۆشی تەنگی پێ هەڵدەچنێت و دەبێت بە زۆر لە قەڵاکەی دووربخەنەوە. ئەوەی لە ڕۆمانەکەدا زۆر ڕەش و زۆر کۆمیدیشە، ئەو هێرشە چاوەڕوانکراوەی تەتارەکانە، کە درۆگۆ ژیانی خۆی لە پێناویدا داناوە، لەو کاتەدا

ڕوودەدات کە درۆگۆ لەسەر پێخەفی مەرگە، لە جێگایەکە لە بیمارستان و پیر و پەککەوتە دوا ساتەکانی ژیانی خۆی دەژمێرێت... بەڵام ئاخۆ ئەم هێرشە بەراستی ڕوودەدات یان ئەوە هەوڵێکی دیکەی بۆتزاتییە بۆ خاڵیکردنەوەی هەرچی زیاتری ژیانی درۆگۆ لە مانا. درۆگۆ لە کۆتاییدا ژیانی خۆی وەک نوکتەیەکی بێتام سەیردەکات، وەک گاڵتەپێکردنێکی ناخۆش. مردنی درۆگۆ لەو کاتەدا کە تەتارەکان هێرشدەبەن، بەڵگە نییە بۆ مانـاداری ئەو چاوەڕوانییە قووڵەی درۆگۆ بۆ تەتارەکان، بەپێچەوانەوە بەڵگەیە بۆ ئەو کۆمیدیا گەورە و پوچییە بێسنوورەی ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیە. ئەو دوژمنەی کە مرۆڤ چاوەڕوانیدەکات، یان بوونی نییە، یان نایەت، یاخود کە هات مرۆڤ لەوێ نییە. لە هەر سێ دۆخەکەشدا ژیانی مرۆڤ هەر لە وێرانەدا تەواو دەبێت. بۆتزاتی بە ڕوونی ئەوەمان پێدەڵێت کە مرۆڤ هیچ نییە جگە لە بوونەوەرێکی خۆخەڵەتێن. هونەری دروستکردنی دوژمن دەرکەوتەی لابەلایی هونەرێکی دیکەیە کە هونەری خۆخەڵەتاندنە. درۆگۆ دەزانێت کە تەتارەکان هەرگیز لەوەوپێش نەبینراون و دەرنەکەوتوون، بەڵام ئەوەی بەلایەوە گرنگە خودی تەتارەکان نین، بەڵکو چاوەڕوانی تەتارەکانە، ئەو سروت و ئامادەکاریی و ئێشکگیرییە کە مرۆڤ دەبێت لە چاوەڕوانی ئەواندا بیچێژێت. لێرەدا بەر هەمان تاریکیی کافکاییانە دەکەوینەوە، مرۆڤ لەسەر زەوی نازانێت چی دەکات، بە هەڵەدا دەبرێت و خۆشی لەگەڵ ئەو گەمەیەدا تا کۆتایی دەڕوات. ئەوەی مرۆڤ بتوانێت چارەنوسی خۆی بگرێتە دەست ئەستەمە، ئەوەی ژیانی ئێمە دیاریدەکات ترسی هەمیشەییمانە لەوانی دی، ترسێک ڕێگریمان لێدەکات و ناهێڵێت ژیانی خۆمان بژین.

ئەوەی لە ڕۆمانەکەدا زۆر قورسە ئەوەیە کە درۆگۆ دەمرێت، بەڵام لە شەڕی تەتارەکاندا نا، ئەو شەڕەی بەدرێژایی ژیانی چاوەڕوانیکردوە... هێرشی تەتارەکان لە کۆتاییدا بۆ ئەوەیە بۆتزاتی بڵێت، شەڕ لەگەڵ

تەتارەکانـدا رووبـدات یاخـود نـا، بایەخێـک یـان گرنگییەکـی نییـە. ئـەوەی ژیانـی مـرۆڤ وێرانـدەکات خـودی شـەڕەکە نییـە، بەڵکـو چاوەڕوانـی ئەبـەدی و دووردرێـژی مرۆڤـە بـۆ ئـەو شـەڕە... ئەوەیـە مـرۆڤ هەرگیـز ناتوانێـت بەتـەواوی بـژی، چونکـە هەمیشـە چاوەڕوانـی پەلامارێـک دەکات کـە دڵنیـا نییـە لـەوەی ڕوودەدات یـان نـا. «هیـچ ڕوونـەدان» ئـەوە سـامناکترین حوکمێکـە بەسـەر ژیانـی مرۆڤـدا بدرێـت. بـە ئومێـدی ڕوودانـی شـتێک مـرۆڤ بەربەریـی و تەتـارەکان دروستدەکات، ئـەوەی وا لـە درۆگـۆ دەکات، ژیانـی شـار بەجێبهێڵێـت و دەسـتگیرانەکەی فەرامۆشـبکات و ڕووبکاتـە سـەر سنوور، ئومێـدی ڕوودانـی شـتێکە. چ لـە کافـکا و چ لـە دینـۆ بۆتزاتییـەوە یـەک شـت فێردەبیـن، ئەویش ئەوەیـە دۆزەخـی ڕاسـتەقینە ئەوەیـە کـە هیـچ ڕوونـەدات. ئێمـە تەنیـا لـە ڕووی ترسـەوە نییـە کـە چاوەڕوانـی بەربەرییـەکان دەکەیـن، بەڵکـو لـەو ڕووەشـەوەیە کـە ئەگـەر چاوەڕوانـی تەتـارەکان نەکەیـن چـی بکەیـن، چونکـە مردنـی ڕاسـتەقینە ئەوەیـە کـە هیـچ ڕوونـەدات. درۆگـۆ بـە نیـازی ڕوودانـی شـتێک، خـۆی دەخەڵەتێنێـت و تـەواوی ژیانـی خـۆی دەخاتـە ژێـر ڕەحمەتـی یاسـاگەلێکی تونـد و بێرەحمانـەوە. بۆتزاتـی قوتابییەکـی گـەورەی کافکایـە، درۆگـۆش وەک «ک» ـی پاڵەوانـی کافـکا لـە کۆشـکدا بـەردەوام دوای شـتێک دەکەوێـت کـە دەیبـات و دەیبـات و نایگەیێنێتـە هیـچ جێگایـەک... هەردووکیـان لـە قووڵاییـدا دەزانـن بۆئـەوەی بەردەوامبـن پێویسـتیان بەوەیـە خۆیـان بخەڵەتێنـن. درۆگـۆ لـە چاوەڕوانـی تەتارەکانـدا دادەنیشـێت و تەتـارەکان نایـەن. بـەڵام درۆگـۆش پێشـخۆی باپیرێکـی گرنـگ و گـەورەی هەیـە... تێکسـتەکەی بۆتزاتیـش ڕۆحـی خـۆی تەنیـا لـە باوکـە کافکاییەکـە وەرنەگرتـووە، بەڵکـو لـە باوکێکـی یۆنانـی و نامـۆ و نەخۆشـەوە کـە «کوستەنتین کافافی»یـە، لـە شـیعرە ناودارەکەیـەوە کـە ئەویـش هـەر بـە نـاوی «لـە چاوەڕوانـی بەربەرییەکاندایـە».

***

«ئێمە چاوڕوانی چیین، وا هەموو لە سەرای شاردا کۆبووینەوە؟/ ئێمە چاوەڕوانی بەربەرییەکان دەکەین. کە بڕیارە ئەمڕۆ بگەن/ بۆ لە سینات کەس ناجولێت و ئیش ناکات؟/ بۆ سیناتۆران لەوێ دانیشتون و یاسا داناڕێژن/ چونکە ئەمڕۆ بەربەرییەکان دەگەن/ سیناتۆران ئێستا یاسای چی بنوسن؟/ کاتێک بەربەرییەکان هاتن، ئیدی ئەوان یاسامان بۆ دەنوسن».

ئەوە سەرەتای قەسیدە بەناوبانگەکەی کافافییە «لە چاوەڕوانی بەربەرییەکاندا». کافافی لە پێشەنگی ئەو نوسەر و شاعیرانەدا بوو کە باسی لە پێویستی و خواستی قووڵی مرۆڤ بۆ بەربەرییەکی نادیار کرد. قەسیدەکەی کافافی گەلێک پێش ڕۆمانەکەی بۆتزاتی و کۆیتزێ، ساڵی ١٩٠٤ نوسراوە. خاڵی هاوبەش و سەرەکی لە نێوان قەسیدەکە و دوو ڕۆمانەکەدا «چاوەڕوانی بێهودەی مرۆڤە» بۆ «بەربەرییەک» کە ناگات. بەڵام جیاوازی گەورەی نێوان قسەکەر لە قەسیدەکەی کافافی لەگەڵ هەر دوو پاڵەوانەکەی بۆتزاتی و کۆیتزێدا ئەوەیە، کە خەڵکی شارەکەی کافافی لێرەدا بۆ جەنگ نەوەستاوەن، لە سەنگەردا نین و بە نیازی پەلاماردانێکی خوێناوی خۆیان نەبەستوە. بە پێچەوانەوە تەواوی شار خۆی ڕازاندۆتەوە و وەک خەڵکێک چاوەڕوانی فریادڕەسێکی گەورەبکەن بەوجۆرە چاوەڕوانی بەربەرییەکان دەکەن. پادشا و فەرمانبەرە گەورەکان هەموو بە تاج و پاستۆنی جوان و شاهانەی خۆیانەوە لە بەر دەرکی شار وەستاون و دەیانەوێت بەربەرییەکان بێن و پێشوازیانبکەن، خەڵکانی قسەکەر و وتاردەریان دوورخستۆتەوە نەبا بە زۆربلێی خۆیان بەربەرییەکان وەڕزبکەن. هەموو خەڵک، لە پادشاوە تا هاوڵاتیان بە ئارەزوویەکی زۆرەوە چاوەڕوانی ساتی دەرکەوتنی بەربەرییەکان دەکەن، بەڵام کات دەڕوات و هیچ دیار نییە. شەو دادێت و خەڵک نائارام و شێواو، نوقم

لە بیرکردنەوەدا، ڕووەو ماڵ، مەیدان و شەقامەکان چۆڵدەکەن، چونکە بەربەرییەکان نایەن. خەڵکێک لە سنوورەوە هاتوون و هەواڵیان هێناوە کە بەربەرییەکان نەماون. ئێستا دەبێت خەڵکی بێ بەربەرییەکان چی بکەن... بەربەرییەکان جۆرێک بوون لە چارەسەر.

لە قەسیدەکەی کافافیدا بەربەرییەکان دوژمن نین، یاخود لایەنیکەم نامانەوێت وەک دوژمن بیانبینین، بەوەدا ئێمە بەربەرەکانمان نەبینیوە، نازانین ماهییەتیان چییە. مرۆڤ هەر کات لە چاوەڕوانی ئەواندا دادەنیشێت، بەدیار خولیا و خەیاڵ و ترس و ئومێدەکانی خۆیەوە دادەنیشێت. بەربەرییەکان ئەو ئاوێنەیەن کە خۆمانی تێدا دەبینینەوە. لە دونیای کافافیدا قەیران و ترسەکە لە دەرەوە نایەت. ئێمە ماڵێکمان نییە بمانەوێت بەربەرییەکان تێکی نەدەن، لێرەدا تەواو پێچەوانەیە... شارێکمان هەیە بێزار لە خۆی، شوێنێکە هەتا پادشا خۆشی بەیانی زوو بە تەخت و تاجییەوە لە خەو هەستاوە و چۆتە دەروازەی سەرەکی شار و بە شەوقەوە چاوەڕوانی بەربەرییەکان دەکات. هیچ ئاسەوارێکی ترس لەو بەربەرانە لە گۆڕێ نییە، هەموو تەدارەکێک کراوە ئەوان رازی بن و دڵیان نەئێشێت. لای کافافیش قەیرانی گەورەی مرۆڤ لە دوژمنە دوور و نادیارەکەیەوە نایەت، قەیرانی گەورە هەمیشە قەیرانی ناوەوەیە، قەیرانی ناو مرۆڤ خۆیەتی. ئەوەی وامان لێدەکات چاوەڕوانی بەربەرییەکان بین، بێزاریمانە لە خودی خۆمان. هەڵبەت خوێندنەوەی زۆر بۆ قەسیدەکەی کافافی دەکرێت... وەک ئەوەی ئەو قەسیدەیە ئاوێنەی ئەو بێزارییە قووڵەیە کە مرۆڤی مۆدێرن لە تەواوی بونیادی شارستانی خۆی هەیەتی. ئەو شارەی لە قەسیدەکەی کافافیدا چاوەڕوانی بەربەرییەکان دەکات، پێناچێت شارێکی پڕ ئاژاوە بێت، شتەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان ڕێک و عاقڵانە دێنە بەرچاو، پادشا بەبێ کێشە لەسەر تەخت و تاجی خۆی دانیشتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاسان

هەموو شتێک دەدرێتە دەست بەربەرییەکان. بەڵام بۆ؟ بۆ کافافی لە دوا دێڕیدا ڕستە هەرە بەناوبانگەکەی خۆی دەڵێت «ئەی ئێستا ئێمە بێ بەربەرییەکان چی بکەین؟ ئەوان جۆرێک بوون لە چارەسەر»؟.
لە قەسیدەکەدا ئاماژەیەکی ڕاستەقینە بۆ هیچ قەیرانێک نییە، کەواتە بەربەرییەکان دەشێت چارەسەری چ دەردێک بووبن؟ .

بەربەرییەکان لێرەدا وەک دکتۆر دەردەکەون نەوەک دوژمن، وەک کەسێک گەر نەیەت ئێمە دەبێت بەدەردی خۆمانەوە بتلێینەوە. مرۆڤی مۆدێرن بوونەوەرێکە گەر شتێک لە ژیانیدا روو نەدات دەخنکێت، ئەو برە زۆرە لە عەقلانییەت و ڕێکخستن کە ژیانی خۆی پێ قانداوە لە ناوەوەرا غەمگینی دەکەن. بەربەرییەکان ژیانمان لە یەک ڕەنگی، لە عەقلانییەتی زۆر، لە یاسای یاسادانەران، لە وتار و قسەی زۆر پاکدەکەنەوە... ژیانمان پێویستی بە هەناسەیەکی کێوی هەیە، بە شتێک ئەوەندە بۆنی یاسا و مەراسیمی لێ نەیەت. کاتێکیش بەربەرییەکان دێن، دەشێت ئەوەمان پێشکەشبکەن.

قەسیدەکەی کافافی تەنیا وەک یەکەیەکی سیمۆتیکی و ڕەمزی دەکرێت بخوێنرێتەوە، ئەو باس لە خۆ ئامادەگی شارێک دەکات بۆ پێشوازی بەربەرییەکان و نائومێدی ئەوان دەمێک دەزانن کە بەربەرییەکان نایەن. ژیان لەو شارەدا بۆنی سروت و ڕێتوالەکانی ڕێکخستنی لێدێت، بۆنی هێمنی لێدێت، بۆنی خۆشگوزەرانی لێدێت، بەڵام لە هەمان کاتدا بۆنی وەڕزیی مرۆڤیشی لە تەواوی ئەو بەند و باوە لێدێت. نائومێدییەکەی خەڵکی شار لای کافافی و نائومێدییەکەی درۆگۆ لای بۆتزاتی، گەرچی بە رووکەش جیاواز دیارن، بەڵام یەک جەوهەریان هەیە... نائومێدبوون لە ژیانی بێ خرۆش و لە قاڵبدراو. ئەوەی خەڵکی شارەکەی کافافی دەجوڵێنێت هەمان ئەو پاڵنەر و پاڵهێزەیە کە لەسەرەتادا درۆگۆی بۆتزاتیش دەجوڵێنێت، گەڕان بۆ شتێک دوور لە ژیانی وەستاو و مەنگ

و دووبـارە، بـەڵام جیۆڤانـی درۆگـۆ دەیەوێـت لـە ڕێـگای جەنگـەوە لەگـەڵ تەتارەکانـدا ئـەو خـرۆش و زیندوێتییـە بـژی، بـەڵام خەڵکی شـارەکەی کافافی دووربینتـرن، دەیانەوێـت جارێکـی تـر دەرگاکان بخەنـە سـەر پشـت و بـاوەش بـۆ بەربەرییـەکان بکەنـەوە و لـەو ڕێگایـەوە خرۆشـی نـوێ بژیـن... کەچـی بەربەرییـەکان نایـەن.

گـەر لێکدانەوەیەکـی فرۆیـدی یاخـود فۆکۆیـی بکەیـن، بەربەرییـەکان دیوە دەرکراوەکـەی ئێمـەن، دیـوە چەپێنـراو و بێدەنگکـراو و کوژراوەکـەی نـاو ژیان و نەسـتمانن. ئێمـە بۆیـە جارێـک دەخوازیـن بەربەرییـەکان بێنـەوە چونکـە پڕ بـەدڵ دەمانەوێـت ئـەو دیوە کپکراو و کـوژراوەی ئارەزووەکانمان زیندووبێتەوە، ئـەوەی کراوەتـە دەرێ سـەر لـە نـوێ بگەڕێتـەوە لامـان، بـەڵام لـە هەمـان کاتیشـدا ئێمـە ترسـێکی گەورەمـان لـە گەڕانـەوەی ئـارەزووە چەپێنراوەکانمان هەیـە، ترسـێکی گەورەمـان لـەوە هەیـە، ئـەوەی لـە تاریکییەکانـی دەروونمانـدا چەپێنـراوە، ئـەوەی فڕێدراوەتـە سـەردابە تاریکەکانـی خەونـەوە، دەرگاکان بشـکێنێت و بگەڕێتـەوە. بەربەرییـەکان سـەمبولی نەسـتن، سـەمبولی ئـەوەن کـە نازانیـن چییـە، سـەمبولی دیـوە تاریکەکـەی خۆمانـن، دیـوی ئـەو دیـوی ڕۆحمـان، دیـوی ئـەو دیـوی شارسـتانییەتمان، دیـوی ئـەو دیـوی بەهـا و مۆراڵمان.

گـەر کەسـێک بیـن وەک درۆگـۆ، دەبێـت خۆبەخشـانە جلـی سـەربازیی لەبەربکەیـن و لەسـەر قوولەیەکـەوە بکەوینـە پاسـەوانیی، تـا ئـەوەی مـرۆڤ لـە مێـژووی دوورودرێـژی خۆیـدا چەپاندوێتـی، ئـەوەی مـرۆڤ بە ناشارسـتانی و دڕندەئاسـا بینوێتـی نەگەڕێتـەوە. ئـەوەی درۆگـۆ لێـی دەترسـێت گەڕانـەوەی ئـەو شـتە چەپێنراوانەیـە کـە مرۆڤایەتـی بەدرێژیـی مێـژووی خـۆی خەفەیکـردون، لـە بەرئـەوە وەک پاسـەوانێکی دڵسـۆزی هەسـت، وەک دەرگاوانێـک کـە لـە بـەر قاپـی مێـژووی شارسـتانییەتدا وەسـتاوە، ناهێڵێـت هیـچ جوڵەیەکـی گوماناویـی بـێ تێبینـی و دوور لەسـەرنج تێپەڕێـت. بـەڵام

خەڵکی شارەکەی کافافی وەک ڕۆحی کافافی خۆی، بێزارن لە هەموو ئەو یاسا و جیهانەی مرۆڤی مۆدێرن دروستیکردوە، لێرەوە گەڕانەوەی چەپێنراو، هێنانەوەی ئەوەی دەرکراوە بە تەنیا چارەسەر دەزانن. دەرگای شارەکەی کافافی لەسەر پشتە بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ بە درێژایی مێژووی خۆی مۆری بەربەرییەتی لێداون، بگەڕێنەوە... ئەوە تاکە چارەی گەورەی مرۆڤیشە لێگەڕێت ئەوەی لە خۆیدا خنکاندویێتی بەبێ جەنگ، بەبێ پێکدادانی ترسناک بگەڕێتەوە.

شتێک لە قەسیدەکەی کافافیدا جوانە ئەوەیە کە بەربەرییەکان دوژمن نین، ئەویدی نین، نەیار نین. بەڵام ئەوە خەونێکی مەحاڵە... مرۆڤ هەمیشە بوونەوەرێکی دوو دیوە، هەمیشە مەخلوقێکی دوو کەرتە لە نێوان نەست و هەستدا، لە نێوان دەرەوە و ناوەوەدا، لە نێوان خۆی و ئەویدیدا، لە نێوان بەرزی خۆی و نزمی بەربەرییەکاندا دەژی و هاتوچۆدەکات... ئەوەی بتوانێت ئەو دوو قاقییە بشکێنێت، وادەکات بتوانێت لەم سروشتەی ئێستاکێی و لە تەواوی ئەو بنەمایانە پاک بێتەوە کە تراژیدیا گەورەکانی وجودی ئەویان داگیرکردوە. خەونەکەی کافافی خەونێکی یۆتۆپی مەحاڵە، مرۆڤ چەندە دەرگا لەسەر بەربەرییەکان بکاتەوە ناتوانن بگەڕێنەوە، لە بەر ئەوەی خودی مرۆڤ پێشتر بەربەرییەکانی فرێداوەتە جێگایەکەوە کە ئیدی نایانبینێت.

لە هەر سێ تێکستەکەدا هیچ کات ڕووبەڕووبوونەوەیەکی بەرچاو لە نێوان پاڵەوان و بەربەرییەکاندا ڕوونادات، گەرچی هەمیشە ئاماژەگەلی زۆر هەن، بۆنەوەی بەربەرییەکان هەن و لەودیو سنووری ئێمەوە وەستاون. بەڵام هیچ کات بەربەرییەکان بە ڕاستی و ڕووبەڕوو تەواو دەرناکەون، تاکە جارێک ئێمە لەو سێ تێکستەدا بەربەرییەک دەبینین کیژی بریندار و شکستی ناو ڕۆمانەکەی کۆێتزێیە، کە ئەویش دەبێت بگێڕدرێتەوە بۆ شوێنی خۆی و دووربخرێتەوە و بدرێتەوە دەست بنەماڵەی خۆی، کە

بە بڕوای مـن کارێکـی ڕەمزییـە بـۆ دەرخسـتنی ئـەو دیـوارەی لـە نێـوان ئێمـە و ئەوانـدا هەیـە، بـۆ تێکـەڵ نەکـردن و لێـک نەدانـی ئـەو دوو دونیایـە. بەربەرییـەکان وەهـا دوور فڕێـدراون، کـە چـاوی مـرۆڤ چیتـر نایانبینێـت... چەنـدە دەرگاکانیـش بکەینـەوە جارێکـی دی ناگەڕێنـەوە، بـەڵام ئێمـە بـۆ ئەبـەد مەحکومیـن یـان بـە ئومێـدی هاتنەوەیـان بژیـن، یاخـود لـە ترسـی گەڕانەوەیـان دەرگاکانمـان دابخەیـن و بـۆ ئەبـەد پاسـەوانی ماڵەکانمـان بیـن.

# ڕۆماننوس و کێشەی حەقیقەت

ساتیرنوسی ئەمریکایی، مارک توین دەیگووت «حەقیقەت لای زۆربەی نوسەران بایەخێکی گەورەی هەیە، لەبەرئەوە لە مەسرەفکردنیدا زۆر دەستدەگرنەوە». ئەم تێگەیشتنە راستییەکی زۆری تێدایە، بەتایبەت گەر بمانەوێت، لە ڕێگای ڕۆمانەوە شتێک لە حەقیقەتی نوسەر خۆی تێبگەین. یەکێک لەو تەوەرە گرنگانەی ئەم کێشەیەی تێدا زەقدەبێتەوە، پەیوەندی ڕۆماننوسە بە پاڵەوانەکانی خۆیەوە... ڕۆماننوس بۆ هەر کوێیەک بڕوات، بەردەوام ئەو پرسیارانە ڕووبەڕووی دەبنەوە «کامە پاڵەوان لە خۆتەوە نزیکە؟» «خۆت لە کامە فیگەری ڕۆمانەکانتدا دەبینیتەوە؟» «چ کەسایەتییەک لە کەسایەتییەکانت خۆتیت؟» «کتێبەکەت چی لەسەر ژیانی شەخسی خۆت ئاشکرادەکات؟». ئەم پرسیارانە ڕەنگە ناخۆشترین پرسیارێک بن ڕوو بە ڕووی نوسەر ببنەوە. نە لە بەرئەوەی جۆری پرسیارەکان دەستبردنن بۆ نهێنییەکی قووڵی نوسین، بەڵکو لە بەرئەوەی بەشی هەرە زۆری نوسەران، لایەنی کەم نوسەرە باشەکان، لە ڕۆماندا شتێکی ئەوتۆ لە سەر خودی ڕاستەقینەی خۆیان یان ئەوەی پێیدەگووترێت زاتی واقعییان ناگێڕنەوە. بە کورتی ڕۆماننوسان بەو مەبەستە نانوسن، تا چیرۆکی خۆیان وەک خۆی بنوسنەوە، واتە چیرۆکی ئەو ژیانە بگێڕنەوە کە ژیاوین... ڕۆماننوسین ژیاننامەی تایبەتی، یان گەورەکردنی برگەیەکی نێو ئەو ژیاننامە تایبەتییە نییە. ڕۆماننوسین

لە جەوهەردا هەوڵی کەسێک نییە، شەیدابێت شتێک لە ژیانی خۆی بۆ ئەوانی تر بگێڕێتەوە. من بەش بە حاڵی خۆم نوسەرێکی گەورە ناناسم، بکرێت بەو جۆرە سەیری پەیوەندی ژیان و بەرهەمی بکرێت. نوسەرانی گەورە بەدرێژایی مێژوو، باسی شتێکی دیکە دەکەن جیاواز و دوورە لە خۆیان، دەگەڕێنەوە بۆ هەندێ سەردەم کە تێیدا نەژیاون، باس لە هەندێ کاراکتەر دەکەن کە نەبوون یان نەیاندیون، باس لە هەندێ ئەزموون دەکەن کە تاقیان نەکردۆتەوە، وە زۆربەی کاتیش ئەوانە فەرامۆشدەکەن و دەیخەنە لاوە کە دەیانناسن، یان بینیویانن، یاخود تیاژیاون. بوونی هەر خاڵێکی هاوبەشیش مەرجی لێکچوون یاخود نزیکی نییە. مرۆڤە هەرە دوور و جیاوازەکانیش خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ یەکدا هەیە، لێرەوە هەر لێکچوونێکی ڕووکەش لە نێوان نوسەر و پاڵەوانەکەیدا ناکرێت، بە سەرەتای لێکچوونی تەواوەتی یان بە هاوشوناسی نێوان نوسەر و پاڵەوانەکەی تەفسیربکرێت. ئەوەی دستۆفسکی باری دەرونی جێگیر نەبووە، پاڵەوانەکانیشی باری دەرونیان جێگیر نییە، هیچ یەک لە پاڵەوانەکان ناکات بە خودی دستۆفسکی. دستۆفسکی ڕاستەقینە لەگەڵ هیچ یەک لە کاراکتەرەکانیدا جووت نییە. دستۆفسکی هەمیشە لە ڕێگای ستافرۆجین، یان راسکۆلینکۆف یان ئەمیر مشکینەوە باسی شتێکی دیکە دەکات کە کارێکی بە ژیانی دستۆفسکی خۆیەوە نییە، دەشێت نزیکی هەبێت، بەڵام هیچ یەک لە پاڵەوانەکان سەد دەر سەد خودی دستۆفسکی نین. نوسەر خەلقدەکات، نەوەک خۆی بنوسێتەوە.

پرسیارە گەورەکە ئەوە نییە، فیگەری ڕۆمان چەند لە نوسەر خۆیەوە نزیکە، بەڵکو ئەوەیە چ جۆرە پەیوەندییەک لە نێوان نوسەر و فیگەرەکانیدا هەیە؟. هەموو پاڵەوانێک، بوونەوەرێکە لەدەستکردی نوسەرێک، بۆ نمونە «ئۆلیفەر تویست» بەر لەوەی ببێتە پاڵەوانی ڕۆمانێک کەس بیری لە ئەگەری بوون و نەبوونی نەکردۆتەوە... بەڵام کە

کتێبەکان دێنە دونیا، پاڵەوانەکانیش دەچنە ناو هۆش و هەستی ئێمەوە، دەبنە بەشێکی گرنگی یادەوری دەستەجەمعیمان. ئەوە ڕۆماننوسانن کە شتێک دەهێننە دونیاوە، کە بوونی نییە، بەڵام هێزی لە هێزی شتە واقیعییەکان گەورەترە.

شتێک زۆر کات بیرم لێکردۆتەوە، کۆتایی ڕۆمانی «سوور و ڕەش» ـی ستانداله. لەوێدا شتێکم لە یادە کە تەعبیرێکی ڕوون لەم دوورییەی نوسەران لە حەقیقەتەوە دەکات، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەوەشمان پێدەڵێت ڕۆماننوسان خەریکی چ جۆرە کارێکن و لە کوێدا بارگە و بنەی خۆیان دەخەن.

لە کۆتایی ڕۆمانی «سوور و ڕەش» دا ژۆلیان سوریل مەحکومە بە مردن، ئەو مەبەستی بووە مادام ڕێنال بکوژێت. مادام کۆنە دۆستێکی خۆیەتی، کاتێک دەیەوێت ڕێگا لە زەماوەندی نێوان ئەو و ماتێلدا، کچەکەی مارکیز دی لامۆل بگرێت « کە تازە دۆستی ژۆلیانە» ئەو تەقەی لێدەکات و زامداریدەکات، بێئەوەی بیکوژێت . ژۆلیان پاشەڕۆژ و داهاتووی خۆی بەو زەماوەندەوە گرێداوە. مادام ڕێنال لە ڕێگای بەرتیل و دیاری بەخشینەوە ڕێگایەک بۆ زیندانەکەی ژۆلیان پەیدادەکات و دەچێتە لای، لەوێ هەردووکیان لە دیمەنێکی زۆر ڕۆمانتیکدا باوەش بەیەکدا دەکەن و دان بەوەدا دەنێن کە هەرگیز نەیانتوانیوە خۆیان لە عەشقی یەک پاکبکەنەوە و هەمیشە ئەڤینداری یەک بوون. هەوڵەکانی مادام بۆ ڕێگەگرتن لە مردنی ژۆلیان بێئاکام دەمێننەوە، ژۆلیان خۆی کار بۆ ژیان و ئازادی خۆی ناکات. ئەوەی لە کۆتاییدا لە یاد ناچێتەوە، رستەکانی ستانداله کاتێک پاسەوانان، ژۆلیان لە زیندانەکەی دەهێننە دەرەوە و بەرەو مەرگ دەیدەنە پێش خۆیان. ئاخۆ هیچ بوونەوەرێک هەیە بتوانێت بەو ئەندازەیە لە ئاسوودەگی بەرەو مردن بڕوات، ئاخۆ جگە لە فیگەرێکی دەستکردی ناو ڕۆمان، کەسێک هەیە ساتی پێش

مـردن خەیاڵـی لای پیاسـەیەكی كـۆن بێـت لـە دارسـتانەكانی فێرجیـدا؟.
ستاندال لەوەسفی دوا ساتی ژیانی ژولیاندا دەڵێت «هەرگیز لە ژیانیدا سەری بەو چەشنە پڕ لە شاعیرییەت نەبوو، وەك ئەو ساتەی دەبوو تێیدا بمرێت و بكەوێت».

لە ڕاستیدا ئەم دیمەنە، پەیوەندییەكی بە دڵ و دەرونی ڕاستەقینەی مرۆڤـەوە نییـە. بەڵكـو فەنتازیایەكـی ڕەهـا و بێسـنووری نوسـەرانە. ئـەم وێنەیـە كـە قارەمانێكمـان هەبێـت لەسـاتی مردنیـدا «سـەری پـڕ بێـت لـە شـاعیرییەت»، ڕۆحـی پـڕ بێـت لـە هـەوای ڕۆمانسـی، بیـری لای مـردن نەبێـت و خەیاڵـی لای جوانـی و سروشـت و ئەڤینـداری بێـت، هیـچ نییـە جگە لـە سـوود بینینـی نوسـەران لـە سـاتێكی نادیـار و تەمـاوی نـاو ژیـان تـا بەجۆرێـك دایبڕێژنـەوە و شـێوەی پێببەخشـن كـە خۆیـان دەیانەوێـت. نوسـەران بـە گشـتی و بەتایبـەت ڕۆماننوسـان، خەڵكـی فورسـەتهێنن، ئـەو ساتانە دەقۆزنـەوە كـە حەقیقـەت تێیـدا بـە ڕوونـی دیـار نییـە، لـەو دەلاقانـەدا هەمیشـە شتێك دەڵێن و شتێك دروستدەكەن، سەرسامماندەكات و بمانجوڵێنێت. وەك دەزانیـن هیـچ كـەس تـا ئێسـتا لـە مـردن نەگەڕاوەتـەوە پێمانبڵێـت لـە دوا سـاتدا سـەری كەسـانی سـەربڕاو چـی تێدا بـووە، بۆیـە بـەردەوام ڕۆماننوسـان ئـەم سـاتە تەماوییـە بەكاردەهێنـن تـا شـتێك بڵێـن لـە خزمـەت وێنـە هونـەری و خولیـا فەلسـەفی و خەیاڵـە دڕەكانـی خۆیانـدا بێـت، لـە حەقیقەتـەوە دووربێـت و لـە ئەگـەرەوە نزیـك بێـت.

گـەر وابێـت قسـەكەی مـارك تویـن كـە دەڵێـت «نوسـەران لەسـەرفكردنی حەقیقەتـدا بەخیلیدەكـەن» دروسـتە. نوسـەران لـە ڕاسـتیدا زۆر بـۆ ئـەو جێگایانـە دەڕۆن كـە یەقیـن تێیـدا ئەسـتەمە، حەقیقـەت خـۆی لـە ژێـر گوماندایـە. بەجۆرێـك گـەر لـە ئاسـت پەیوەنـدی نوسـەر و پاڵەوانەكانیـدا قسـەبكەین، دەبێـت بڵێیـن نوسـەران لـە ئاسـت گێڕانـەوەی حەقیقەتـی خۆیانـدا بەخیلـن، واتـە ئەسـتەمە لـە ڕێـگای تێكسـتەكانەوە دەروازە بـۆ

ناو ڕۆحیان بدۆزینەوە... بەڵام لە ئاست خوێندنەوە و قووڵبوونەوە لە دونیای ئەوانی دیدا بە جۆرێکی دی ڕەفتاردەکەن، بەجۆرێکی دڕ و لەمپەرشکێن بەرەو ناوەوە دەڕۆن. «چیستەرسۆن» پێیوایە ڕۆمانی باش کەمترین ڕاستی دەربارەی نوسەرەکەی و زۆرترین ڕاستی دەربارەی پاڵەوانەکەی ئاشکرادەکات. بەڵام لەگەڵ دروستی ئەم بۆچوونەشدا هەمیشە ئەو پرسیارە دەمێنێتەوە: ئەگەر ڕۆمان یان پاڵەوانی ڕۆمان حەقیقەتی نوسەرمان پێ ناڵێت، یان هەر مەبەستی نییە توخنی حەقیقەتی واقیعی بکەوێت. ئەی چی نیازێکی هەیە؟ ئاخۆ خودی پاڵەوانەکە، هیچ دەربارەی نوسەر ئاشکرا ناکات؟.

ئەوەی لە ئەزموونی بچوکی خۆم و ئەزموونی هەندێک ڕۆماننوسی ترەوە تێیدەگەم ئەوەیە: ڕاستە ڕۆماننوس شتێک لەسەر حەقیقەتی ئێستای خۆی ئاشکراناکات، ڕاستە شتێک لەسەر خودی واقیعیانەی خۆی نادرکێنێت، بەڵام شتگەلی زۆر لەسەر «حەقیقەتە ونبووەکانی» خۆی دەڵێت. حەقیقەت تەنیا ئەوە نییە کە هەیە، بەڵکو ئەوەشە کە دەشیا هەبێت و لەدەستمان داوە. وەک چۆن حەقیقەتی مێژوو تەنیا لەو ڕووداوانەدا نییە کە ڕوویانداوە، بەڵکو لە تەواوی ئەو دەرفەت و ئەگەرانەشدایە کە دەکرا ڕوویدەن و خنکێنراون و ڕوویان نەداوە... «ئەوەی کە روونادات» گرنگییەکەی کەمتر نییە لەوەی «کە رووددەدات». ئەم حەقیقەتە هەم بۆ مێژووی کۆمەڵگا و هەم بۆ مێژووی شەخسی مرۆڤەکانیش دروستە... بەڵام جیاوازی ڕۆماننوس لەگەڵ خەڵکانی تردا ئەوەیە کە بەشی زۆری کاری ڕۆماننوس دەچێتە ناو ئیشکردنەوە لەو مەودایەدا کە دەکرا ڕوویدات و ڕووی نەداوە. کەسێکی وەک مادام بۆڤاری بە ڕاستی بوونی نەبووە، بەڵام ئەگەرێکی ڕاستەقینەی ناو ژیانی کۆمەڵایەتی فەرەنسای ئەو سەردەمەیە. ئانا کارنینا بوونی نەبووە، بەڵام ئەگەرێکی ناوەکی کۆمەڵگای ڕوسییە، کە دەشێ یان دەکرا ئانا کارنینا

بوونی هەبایە. ئەدەب ئەوەمان بۆ ناگێڕێتەوە کە هەیە، بەڵکو ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دەشێت هەبێت یان دەکرا هەبایە.

لە کتێبەکەی «کڤێتۆسلاف چیڤاتیک»دا «تەڵەکانی دونیا» دەربارەی میلان کۆندێرا، بۆچوونێکی کۆندێرا و یەکێکی «مارتن ڤالزەر» وەردەگرم کە نزیکن لەم تێگەیشتنەوە. کۆندێرا لە جێگایەکی ناو ڕۆمانەکانیدا بە ڕوونی تەعبیری لەم دۆخە کردوە و دەنوسێت «کەسایەتی ناو ڕۆمانەکانم، ئەگەرەکانی خۆمن کە نەهاتوونە دی. لەبەرئەوە هەموویانم وەک یەک خۆشدەوێت، هەموویان هەمان ترسم تێدا دروستدەکەن. هەریەکەیان هێڵێکیان بەزاندوە و لە سنوورێک پەڕیونەوە کە من نەمتوانیوە بیبەزێنم و بپەڕمەوە لێی. خودی ئەو سنوورەیە کە من ڕادەکێشێت، سنوورێک دەکەوێتە ئەو دیو ئەو جێگایەی «من»ـی من تێیدا کۆتایی دێت. لەو دیو ئەو سنوورەوە نهێنییە گەورەکان دەست پێدەکەن. ئەو نهێنیانەی ڕۆمان بەدوایاندا وێڵە». هەر لەوێدا کۆندێرا دەڵێت کە ڕۆمان جۆرە دانپیانانێک نییە، واتە درکاندنی نوسەر نییە بۆ نهێنی خۆی، بە پێچەوانەوە دۆزینەوەی مانای ژیانە لە ژێر هەلومەرجی نوێدا، واتە لەو ساتانەدا کە جیهان لە ژێر پشکنیندا دەخرێتە بەر ئەگەری نوێوە. کۆندێرا دەڵێت «نوسەر لە ژیانی خۆیەوە شت دروستدەکات، بەڵام شتێکی لێ دروستدەکات، تەواو جیاوازە لە ژیانی خۆی».

واتە ئەوەی ڕۆماننوس دەبزوێنێت، خودە ئاشکرا و دیار و ئامادەکەی خۆی نییە، ئەوە نییە کە تیاژیاوە، بەڵکو هەموو ژیانەکانی ترێتی. کاتێک پاڵەوانێک دروستدەکەین خودە واقیعییەکەی خۆمانی ناخەینە ناو، بەڵکو هەموو ئەو ڕەهەندانەی دیکەی خود دەدۆزینەوە کە بزرمانکردوە، حەقیقەتی ئەوەی پێ ناگێڕینەوە کە بینیومانە، بەڵکو کۆی ئەگەرەکانی بینین و گێڕانەوەی پێ تاقیدەکەینەوە. پاڵەوانی ڕۆماننوس لە ڕۆماننوس خۆی ناچێت، بەڵکو لەو ئەگەرانە دەچێت کە ڕۆماننوس دەستی پێیاندا

نەگەیشتووە... واتە ڕۆمان ئەو ژیانەی نوسەر نییە کە تێیدا ژیاوە، بەڵکو ئەو زیندەگییە ونانەیە کە تێیاندا نەژیاوە.

ڕۆماننوسی ناسراوی ئەڵمانی «مارتن ڤالزەر» بە جۆرێکی تر، تەعبیری لە هەمان گرفت کردوە. ڤالزەر دەڵێت «من ناتوانم ئەوە بگێڕمەوە کە بەسەرم هاتووە. ئەوە دەبێتە دووبارەکردنەوەی شتێکی ناخۆش و تەحەمول نەکراو، بەڵام دەبێت وەڵامی ئەو شتانە بدەمەوە کە بەسەرمدا هاتوون. پاڵەوانی ڕۆمان دەرخستنەوەی نەگەرە شاردراوەکانە. ئەو منداڵەی بوکەشوشەیەکی بەدەستەوەیە دەتوانیت لە زاری ئەوەوە هەندێ ڕستە بڵێ کە بەبێ ئەو هەرگیز ناتوانێت بیانڵێت. بە هۆی بوکەشوشەکە و لە ڕێگای ئەوەوە زمان و بوێری و ئارەزووی هەیە، قسەکانی خۆی بکات. لە ڕێگای بوکەڵەیەک کە فیگەری ئەمیرە یان چەتەی هەیە، منداڵ ڕادیکالانە تەعبیر لە خۆی دەکات، بێبەربەست و بە شەوقەوە. فیگەرەکانی نوسەری ڕۆمانیش وەک بوکەشوشەی منداڵ وان و لە ڕێگایانەوە وەڵامی ئەزموونەکانی خۆی دەداتەوە، تا وایان لێدێت نوسەر توانای تەحەمولکردنی ئەو ئەزموونانەی دەبێت و هێزی ئەوەی دەبێت لەگەڵیاندا بژی. گەر بهاتبایە و خۆی تەنیا فیگەر بایە، کاری کەم دەوەستا و زۆر کورتی دەهێنا».

نوسەر گەر لەو جێگایەدا بوەستێت کە خۆی و ئەزموونی ژیانی تێیدا کۆتاییان دێت، واتە لە جێگایەکدا وەستاوە بەشی دروستکردنی ڕۆمانێکی باش ناکات. ئەو حەقیقەتانەی کە نوسەرێک دەیانبینێت و تیایاندا ژیاوە لەوە سنووردارترن کە گەردونێکی گەورەی وەک ڕۆمانی پێ دروستبکرێت، بۆیە لە ڕێگای کاراکتەرەکانی ترەوە ئەو ئەزموونانە دەژین کە خۆمان تیا نەژیاوین. لێرەوە «ڤالزەر» لەسەر هەقە، ڕۆمان گێڕانەوەی ژیان نییە، بەڵکو وەڵامدانەوەیە بە ژیان. گێڕانەوەی بەسەرهاتی خود نییە، بەڵکو پشکنینی ئەو دیوەیەتی کە نادیار و تەماوییە.

گەر دواجار بگەڕێمەوە بۆ لای پاڵەوانەكەی ستاندال، بۆ ئەو جێگا تەماوییەی ژیان كە هیچ كەس بەدروستی نازانێت چی تێدا دەگوزەرێت، دەكرێت بڵێم، كە تەواوی ڕۆمان لەو شوێنەدا كاردەكات كە تێیدا حەقیقەت نەبۆتە یەقین، واتە ئیشی ڕۆماننوس لەسەر حەقیقەت خۆی نییە، بەڵكو لەسەر ئەگەرەكانی حەقیقەتە... لەسەر جێگا تەماوییەكانە، لەسەر ساتە تەماوییەكانە. ئەوەی لەسەری ژولیان سورێلدا لە دوا ساتدا دەگوزەرێت، ئەگەرێكە لە ئەگەرەكان... دەكرا ستاندال هەر ئەگەرێكی تر هەڵبژێرێت، خودی ئەو كۆتاییە هیچمان لەسەر ژیانی ستاندال خۆی بۆ ئاشكراناكات، بەڵام یەكێك لە ئەگەرە فەنتازییەكانی مردنمان لە خەیاڵی ستاندالدا بۆ ئاشكرادەكات، ئەوەمان پێنالێت ستاندال چۆن مردوە، بەڵام ئەوەمان پێدەڵێت چ جۆرە مردنێك ئەفسونی لێكردوە و خەیاڵی خرۆشاندوە. لە ڕێگای ژولیان سوریلەوە هیچ لە ژیانی ستاندال خۆی نازانین ئەوەنەبێت كە ژیانێكی فەنتازیی ستانداله كە خۆی تیانەژیاوە. لەوەش بگوزەرێین هەموو ڕۆمانە گەورەكان، بە ڕووداو و كارەكتەرەكانیانەوە، لەو ڕووبەرە تەماوییەی ژیاندا ڕوودەدەن كە بەر حەقیقەت دەكەوێت و لێی دووردەكەوێتەوە... دەشێت ڕاست بێت و هەبێت، بەڵام ڕاستیش نییە و نییە. لێرەوە ڕوونتر لە مارك توینیش تێدەگەین؛ بۆیە نوسەران لە مەسرەفكردنی حەقیقەتدا بەخیلن، چونكە بۆئەوەی تێبگەن حەقیقەت چییە، دەبێت ئەو دیوەی ببینن كە هێشتا نەهاتۆتە دی.

ژولیانی ستاندال كەسێكی ڕاستەقینە نییە، بەڵام گەر ڕاستی هەموو فۆرم و شێوەكانی خۆی وەربگرتایە، گەر بیتوانیایە هەموو ئەگەرەكانی ناو خۆی بهێنێتە دی، ژولیان یەكێك بوو لە واقعە هەرە نزیك و بەهێزەكان.

# دەربارەی ئەدەبیاتی فڕین

لە یەکێک لە بەرگەکانی زنجیرە ڕۆمانی هاری پۆتەردا، هاری یەکێک لە خاتوونە لووتبەرز و بەدهەواکان «خوشکەکەی فێرنۆن» کە گاڵتە بە دایک و بابی هاری دەکات هێند فوودەدات تا وەک دەبدەبە و بالۆنۆچکەیەکی لێدێت کە بەرزدەبێتەوە و بەرزدەبێتەوە و بەرزدەبێتەوە، تا وای لێدێت لە ئاسماندا ونده‌بێت و بە چاوان نابینرێت. ئەم دیمەنە ملیۆنەها مرۆڤ لە ڕۆمانەکەی هاری پۆتەردا خوێندویانەتەوە و ملیۆنەها لە بینەرانی فلیمەکەش بینیویانە، کاتی خۆی یەکێک لە ڕەخنەگران ڕای وابوو ڕیشەی ئەم دیمەنە دەشێت بگەڕێتەوە بۆ هەندێک دیمەنی ناو تۆم و جێری، کە تێیدا زیاد لە جارێک و لە ڕێگای چەندین فێڵ و هۆکاری جیاواز جیاوازەوە هەر یەک لە تۆم و جیری وەک خانمە پفکردوەکەی جوانا ڕۆلینگ، وەک میزەڵدانی منداڵان لە جێگای خۆیان بەرزدەبنەوە. خەیاڵی فڕین و بەرزبوونەوە لە زەوی خەیاڵێکی نوێ نییە، چیرۆکی مرۆڤ و فڕین ڕۆژانە دووبارەدەبێتەوە، ئێمە لە منداڵیمانەوە ڕۆژانە لە فیلمە کارتۆنەکاندا، لە حیکایەتەکاندا، لە سریالەکانی خەیاڵی زانستیدا چیرۆکی فڕین دەبینین و دەخوێنینەوە. لە فلیم و چیرۆکی منداڵاندا، لە فلیمەکانی ئەکشن و جوڵەدا، لە یارییە ئەلەکترۆنییەکاندا، فەنتازیای فڕین دوا سنووری خۆی بڕیوە و وەک ئەوە وایە ئێمە لەسەردەمی پاڵەوانە فڕیوەکاندا بژین، فڕین یان نیمچە فڕین لەسەدەی بیستدا

بەشێکە هەم لە ئەدەبیاتی و لە کاراکتەری پاڵەوانەکانی ناو ماشینەکانی ماسمیدیا و هەم بەشێکیشە لە ئەدەبیاتی زۆر جیدی، هەم میکی ماوس دەفڕێت و هەم ئەمیرە چکۆلە و قەشەنگەکەی سانت ئەگزۆبێری. بەجۆرێک کاتێک خانمی جوانا ڕۆلینگ ئەم دیمەنە دروستدەکات، بەر لەو فڕین مێژوویەکی زۆر دوورودرێژی لە ئەدەب و فەنتازیادا بڕیوە، فڕین سیفەتێکی ئاسایی و دیمەنێکی بینراو و ڕۆژانەی ناو ئەدەب و سینەما و گەمەکردنە، بەشێکی دانەبڕاوی هەموو فەنتازیایەکە بیەوێت پاڵەوانەکانی شتێک لە واقیع دووربخاتەوە، ئیدی هیچ کەس ئەو پرسیارە گەمژانەیەی بەبیردا نایەت بپرسێت: خانمی ڕۆلینگ ئەم فڕینەی لە کێ وەرگرتووە. دیارە ئەوە تاقانە فڕینی ناو هاری پۆتەر نییە، ڕۆمانەکان و فلیمەکانی هاری پڕن لە فڕین کە خەیاڵی سەدەکانی ناوەند دەربارەی سیحر و گسکی فڕۆک دووبارە دەکەنەوە، پۆتەر وەک ئەو سیحربازانەی لە سەدەکانی ناوەندا لەسەر گسکەکانیان دەفڕین، دەفڕێت. ئەرشیفی وێنە و هێڵکاری لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە، ژمارەیەک زۆر نیگاری سیحربازانی فڕیویان بۆ هەڵگرتووین، بەجۆرێک دەکرێت بڵێین بە هەر لایەکدا بڕۆین بەر مەخلوقاتی فڕیو دەکەوین، لە میتۆلۆگیای دێریندا بەر کەسانی باڵداری وەک کیوبید و ئیرۆس و دیدالۆس دەکەوین، ئەستەمە هیچ کەس یەکجار تابلۆکەی چارلز پاول لەندۆن «دیدالۆس و ئیکارۆس ـ ١٧٩٩» ببینێت و دواتر یادی بچێتەوە کە تێیدا دیدالۆس بە دوو باڵی گەورەوە ئیکارۆس فێری فڕین دەکات و بەرەو ئاسمان بەریدەدات، ئەستەمە مرۆڤ تابلۆ بەناوبانگەکەی «ئیرۆس و پسیشی ـ ١٧٩٠» ـی فرانسۆ گیرارد ببینێت و یادی بچێتەوە کە تێیدا ئیرۆس بە میهرەوە بە خۆی و باڵە زلەکانییەوە باوەشی بە پسیشیدا کردوە... پاڵەوانە خەیاڵییەکانی ناو ئەفسانە و ئەدەبیات لەسەرەتای سەرەتاکانەوە دەفڕن. بەڵام نەوەک پاڵەوانی ئەفسانەکان بە تەنیا، بەڵکو پێغەمبەرانیش دەفڕن.

مـرۆڤ بـەوەوە نەوەسـتاوە توانـای فڕیـن ببەخشـێتە خـۆی، بەڵکـو شـتەکانی دیش لـە زەوی بەرزدەکاتـەوە و لێناگەڕێـت ئاسوودە بەزەوییـەوە بنووسێن. لـە سـاڵی ١٩٢٨ دا والـت دیزنـی بـۆ یەکەمجار فیگوری کارتۆنـی میکـی ماوسـی لـە فلیمـی «سـتیمبۆت ویلـی» دا پێشکەشـکرد، ئـەو دەم و تـا سـاڵی ١٩٤٩ دەنگـی میکـی مـاوس هـەر دەنگـی والـت دیزنـی خـۆی بـوو. ئـەو مشـکە فڕیـوەی کـە بەرگری لـە لاوازەکان دەکـرد، تەنیـا خەیاڵـی منداڵانـی نەخرۆشـان، بەڵکـو خەیاڵـی گەورەکانیشـی هێنایـە جـۆش. بـە چەشـنێک میکـی مـاوس وەک فیگورێکـی کارتۆنـی و سـینەمایی نەمایـەوە و بـوو بـە پاڵەوانـی هـەزاران چیـرۆک کـە سـەرچاوەکەی تەنیـا کۆمپانیـای والـت دیزنـی نییـە، بەڵکـو لـە هەمـوو شـوێنێکی دونیـاوە بەرهەمدەهێنرێـن... بـە کورتـی میکـی مـاوس بـە هـۆی هێـز و توانـای فڕینییـەوە، بـووە موڵکییەتـی گشـتی، کاراکتەرێکـی جیهانـی و پاڵەوانێکـی سـەرەتایی و سـەردەق شـکێن بـۆ «گلۆبالیزەیشـنی کولتـووری»، فیگورێـک کـە ڕۆژانـە لـە هەمـوو لایەکـی دونیـاوە حیکایەتـی لەسـەر دروسـتدەکرێت، ئەمـڕۆ ئـەو چیرۆکانـەی لەسـەر میکـی مـاوس دروسـتدەکرێن تەنیـا مۆرکـی ئەمریکیـان نییـە، بەڵکـو مۆرکێکـی ئینتەرناسـیونالیان هەیـە. دوای میکـی مـاوس بەماوەیەکـی کـەم وێنـە ئینسـانییەکەی ئـەم فیگـورەش کەوتـە بـازاڕەوە، لـە سـاڵی ١٩٣٢ دا بـۆ یەکەمجـار لـە گۆڤارێکـی کۆمیکـدا کەسـایەتییەکی نـوێ و گرنـگ و فەنتـازی هاتـە نـاو بـازاڕی سینەما و فەنتازیـاوە بـە نـاوی «سوپەرمان»ـەوە. فیگەرەکـە لەلایـەن جێـری سـیگل و جـۆی شوسـتەرەوە دروسـتکرا، کـە هەردووکیـان پێکـەوە گۆڤارێکـی کۆمیکـی تایبـەت بەخەیاڵـی زانسـتیان لـە کلیفلانـد بڵاودەکـردەوە. سـەرەتا سـوپەرمان کاراکتەرێکـی کەچەڵـی شـەڕانی بـوو، کـە دەیویسـت لـە ڕێـگای هێزێکـی بێئەنـدازە و توانایەکـی بێسنوورەوە لەسـەر کارتێکردنـی تێلێپاتـی ببێـت بـە حوکمڕانـی جیهـان، بـەڵام دواتـر هێـدی هێـدی کاراکتەرەکـە گـۆڕا بـۆ کەسـێکی جـوان

و بەهێز کە لە پێناوی عەدالەتدا دەجەنگێت و بۆ هەق خەباتدەکات.
کاراکتەری سوپەرمان بەجۆرێک لە جۆرەکان وەک کۆپییە ئینسانییەکەی میکی ماوس دەردەکەوێت، هەردووکیان دەفڕن، هەردووکیان لە کاتی ئاساییدا هێز و توانای خۆیان دەرناخەن، لە هەردووکیاندا هەمیشە کچێک یان مێینەیەک هەیە کە دەبێت ڕزگاریبکەن، لە هەردووکیشیاندا بەرەی خێر و بەرەی شەڕ بە ڕوونی و بە هێڵێکی سەرەکی جیاکراونەتەوە. دەیان ساڵە ئەم دوو فیگورە پێکەوە خەیاڵی گەورەکان و منداڵان دەخرۆشێنن. دەچنە ئاسمان و دادەبەزنەوە... هۆی ئەو سەرسامییە زۆرە بەم دوو کاراکتەرە لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ ئەو هێزەی شتێک لە نیگاری خوداوەندە یۆنانییە کۆنەکانمان پێدەبەخشنەوە. لە بونیادی درامی زۆربەی چیرۆکەکانی میکی ماوس و سوپەرماندا ئەو ڕەگەزە دێرینە هەیە کە لە درامای یۆنانیدا بە «دیۆس ئێکس ماشینە» ناودەبرێت. لە زۆربەی چیرۆکەکاندا کەسێکی لاواز دەکەوێتە دەست هێزێکی شەڕانی زۆر لە خۆی گەورەتر، بەجۆرێک مەگەر موعجیزەیەک ڕزگاریبکات. لە میکی ماوسدا و لە هەندێک چیرۆکی سوپەرمانیشدا دیمەنی دووبارە و ستاندارد ڕوداوی سەر ئەو هێڵی شەمەندەفەرەیە کە کچەکەی لەسەر بەستراوەتەوە و شەمەندەفەرێک بە خێراییەکی گەورە بەرەو ڕووی دێت، بەجۆرێک گەر پاڵەوانەکە نەفڕێت ناتوانێت بگاتە جێگای ڕووداوەکە و پێش بە کارەساتەکە بگرێت. ئەم دیمەنە دواتر گوازراوەتەوە بۆ سەدان فلیم و چیرۆکی دیکەش. دیۆس ئێکس ماشینە واتە «یەزدانێک لە ماشینێکەوە دێتە دەرێ»، لە درامای گریکیشدا ڕووداوەکان هەمیشە دەگەنە بەردەم ڕێگایەکی داخراو، کە چیدی گرێکان بە هێزی ئاسایی مرۆڤە ئاساییەکان ناکرێنەوە و گرفتەکانی بەوان چارەنابن. لێرەدا دەبێت هێزی خوداوەندان خۆیان دابەزنە سەر سەحنە و گرفتەکە چارەسەربکەن. «دیۆس ئێکس ماشینە» هێمایە بۆ دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی هێزی خودایی لەسەر

ڕەوتـــی درامـــی ڕووداوەکان. فڕیـــن لـــە زۆر چیـــرۆک و فلیمـــدا ئـــەو هێـــزە دەبەخشـێتە مرۆڤـەکان بتوانـن ڕەگـەزی «دیـۆس ئێکـس ماشـینە» بهێننـە نـاو ئەدەبیـات و سـینەمای نوێـوە. فڕیـن ئـەو ڕەگـەزی موعجیزەیەیـە کـە دەرهێنانـی لـە زۆر تێکسـت و ڕۆمـان و فلیـم کارێـک دەکات، تـەواوی بونیـادی درامـی و سـتراکتوری فەنتازییـان هەرەسـبهێنێت. بـەڵام جگـە لـە فەنتازیـا، فڕیـن چەکێکـی دینیشـە، ڕێگایەکـە بـە هۆیـەوە سـەمبولە دینییـەکان دەگەڕێنـەوە نـاو خەیاڵاتەکانمـان.

یەکێـک لـەو دیمەنانـەی زۆر بـە ڕوونـی وەزیفـەی ڕزگارکەرانـەی فڕیـن پیشـاندەداتەوە، لـە فلیمـی «ئی.تـی» دا بینیمـان، فلیمەکـە یەکێـک بـوو لـە پـڕ بینەرتریـن فیلمەکانـی سـەرەتای هەشـتاکان، تاسـاڵی ٢٠٠٧ یـش پلـەی بیسـتوچوارهەمینی لـە لیسـتی سـەد باشـترین فلیمـی مێـژووی سینەمادا داگیرکردبـوو. ئـەوکات دەرهێنـەری کارەکـە «سـتیفن سـپیلبورگ» لەسـەرەتای ئـەو ڕەوتـە گەورەیـەدا بـوو کـە دواتـر زنجیرەیـەک فلیمـی نایاب و بێوێنـەی لێکەوتـەوە. ئی.تـی مەخلوقێکـی فـەزای دەرەوەیـە کـە لـە سـەر زەوی جێدەمێنێـت و دەبێتـە هاوڕێـی منداڵێـک کـە لـە جێگایەکـی نزیـک لـە دارسـتانەکانی کالیفۆرنیـاوە لەگـەڵ خێزانەکەیـدا دەژی. ئـی .تـی لـە کۆتایـی فلیمەکـەدا ژیانـی دەکەوێتـە مەترسییەوە و بـە کۆمەکـی کۆمەڵێـک منـداڵ دەبێـت ڕزگاربکرێـت و ببرێتـەوە بـۆ کەشـتییە ئاسـمانییەکەی خـۆی. کاتێـک منـداڵان ئـی . تـی لـە دەسـت پۆلیـس و فەرمانبەرانـی تەندروسـتی دەفڕێنـن، لـە دیمەنێکـی تەقلیـدی ڕاونـان و بەدواداکەوتنـدا کـە لـە بەشـی هـەرە زۆری فلیمـە ئەمریکییەکانـدا دووبارەدەبێتـەوە، لـە نـاکاو منـداڵان بـە خۆیـان و پاسـکیلەکانیانەوە لـە زەوی بەرزدەبنـەوە و بـەرەو ئاسـمان دەفـڕن. دیمەنـی منداڵـە فڕیـوەکان لەسـەر پاسـکیلەکانیان و مانـگ لـە پشـتیانەوە، تـا ئەمـڕۆ بـە یەکێـک لـە دیمەنـە هـەرە ئەفسـوناوی و زیندووەکانی سـینەمای هەشـتاکان حیسـابدەکرێت، ئـەو فڕینـە لـە نـاکاو و سـیحرییەی منداڵـەکان

ئـی . تـی لـە گرتـن و مـردن ڕزگاردەکات. فڕینێـک پێشـتر لـە ڕەوتـی سـیناریۆکەدا پێکولـکاری بـۆ نەکـراوە، بـەڵام ڕودانـی لـە نـاکاوی لەگـەڵ خـەون و چاوەڕوانـی و خەیاڵـی ئێمـەدا بـۆ ڕزگارکردنـی ئـەو مەخلوقـە ناسکە دەگونجێت، کە هەمـوو حـەز بـە ڕزگاربوونی دەکەیـن. ئـەم دیمەنـە نمونـەی ئـەو حاڵەتەیـە کـە تێیـدا فڕیـن وەک هێزێکـی فریـادرەس، وەک چارەیەکـی سـیحراوی و چەکێکـی فەنتـازی بـۆ ڕزگارکردنـی پاڵەوانـەکان ئیشـدەکات... واتـە کاتێـک پاڵەوانـەکان دەکەونـە دۆخێکـەوە وادەردەکەوێـت کـە هیـچ چـارە و دەربازێکیـان نەبێـت، فڕیـن دێـت و کاراکتـەرەکان لـە گەمـارۆکان دەردەهێنێـت و ڕێـگای ڕزگاریـان بـۆ دەکاتـەوە. لـە بـەر ئـەم خاڵەشـە دەمەوێـت فڕیـن لـە فەنتازیـای هاوچەرخـدا بـە فاکتـەری دیـۆس ئێکس ماشـینە لـە درامـای گریکیـدا بشـوبهێنم. دیـارە ئـەم دیمەنـە زۆر قەشـەنگەی نـاو ئـی . تـی لـە کەلەپـووری پێشـتردا پاشـخانێکی بەرچـاوی هەیـە. هـەر بینەرێکـی زیـرەک کـە کەمێـک یـادەوەری ئەدەبـی و سـینەمایی بەهێزبێـت، دەزانێـت کـە دیمەنـی منـداڵان بـە پاسـکیلەکانیانەوە و لـە ژێـر تیشـکی مانگەشـەوەکەدا ڕاسـتەخۆ گواسـتنەوەی دیمەنـی بابانۆئێلـە بـە خۆی و عەرەبانـە و ئاسـکە فڕیوەکانییـەوە لـە بـەر تریفـەی مانگـی چواردەدا، کـە لـە سـەدان چیـرۆک و کتێبـی وێنـەداری منداڵانـدا هاتـووە. سـبیلبورگ لـە فلیمەکەیـدا هەمـان فڕینـی تەقلیـدی بابانۆئێـل و ئاسـکەکانی دەگوازێتـەوە و بەهۆیـەوە سـێ ئۆسـکار بەدەسـتدەهێنێت. سـبیلبورگ بـە داڕشـتنی ئـەو دیمەنـی فڕینـە، شـتێک لـە مانـای دینـی دەهێنێتـەوە نـاو فیلمەکـەی. فڕیـن لێـرەدا جۆرێـک لـە سـەمبولی فریاکەوتنـی ئیلاهـی.

حەتمـەن ئەوانـەی کـە سـەروکاریان لەگـەڵ سینەمادا هەیـە، فلیمەکـەی ڕۆبـن ویلیامـز «فلوبـەر ١٩٩٧» یـان بـە خـۆی و ماشـێنە فڕیوەکەیـەوە دێتـەوە یـاد، کـە لـە ڕاسـتیدا کۆپییەکـی فلیمـی «مامۆسـتا فڕیوەکـە» ـی ساڵی ١٩٦١ ـە، کە لە دەرهێنانی دەرهێنەری ناسراوی شەستەکان ڕۆبەرت

ستیفنسن بوو. ماشێنە فڕیوەکەی ویلیامز، وەک پاسکیلە فڕیوەکانی سبیلبورگ، وەک عەرەبانە فڕیوەکەی بابانۆئێل، فۆرمی دووبارەی یەک خەون و فەنتازیایە کە لە جێگای جۆراوجۆر و لە سیاقی جیاوازدا دەردەکەوێتەوە.

لێرەدا پرسیارێک بێتە پێشێ ئەوەیە: ئایا ناشێت هەموو ئەم شتە فڕیوانە لە چیرۆکێکی کۆنترەوە وەرگیرابن؟.

گەر بۆ دوورتر بگەڕێینەوە بەر چیرۆکێکی زۆر جوانی هانز کریستیان ئەندرسن دەکەوین بە ناوی «جانتا فڕیوەکە» کە باس لە کوڕی بازرگانێکی دەوڵەمەند دەکات کە تەواوی سامانی بۆماوەی باوکی تەخشان و پەخشان دەکات و هیچی نامێنێت، ڕۆژێک هاوڕێیەکی جانتایەکی پێشکەشدەکات کە لەسەری نوسراوە «پڕمکە». بەڵام لەبەرئەوەی کوڕە بازرگان هیچی نەماوە و شتێکی نییە بیخاتە جانتاکەوە، خۆی دەچێتە ناوی و هەر دەستی پیادەنێت جانتاکە دەفڕێت و کوڕە لەگەڵ خۆیدا بەرەو خاکی تورکان هەڵدەگرێت و لەوێ دەبێتە دۆستی کچی سوڵتان... جانتا فڕیوەکەی ئەندرسن، ئەوەمان پێدەڵێت کە بابەتی فڕین، هیچ کات و لە هیچ سەردەمێکدا لە خەیاڵی مرۆڤ جیانەبۆتەوە، هەر کات مرۆڤ ویستبێتی سەفەرێکی فەنتازی بکات، فڕین بەشێک بووە لە کەرەستەکانی.

فڕین لە شاکارە ئەدەبییە گەورەکانیشدا قورسایی و گرنگی خۆی هەیە. ئەوەی سەد ساڵ تەنهایی مارکیزی خوێندبێتەوە، ئەستەمە ئەو دیمەنەی بیربچێتەوە کە ریمیدیۆسی قەشەنگ لە ناکاو بە خۆی و چەرچەفەکانییەوە بەرزدەبێتەوە بۆ باڵا و لە ئاسماندا لەچاوان وندەبێت، بەجۆرێکی وەهاش وندەبێت، وەک مارکیز دەڵێت «یادەوەریش نایگاتێت». ریمیدیۆس کە جوانییە بێئەندازەکەی هەمیشە هاودەمی مردنە، تووشی تەنهایی دەبێت و گۆشەگیر دەکەوێت، خەونەکانی پڕدەبن لە مۆتەکە

و بەردەوام لە حەمامدا خەریکی خۆشتن دەبێت، تا ڕۆژێک فیرناندا هەموو ژنانی ناو ماڵی ئورسولا «داپیرە بەهێز و غەمگینەکەی ناو سەد ساڵ تەنهایی» بۆ قەدکردنی چەرچەف کۆدەکاتەوە، لەویادا ڕیمیدیۆسی قەشەنگ لەگەڵ چەرچەفە سپییەکاندا لە جێگای خۆی وەک فریشتەیەک بەرزدەبێتەوە و دەچێتە ئاسمان و ئیدی ناگەڕێتەوە.

مارکیزیش لەم دیمەنەدا شتێکی نەهێناوە پێشتر پاشخانی نەبێت، حیکایەتی هەڵکشانی ریمیدیۆس بۆ ئاسمان، هەوڵێکە بۆ نیشاندانی کیژەکە وەک پاکەژنێک «قدیسەیەک» کە خودا بردویتییەوە بۆ لای خۆی. لە کاتێکدا دەشێت ڕیمیدیۆس لەگەڵ پیاوێکدا هەڵهاتبێت و چیرۆکی فڕینەکەی تەنیا پەردەپۆشییەک بێت بۆ ئابڕوچوونێکی گەورە. ئەم «هەڵکشان بۆ ئاسمان» ـە، لە هەموو دینەکاندا پاشخانی خۆی هەیە، هەتا لە کولتووری کوردەواریشدا قسەیەکی زۆر لە هەڵکشان و فڕینی پیاوچاکان بۆ ئاسمان کراوە، لێرەدا مارکیز فڕین بەو دەلالەتە دینیانە بەکاردەهێنێت... دینێک خەیاڵی میللی دەستکاریدەکات، تا لەگەڵ فەنتازیاکانی خۆیدا بگونجێت.

بەر لە کۆتایی حەزدەکەم ئاماژە بە کارەکانی کەسێک بدەم کە بە عەشقێکی زۆرەوە بەشی هەرە زۆری ئیشەکانیم بینیوە. ئەویش ئەنیمیسازی یابانی «هایایۆ میازاکی»یە. لە ساڵی ٢٠٠٢ دا کە فلیمی «گەشتەکەی چیهیرۆ بە زەمینی تەلیسمدا» خەڵاتی ورچی زێڕینی بێرلینالەی برد، زۆری نەبرد کە هەمان فلیم لە ٢٠٠٣ شدا ئۆسکاری باشترین فلیمی کارتۆنی بردەوە. چیهیرۆ شاکارێکی سینەمایی گەورەیە کە لە «حەمامێکی خوداوەندان» دا ڕوودەدات، کە سیحربازێکی خراپەکار بە ناوی «یوبابا» وە دەیبات بەڕێوە کە توانای دزینی ناوی خەڵکی هەیە، سیحربازێکی فڕۆک کە بەسەر شانشینەکەی خۆیدا دەفڕێت و چاوەدێری هەموو شتێک دەکات. لێرەدا ئەستەمە بتوانم باسی فلیمەکە

بکەم، چونکە پڕە لە نهێنی و لێوان لێوە لە کاراکتەر و هیچ گێڕانەوەیەک ناتوانێت جێگای بینینی شاکارەکە بگرێتەوە، بەڵام دەمەوێت بڵێم لەم کارە و لە کۆی بەرهەمەکانی میازاکیدا فڕین و ئاسمان شوێنێکی سەنتراڵ و بنەڕەتیان هەیە. لە هەموو کارەکانیدا بەتایبەت «کۆشکێک لە ئاسمان ١٩٨٦» «مۆنۆکۆی ئەمیرە١٩٩٧» «کۆشکی گەڕۆک٢٠٠٤ » ئاسمان سەحنەی سەرەکی و فڕین کاراکتەری زۆر لە پاڵەوانەکانە... هیچ کارێکی میازاکی نییە مرۆڤە فڕیوەکانی نەبنە ڕێوانی جیهانێکی فەنتازی کە سەحنە ڕاستەقینەکەی لە ئاسماندایە. لای میازاکی پرسیار لە گرنگی و سەنترالیزەبوونی فڕین، پرسیارێکی بێبنەمایە، فڕین بەشێکی گرنگی بوونی ئینسانیمانە. لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت «بیرکردنەوە لە ئەسڵی فڕین وەک بیرکردنەوە لە ئەسڵی ڕۆیشتن یان مەلەکردن یان ماچ یان خەون بێمانایە».

ئەدەبیاتی فڕین دەریایەکی گەورەیە، گەر تەنیا ناونیشانی هەندێک ڕۆمان و شاکاری ئەدەبی وەربگرم، دەتوانم بە کورتی ڕۆڵی بنەڕەتی و ستراکتوری فڕین لە ئەدەبیاتی هاوچەرخدا پتر بەرجەستەبکەم. لە «هۆلەندییە فڕیوەکە»ـی فاگنەرەوە بیگرە تا «پۆلە فڕیوەکە»ـی ئێرش کێستنەر، تا «شاخە فڕیوەکە»ـی کریسۆف رازماری، تا «پشیلە فڕیوەکە»ـی «سیبەستیان هێرمان» و دەیان ڕۆمان و چیرۆکی تر. هەموو ئەو دەریا بەرینە دەردەخەن کە خەیاڵی فڕین لە ئەدەبیات و سینەمادا دروستیکردوە.

دواجار دەبێت بڵێم، کە ئەم نوسینەم بۆ ئەو خوێنەرانە بوو کە هەندێک ڕەهەندی ناو کولتووری کوردی خەیاڵ و عەقڵی پوکاندوونەتەوە و یادەوەرییان بەشی ئەوە دیمەن و تێکستی هەڵنەگرتووە، بتوانن بزانن فڕین بێشومارە، لە تێکست و دوو تێکستدا نییە، لە جێگایەک یان دوواندا دەرنەکەوتووە، تێمەی بەرهەم و دوو بەرهەم نییە، بەڵکو لەگەڵ

لەدایکبوونی ئەدەب و سینەما و وێنەکێشانەوە هاودەمی مرۆڤە و تا کۆتاییش هەر هاودەممان دەبێت، فرین لە ملیۆنەها کار و تێکستدا دەرکەوتووە و دووبارەبۆتەوە و دووبارەشدەبێتەوە، هەر فرینەش دەچێتە ژێر شێوە و تەرزێکی تایبەتییەوە، لێرەوە مانای فرین لە ئەدەبدا لە خودی فرینەوە نایەت، بەڵکو لەوەوە دێت، چ چیرۆکێکی لەسەر دروستدەکرێت، لە ناو چ بونیادێکی حیکایەتدا دێتەگۆڕێ، چ مانایەکی تازە دەخولقێنێت، چ مێژوویەک حیکایەت دەکات، چ کاراکتەرێک لە پشتییەوە وەستاوە، چ جیهانێک لەو دیوییەوە دەبینرێت.

# میدیا... وەك شوێنی دڕندەكان

ئیشكردن لە بواری ڕاگەیاندن و میدیاكاندا، چ چ میدیای نوسراو بێت یان بینراو، یەكێكە لە ترسناكترین ئیشەكانی دونیا... ئەوەی خەڵك لە وڵاتی ئێمە و لە دونیاشدا بەگشتی زۆر ئاسان دەبن بە كارمەندی میدیا هەمیشە مایەی سەرسوڕمانە. ئەوانەی ستایشی میدیاكان دەكەن و بەرگری لێدەكەن، لەبەرئەو ڕۆڵە گەورەیەیانە كە لە دەرخستنی ڕاستی و بەرگریكردن لە مافی قسەكردن و ڕا دەربریندا دەیگێڕن، منیش لەوانەم و لەوانەش دەمێنمەوە. بەڵام ئەم ڕۆڵە گرنگەی میدیا، نابێت لە ڕوكارە ترسناكەكانی غافڵمانبكات، كە ئەگەر گوێی پێنەدرێت و فەرامۆشبكرێت... دەزگاكانی ڕاگەیاندن لە مینبەری ڕاستی و ئازادییەوە دەبنە مینبەری شێواندن، شوێنی بە هەڵەدابردنی ڕای گشتی، درۆكردن، زامداركردنی ناهەقی ئینسانەكان و شاردنەوەی ڕاستییەكان. بەجۆرێك وای لێ دێت، كاری میدیایی ببێتە هەرێمی تێكشكاندنی مرۆڤ و بەهاكان، نەوەك شوێنی بەرگری لە ماف و ئازادی مرۆڤەكان. من لە ژیانی خۆمدا زۆر لەو هاوڕێ ڕۆژنامەنوسانەم بینیوە كە زۆر بە پیشەكەی خۆیان دلخۆش بوون، هەموویان ڕووە پۆزەتیڤەكەی ئیشی خۆیان زۆر بەرز نرخاندوە، بەڵام كەم و زۆر ئاگاداری ئەوە نەبوون كە میدیا چ جێگایەكی ترسناكە و ڕۆژنامەنوس گەر ئاگادارنەبێت دەشێت چ جانەوەرێكی ترسناكی لێدەربچێت. هەڵبەت ترسی من لە میدیا زۆر لە ترسی بەرپرسە كوردەكانەوە دوورە، كە لە

ڕاستیدا خۆیان بەڕێوەبەری بەشێکی ئەو میدیا کوشندانەن کە وێنەیەکی نادروستمان دەربارەی دونیا بۆ دەگوازنەوە، نوسینەکەم بانگەوازێکە بۆ هەموو ڕۆژنامەنوسێکی گەنج و هەموو کەسێک کە لە میدیای ئازاددا ئیشدەکات، بزانێت کە هەڵەکردن لە میدیادا کاراکتەری ڕۆژنامەنوس نزیکدەکاتەوە لە کاراکتەری جەلاد. بەبۆچوونی من هیچ ئیشێک وەک کارکردن لە میدیادا پێویستی بە گەشەی فیکری و ڕۆشنبیری و ئەخلاقی نییە... گەر هەر سێ ئەم تەوەرە بە راستی لە ناخی ڕۆژنامەنوسدا پێکەوە گەشەنەکەن و هاوشانی یەک نەڕۆن، لە دواجاردا کارەساتی ترسناک بۆ کۆمەڵگا و میدیاش دروستدەکەن. لەم هەوڵەدا سەرەتا تیشکێک دەهاومە سەر ئەو راستییەی کە میدیا دەشێت چەند ترسناک بێت. بۆ ئەو نیازە، لە مێژووی ئەدەبیات و هونەری هاوچەرخدا هەندێک نمونە دەهێنمەوە... دیارە تێکست و دۆکۆمێنت زۆر زۆرن، بەلام من سێ نمونە وەردەگرم و لە ڕوانگەی ئەوانەوە سەیرێکی ئەو دیوە دڵڕەق و نامرۆڤانەی میدیا دەکەم و هەوڵدەدەم ئەوە نیشانبدەم کە میدیا دەشێت چ کەرەسەیەکی وێرانکاری بێت. سەرەتا لە ڕۆمانەکەی هاینریش بۆل «ئابڕوی لەدەستچووی کاترینا بلۆم» ـەوە دەستپێدەکەم و دواتر باس لە وێنەی میدیا دەکەم لە یەکێک لە شانۆگەرییە قەشەنگەکانی سارتەر دا «نیکراسۆف» و دواجاریش لەسەر فلیمی «ترۆمان شۆ»ـی دەرهێنەر «پێتەر وایەر» دەوستم، کە یەکێکە لە جوانترین ئەو کارە سینەماییانەی لە هیجای میدیادا دروستکرابێت.

ئەگەرچی من وەک نوسەر هەرگیز سەرسامییەکی زۆرم بە کارەکانی هاینریش بۆل نەبووە، بەلام ڕۆمانی «ئابڕوی لەدەستچووی کاترینا بلوم» بە کارێکی تایبەت و گرنگ دەزانم. وەرگێرانە فارسییەکەی ئەم ڕۆمانەم لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا خوێندۆتەوە و چەند ساڵێکی کەمیش لەمەوبەر جارێکی دی بە زمانی ئەلمانی ڕۆمانەکەم دووبارە خوێندەوە.

کارەکەی بۆل «کە کراوە بە فلیم و بە زنجیرە و بە ئۆپراش» هیجایەکی گەورەی ئەو مۆراڵە ڕۆژنامەوانییە نزمەیە کە ڕۆژنامەیەکی وەک بیلد لە ئەڵمانیا نوێنەرایەتیدەکات... هەتا خودی چیرۆکەکەش لە یەکێک لەو بەسەرهاتانەوە وەرگیراوە کە ئەم ڕۆژنامەیە هۆکاری بووە. لە ڕۆمانەکەدا «فێرنەر توێتگس» نوێنەری ئەو ڕۆژنامەنوسانەیە کە ئامادەن بۆ ئەوەی چیرۆکێکی سەرنجڕاکێش پێشکەشبکەن و گوناهبارێک بە خەڵک بناسێنن، هەموو بەهایەکی ئینسانی پێشێلبکەن، هەموو شتێک بشێوێنن و بایەخ بە هیچ هەستێکی ئینسانی نەدەن. کاترینا ئافرەتێکی سادەی ئاساییە، لە جەژنێکی تایبەتدا کەسێک بە ناوی «گوێتن» ەوە دەناسێت و لەگەڵ ئەودا شەوێک لە ماڵی خۆیدا بەسەردەبات، بێئەوەی شتێک دەربارەی ڕابوردووی ئەو پیاوە بزانێت. گوێتن کە پیاوێکی نمونەیی نییە، دەستی لە هەندێک وردە دزی و کاری خراپەی بچوکدا هەیە، بەڵام ئەو بەیانییەی لە ماڵی کاتریناد‌ا پۆلیس دێنە سۆراغی، گوێتن بە ناهەق هەم بە کوشتن و هەم بە برینی بانق تۆمەتبارکراوە... دوو تاوان کە گوێتن هیچیانی نەکردوە. پۆلیس کاترینا بە شێوەیەکی کاتی، بە تۆمەتی کۆمەککردن بە تاوانبارێک دەستگیردەکات. لەو ساتەوە ڕۆڵی ترسناکی ئەو جۆرە ڕۆژنامەنوسانە دەست پێدەکات کە وەک نەفرەتێکی ڕەش دوای کاترینا دەکەون و جار دوای جار بە درۆ و شێواندن و تێکدانی هەرچی زۆرتری ڕاستییەکان، ئابڕوی کاترینا دەبەن. ئەو ڕاپۆرت و هەواڵانەی ڕۆژنامەکە دەیگوازێتەوە، کاترینا لەبەرچاوی کۆمەڵگا دەکات بە گوناهبارێکی قێزەون کە هەم دەستی لەگەڵ پیاوکوژێکدا هەبووە، هەم مرۆڤێکی دڵڕەق و بێڕەحمە، هەم پیاوانی تریش سەردانی ماڵەکەیان کردوە. ڕۆژنامەکە لە ڕێگای یاریکردن بە ڕستە و گۆڕینی قسەی کەسانی دەوروبەری کاترینا و داڕشتنەوەیان بە جۆرێک گومان گەورەبکات، خانمی بلوم لە کونجێکی تەسک دەخزێنێت و کارێک دەکات لە هەموو لایەکەوە کینە و بوغزی

بەسەردا ببارێت، تا دواجار خۆی زۆر تەنها و بێدۆست دەبینێتەوە... ئالێرەدا بە روونی دەبینین کە هەندێجار ئەخلاقی رۆژنامەنوس دەشێت لە ئەخلاقی جەلاد ترسناکتر بێت... زۆرجار ئەو بێگوناهەی جەلادەکان ناتوانن پەتی بکەنە گەردن، ڕۆژنامەنوسەکان دەتوانن. ئەمە مۆراڵی کوشندەی ناو میدیایە کە بێئەوەی وێنەی راستەقینەی شتەکان ببینێت، لە ڕێگای دارشتن و ڕستەسازییەکی ژەهراوییەوە چارەنوسی مرۆڤێک و ئابرووی دەکاتە ئامانج... ئەو ئەخلاقە لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا پاڵ بە کاترینـاوە دەنێت، توێتگسی ڕۆژنامەنوس بکوژێت و ببێتە گوناهبارێکی ڕاستەقینە.

بەداخەوە جیهان پڕە لە ڕۆژنامەنوسی وەک توێتگس، ڕۆژنامەگەری ئێمەش بە هەموو بەشەکانییەوە خاڵی نییە لە سێبەری کەسانی وەک توێتگس، لێرەدا دەبێت بڵێین وەکو چۆن نابێت هەرگیز رۆژنامەنوس بکوژرێت، نابێت ڕۆژنامەنوسیش کەس بکوژێت. ئەرکی ئەخلاقی ڕۆژنامەنوس ئەرکێکی سەختە، ئەوەی بیەوێت گەمەی نوسین و ڕۆژنامەکاری ئاسان بگرێت دوور نییە کاراکتەری دواجار لە کاراکتەری پیاوکوژ نزیک ببێتەوە. هاینریش بۆل خۆی لە جێگایەکدا دەڵێت «زۆرجار توندوتیژی وشە دەشێت لە توندوتیژی زللە و تفەنگ خراپتربێت». لێرەدا دەبێت بڵێم، ئەوەی لەسەرێتی بەرگری لە ئەخلاقی ڕۆژنامەوانی بکات، نەهێڵێت دابەزێت بۆ ناو جوغزی درۆکردن، نەهێڵێت گیرۆدەی ختوکەدانی هەستە سەرەتایی و ناکامڵەکانی خوێنەران بێت، ڕێگربێت لەوەی ڕۆژنامە نەکەوێتە ناو ڕۆحێکی پۆپۆلیستییەوە و تەنیا ئەو شتانە بڵاوبکاتەوە کە دەفرۆشرێت، ئەو کەسانەن کە لە ڕۆژنامەی ئازاد دا ئیشدەکەن. ڕۆژنامەوانی ئازاد دەبێت سەدجار لە ڕۆژنامەنوسی دی وریاتربێت و ئاگاداری ترسناکیی ئەو پیشەیە بێت کە دەشێت میدیاکار لە گەیەنەری ڕاستییەوە بگۆڕێت بۆ جانەوەرێک کە یاری بە

ژیـان و ئابـڕووی ئینسـانەکان دەکات. جێـگای خۆیەتـی ڕۆمانەکـەی بـۆل لـەو کارانـە بێـت کـە هەمـوو ڕۆژنامەنوسـانی ئێمـە بیخوێننـەوە، یاخـود لـە کۆلێژەکانـی ڕۆژنامەوانیـدا بخوێنرێـت... چونکـە لـەم چەنـد ساڵەی دواییـدا کـە لێشـاوی ترسـناکی چاپەمەنـی و شـەڕی زۆر فرۆشـتن و جەنگـی تیـراژ لـە وڵاتـی ئێمەشـدا دەسـتیپێکردوە، هێـدی هێـدی سـێبەری ڕۆژنامەوانانـی وەک توێتگـس لـە هەمـوو لایەکـەوە سـەریاندەرهێناوە، مـرۆڤ ئاسـان دەتوانێـت لـە ڕۆژنامەگـەری ئێمەشـدا ئـەو حاڵەتانـە بژمێرێـت کـە لـە حاڵەتـی خانمـی بلـوم بەدتـرن.

لـە خوێندنـەوەی ڕۆمانەکـەی هاینریـش بۆلـەوە مـرۆڤ لـەو ڕاسـتییە تێـدەگات، کـە دەسـتبردن بـۆ وشـە، وەک دەسـتبردن بـۆ دینامیـت، شـتێکی ترسـناکە... یەکێـک لـە ئیشـەکانی نوسـەر لـە وڵاتـی ئێمـەدا ئەوەیـە نەهێڵێت وشـە بـە جۆرێکـی دڕندانـە بەکاربێـت، نەهێڵێـت وشـە وێرانـکار بێـت، گـەر نەشـتوانێت هەمیشـە ڕاسـتی بدۆزێتـەوە، هەولّبـدات نەچێتـە خزمەتـی یاریکردنـەوە بـە چارەنوسـی مرۆڤـەکان و بڕیاردانـی پێشـوەخت لەسـەر مۆراڵ و چارەنوسـیان... وشـە دەبێـت دژی زمـان خـۆی بجولێنرێـت، بـەو مانایـەی کـە زمـان هەمیشـە بارگاوییـە بـە نیـازی تێکشـکاندن و وێرانکـردن. زمـان لـە میدیـادا وەک زمـان نییـە لـە ئـەدەب یـان لـە واقعـی ڕۆژانـەدا. زمانـی میدیـا کەرەسـتەیەکی کاریگـەرە و هێـزی شـێواندن و ئاڕاسـتەکردن و ڕکێفکردنـی خەیاڵـە لاوازەکانـی زۆرتـرە، زمانێکـە زووتـر دەگات و زۆرتـر بڵاودەبێتـەوە، لێرەشـەوە توانـای وێرانکاریـی گەورەتـری تێدایـە... زمانـی میدیـا، بـەراورد بـە زمانـی ئـەدەب یاخـود زمانـی قسـەکردنی ڕۆژانـە، تێکشـکێنەر و دیماگـۆک و مەکربـاز و وێرانـکارە.

## نیکراسۆف وەك نمونە

هینریش بۆل، تاکە نوسەری ناسراو نییە کە کارێکی ئەدەبی تەواوی بۆ دەرخستنی هەندێک لە ڕوخساری دڕندانەی میدیا و ڕۆژنامەگەریی مۆدێرن تەرخانکردبێت، ڕەخنەگرتن لە میدیای مۆدێرن بەشێکی گرنگی هەموو ڕخنەگرتنێکە لە خودی مۆدێرنە و ڕوکارە نەگەتیڤەکانی. ڕۆڵی تەلەفزیۆن لە گەورەبوونی نازییەتدا ڕاستییەکی زانراو و حاشا هەڵنەگرە. ڕۆڵی میدیاش لە قایمکردنی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکاندا دیاردەیەکە هەم زۆری لەسەر نوسراوە و هەم گرنگیشە بۆ تێگەیشتن لە پەیوەندی نێوان میدیا و دیکتاتۆرییەت. بە گشتی لە ڕوانگەی زۆربەی نوسەر و بیریارە گەورەکانی سەدەی بیستەوە، میدیا هیچ کات جێگایەکی بێگوناهـ نەبووە، کەرەستەیەکی بێ قەید و شەرتی ئازادی نەبووە. لە گرامشییەوە کە میدیا بە کەرەستەیەکی هەیمەنەی چینایەتی دەزانێت تا ئەو ڕۆڵەی لە دروستکردنی «مرۆڤی تاک ڕەهەندا» لای مارکۆزە دەیبینێت، هەردەم لەبەردەم ڕەخنەیەکی فیکری قووڵداین کە ڕۆژنامەگەری مۆدێرن و میدیا مۆدێرنەکان دەکاتە ئامانج. لە شانۆگەری نیکراسۆف دا سارتەر، وەک هاینریش بۆل، سروشتی میدیاکان لە سەردەمی شەڕی سارددا دەخاتە بەر ڕەخنەیەکی توندەوە. بەش بە حاڵی خۆم، ئەم کارە شانۆییەی سارتەرم لە زۆر لە کارە شانۆییەکانی دیکەی پێ چاکترە، ئەگەرچی هەمان قووڵی فەلسەفی تێکستەکانی وەک «دەرگا داخراوەکان» یان «مێش» ـیشی نەبێت، بەڵام شانۆگەرییەکی گەلێک پڕ جوڵە و زیندووە، پڕە لە ئاڵوگۆڕی خێرا و لابەلابوونەوەی چاوەڕوان نەکراو و بەرز و نزمی گەورە کە بەدەگمەن لە تێکستێکی شانۆییدا جێگایان دەبێتەوە، جگە لەوەی شتێک لە هەناسەی کۆمیدیشی تێدایە کە لە تێکستەکانی دیکەی سارتەردا بەو چڕییە هەستی پێناکەین. کۆی تێکستەکە پەیوەندییەکی گرنگی بە ڕۆحی فەلسەفەی سارتەرەوە دەربارەی «ماهییەتی مرۆڤ»

هەیـە. هەمـوو دەزانیـن بۆچوونـی سـەرەکی سارتەر ئەوەیـە کـە مـرۆڤ بوونەوەرێکـە خـۆی خـۆی دروسـتدەکات، مەحکومـە بـە ئـازادی، واتـە ژیـان و ماهییەتمـان گرێـدراوی ئـەو هەڵبـژاردن و بڕیارانەیـە کـە ئێمـە خۆمـان دەیدەیـن... وەک جـۆرج دی فالێـرا «پاڵەوانـی سـەرەکی شـانۆگەری نیکراسـۆف» دەڵێـت «مـن تەنیـا قەرزاربـاری خۆمـم، مـن تەنیـا دەسـتکردی کاروکـرداری خۆمـم»، جـۆرج دواتـر ئـەم ڕسـتەیە لـە چەندیـن دیمەنـی جیاواز جیـاوازدا دووبارەدەکاتـەوە. جـۆرج دی فالێـرا، پاڵەوانـی ئـەم شـانۆگەرییە کـە سـارتەر سـاڵی ١٩٥٥ نوسـیویێتی، دز و قۆڵبڕێکـی بەناوبانگـە کـە پۆلیـس بەدەسـتییەوە گیـری خـواردوە، بلیمەتێکـە لـە خۆشـاردنەوە و دەربازبـوون لـە هەمـوو تەڵـەو داوێـک کـە بـۆی دادەنرێـت. لـە دیمەنـی یەکەمـدا جـۆرج لـە کاتێکـدا هەوڵـی خۆکوشـتن دەدات، لەلایـەن ژن و پیاوێکـی بێمـاڵ و جێـگا وە کـە لـە نزیـک پردێکـەوە دانیشـتوون ڕزگاردەکرێـت، خـودی ئـەم دیمەنـە کـە ڕەهەندێکـی سـەمبولی هەیـە، ئاماژەیـە بـۆ لەدایکبوونەوەیەکـی نوێـی جـۆرج... لـە دزێکـەوە کـە ئیـش بـۆ خـۆی دەکات، لـە کەسـێکی ئـازادەوە کـە تەنیـا دەوڵەمەنـدان و پـارەداران ڕووتدەکاتـەوە، بـۆ کەسـێکی تـر کـە چیتـر چارەنوسـی لـە دەسـتی خۆیـدا نییـە و دەکەوێتـە ژێـر ڕەحمەتـی ئـەو ماشـێنە ترسـناکەوە کـە ماشـێنی میدیـا و پۆلیسـی نهێنـی و فەرمانبـەرە ئایدۆلۆژییەکانـی دەوڵەتـە. بڕێکـی زۆر لـە دیمەنەکانـی شـانۆگەرییەکە لـە بیرۆکانـی ڕۆژنامـەی «سـوارئاباری» ڕاسـتڕەودا ئەنجامدەدرێت کـە وەزیفـەی سـەرەکیان دژایەتیکردنـی کۆمۆنیـزم و ناشـیرینکردنی یەکێتـی سـۆڤێت و بەرزڕاگرتنـی مۆدێلـی سـەرمایەدارییە. سـارتەر لـە سـەرەتاوە هەوڵـدەدات ئـەو دڵەڕەقییـە زۆرەی لـە نـاو دەزگای سـوارئاباریدا هەیـە بخاتـە ڕوو، مەسـەلەکە تەنیـا بەجەهلـی کەسـێکی وەک «جـول» ـەوە ناوەسـتێت کـە ئیـدارەی ڕۆژنامەکـەی بەدەسـتە، لەویاشـدا کۆتایـی نایـەت کـە ڕۆژنامەکـە بـە چ وێنەیەکـی ترسـناک و ئامێرئاسـا مامەڵـەی کارمەندەکانـی دەکات،

بەڵکو کارەساتی هەرە گەورەکە ئەو وێنە نادروست و دەستکرد و خەیاڵکارەیە کە نوسەرانی سوارئاباری دەبێت بۆ دونیا و سیاسەتی بکێشن و پێشکەشیبکەن. کێشەی سەرەکی جۆل ئەوەیە ڕۆژنامەکە چیتر شتێکی گەورە و گەرم و سەرنجڕاکێشی نییە خوێنەرانی پێ بهەژێنێت... ئەوەش ترسناکترین دەردێکە ڕۆژنامەیەک تووشی ببێت. ئەو وەک خاوەنی ئیدارە لەسەرێتی شت بجوڵێنێت، ئەگەر ڕووداو نەبوو، دروستیبکات، گەر شتی گەرم نەبوو لە هیچە بیخولقێنێت. لێرەدا سارتەر بەوردی لەسەر یاسای سەرەکی میدیای مۆدێرن ئیشدەکات کە بەجۆرێکی بێمانا دەکەوێتە دەست پیشەسازی دروستکردنی مانشێتی گەرم هەتا ئەگەر لەسەر حیسابی ڕاستی بووە. سوارئاباری مۆدێلی ئەو ڕۆژنامە حکومیانەیە کە هەرچییەکیان کردوە دەبێت شتێک بخولقێنن نەیاران و دوژمنانی خەتی ئایدۆلۆژی خۆیان ناشیرین بکەن. سیبیلیو ڕۆژنامەنوسێکی بەتەمەنە کە بەرپرسی ڕاگەیاندنی دژ بە کۆمۆنیزمە لە ڕۆژنامەکەدا، هەموو ژیانی خەریکی دروستکردن و داڕشتنی هەواڵی دژ بە سۆڤێت و بلۆکی کۆمۆنیزم بووە، ئەوەندەی درۆکردوە چیتر توانا و خەیاڵی وەک جاران ئیش ناکەن و ڕاپۆرتەکانی کاریگەریان نەماوە و سەرنجی خوێنەران ڕاناکێشن... لێرەدا سارتەر جۆرە زیرەکییەکی بێوێنە لە چنینی چیرۆکی شانۆنامەکەدا نیشاندەدات، بەسەرێک دی فالێرای دز و دەستبڕمان هەیە کە هەڵهاتووە، بەسەرێکی دیش سیبیلۆی پیرمان هەیە کە ئەگەر شتێک نەکات و بیر لە دروستکردنی هەواڵێکی ئیعلامی گەورە نەکاتەوە ڕۆژنامەکە هەستێنێتەوە، لە ئیشەکەی دەردەکرێت، بەسەرێکی دیش هەواڵی دیارنەمانی وەزیری ناوخۆی ڕۆسی «نیکراسۆف» لە ناودایە کە ماوەیەکە لە ڕاگەیاندنەکانی دەوڵەتەوە ناوی نایەت و دەرناکەوێت. سارتەر شانۆگەرییەکەی لە لێکدانی ئەم سێ چیرۆکە دوور و بێپەیوەندییە لەگەڵ یەکدا دەخولقێنێت. دی فالێرا کە بەدەستێک جلی

شـرەوە لـە دەسـت پۆلیـس هەڵهاتـووە ڕێـگای دەکەوێتـە ماڵـی سـبیلیو و لـەوێ فیرۆنیکـی کیـژی دەبینێـت کـە ئەویـش هـەر ڕۆژنامەنوسـە، بـەڵام بـە پێچەوانـەی باوکییـەوە لـە ڕۆژنامەیەکـی چـەپ کاردەکات، فیرۆنیـک کـە زۆر ڕقـی لـە پۆلیسـە دالـدەی دی فالێـرا دەدات و دەیپارێزێـت، بـەڵام ڕووداوەکان وادەچنـە پێشـێ کـە دی فالێـرا لەگـەڵ سـبیلیۆی نائومێـد و بەدبەختـدا کۆببنـەوە و بگەنـە ڕێکەوتنێـک کـە سـبیلیۆ، دی فالێـرا وەک «نیکراسـۆف» وەزیـری ناوخـۆی ڕوسـی بناسـێنێت کـە گوایـە بـەرەو خۆرئـاوا هەڵهاتـووە... بـەو چیرۆکـە هـەم سـبیلیۆ ئیشـەکەی مسـۆگەر دەکات، هـەم دی فالێـرا دەتوانێـت خـۆی لـە ژێـر ناوێـک و شوناسـێکی تـردا ونبـکات. سـبیلیۆ بەترسـێکی زۆر و لـە ژێـر بـاری ناچارییـدا دەچێتـە نـاو گەمەکـەی دی فالێـرا وە. لێـرەدا دووبـارە ڕۆڵـی ترسـناکی میدیـا دێتـەوە سـەرەوە... دی فالێـرا کاتێـک ئـەم گەمەیـە دەکات، کەسـێکی ئـازادە، خـۆی بـە بڕیـاری ئازادانـەی خـۆی دەسـتبەرداری نـاو و شوناسـی خـۆی وەک جـۆرج دی فالێـرا دەبێـت و بەرگـی سیاسـییەکی وەک نیکراسـۆف لـە بـەردەکات. بـەڵام دی فالێـرا هێنـدەی دەبێتـە نیکراسـۆف، دەکەوێتـە ناوەنـدی گەمەیەکـی ترسـناکەوە کـە داوەکانـی چیتـر لـە دەسـتی خۆیـدا نیـن... تـا ئـەو کاتـەی ئـەو دزە هـەر ئیشـێک دەیـکات لەوپـەڕی ئازادییـەوە دەیـکات، خـۆی خولقێنـەری ماهییەتـی خۆیەتـی، خـۆی شوناسـی ئینسـانی خـۆی دیاریـدەکات، بـەڵام لـەو سـاتەوە کـە دی فالێـرا دەبێتـە نیکراسـۆف، دەبێـت بـە کەرەسـتەیەک کـە سیاسـەت و میدیـا و ئابووریـی و قازانجـە گـەورەکان بەکاریدەهێنـن. ڕۆژنامەکـە بـۆ پاککردنـەوەی ناوخـۆ و بـۆ تۆمەتبارکردنـی هەندێـک کـەس بـە سـیخوڕی بـۆ سـۆڤێت دەیخەنـەکار، شـتی دەخەنـە پـاڵ کـە نەیگوتـووە، لەگەمـەی هەڵبـژاردن و شـکاندنی نەیـارە سیاسـییەکاندا بەکاریدەهێنـن. دی ڤالێـری کـە خـۆی بـە دوژمنـی دەوڵەمەنـدان و دۆسـتی هـەژاران دەزانێـت، دەبێـت بـە کەرەسـتەیەک، میدیـا بـۆ بڵاوکردنـەوەی نائومێـدی لـە نـاو خەڵکانـی

هەژاردا بەكاریدەهێنن، یان وەك فیرۆنیك پێیدەڵێت دەبێتە كەرەستەیەك بەدەستی سەرمایەدارییەوە و ئەو ماهییەتە ئازادەی لەدەستدەدات كە شانازی پێوە دەكات، چیتر شوناسی بەرهەمی كارەكانی خۆی نییە، هەتا لە كۆتایی شانۆگەرییەكەشدا كە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ شوناسە كۆنەكەی خۆی، ڕێگای پێ نادەن و لە دەست پۆلیسی مەدەنی دەیفڕێنن و ناچاریدەكەن درێژە بە شوناسی ساختەی خۆی وەك نیكراسۆف بدات.

سارتەر لێرەدا وەك هاینریش بۆل، پێ لەسەر ئەو دیوە ترسناكەی میدیای هاوچەرخ دادەگرێت وەك كەرەستەیەكی شێواندنی وێنەی ڕاستەقینەی شتەكان. لای هاینریش بۆل بینیمان، میدیا بەرگێك بە زۆر دەكاتە بەری كاترینا كە بەرگی خۆی نییە، لای سارتەریش میدیا بەرگێك بە زۆر دەكاتە بەر دی فالێرا كە بەرگی ئەو نییە، سەرەتا بە ڕەزامەندی خۆی و دواتر بێ ڕەزامەندی خۆی. كۆی شانۆگەرییەكە توانا و خواستی میدیا بۆ یاریكردن بە مرۆڤ و حەقیقەت نیشاندەداتەوە، مرۆڤ لە جیهانێكی وەهادا كە میدیایەكی زاڵم و ناڕاستەكراو حوكمیدەكات، ئەو توانایەی لێ دەسێنرێتەوە خۆی وێنەی خۆی، بەپێی هەڵبژاردنەكانی خۆی دروستبكات، ئەوەش بەپێی دونیابینی سارتەر واتە ئینسانییەتی لێدەسێنرێتەوە. لەم شانۆگەرییەی سارتەردا زیاتر لە هەر تێكستێكی دی، ئەو ڕاستییە ترسناكە دەبینین كە میدیا حەقیقەت ناگێڕێتەوە، بەڵكو حەقیقەت دەخولقێنێت. مرۆڤ هێندەی كەوتە ژێر بەرداشەكانی ئەو وێنەسازییەوە، هێندەی بووە بەشێك لە گەمەكانی ئەو ئامێرە، بە جۆرێكی ترسناك دەبێتە قوربانی ماشێنەكە و بێخواستی خۆی دەكەوێتە ناو یاساكان و ویستەكانییەوە... لە نمایشی نیكراسۆفدا ڕۆژنامە وەك كارخانەیەكی گەورەی شێواندنی مرۆڤ و حەقیقەت دەردەكەوێت، وەك چەكێكی كوشندە لە شەڕێكی گەورەدا، كە تەنیا یاساكانی شەڕ چۆنێتی بەكارهێنانی دیاریدەكەن، نەوەك بانگەشە درۆزنەكانی دركاندنی ڕاستی

و پابەندبـوون بـە مۆراڵـەوە، کـە زۆربـەی کات ڕۆژنامـە و تەلەفزیـۆن و کەناڵانەکانـی تـری میدیـا دەیدەنـە پـاڵ خۆیـان. وەک ئـەوەی سـارتەر بـە خوێنـەر بڵێـت: وریابـە، هـەر شـتێک دەیخوێنیتـەوە، دەشـێت گەمەیەکـی شـاردراوە و ترسـناکی لـە پشـتەوە بێـت. لـە نیکراسۆفیشـدا وەک لای هاینریـش بـۆل بینیمـان، میدیـا و ڕۆژنامەگـەری ئـەو قودسـییەتە درۆزنەیـان لێدەسـێنرێتەوە کـە خۆیانـی پێدەڕازێننـەوە، دروشـمەکەی سـوارئاباری «حەقیقەتـی ڕووت» لای سـارتەر دەبێتـە «درۆی ڕووت»...

## «ترومان شۆ» وەك نمونە

گـەر بەشـێکی دڕندەیـی میدیـا لـە جیهانـی دواکەوتـوودا بگەڕێتـەوە بـۆ ئەخلاقـی حیـزب و دەوڵەتـە دیکتاتۆرییـەکان، بـۆ پاشـکۆگەرایی میدیـا بـۆ دەسـەڵات، یـان بـۆ نەبوونـی مۆراڵـی ڕاگەیانـدن و لاسـیکردنەوەی سـادە و نابەجێـی میدیـای خۆرئاوایی... ئـەوا دڕندەیی میدیـای خۆرئاوایی پەیوەندییەکی گـەورەی بـە ڕۆحـی سـەرمایەدارییەوە هەیـە. کەپیتالیـزم ناتوانێـت بـێ میدیـا و بـێ شـێواندنی خواسـتە سروشـتییەکانی مـرۆڤ بـژی. لـە مێـژە لـە خۆرئـاوادا چیتـر کەنیسـە ڕابـەڕی ڕۆحـی خەڵـک نییە و تەلەفزیـۆن هوشـیاری و دونیابینی و ڕاسـت و هەڵـە بـۆ خەڵـک دەستنیشـاندەکات... بەجۆرێـک لـە هوشـیاری مرۆڤـی خۆرئاواییـدا، ڕووداوی گـەورە ئەوەیـە کـە میدیـا باسـیدەکات، هەتـا ئەگـەر لـە دایکبوونـی پشـیلەیەکیش بێـت، هـەر ڕووداوێکیـش میدیـا باسـی نـەکات، ئەگـەر مردنـی سـەدان هـەزار مرۆڤیـش بێـت، ئـەوا لـە زەیـن و خەیاڵـی ئـەم مرۆڤـەدا نرخـی نییـە و جێـگای نابێتـەوە. لێـرەوە میدیـا لـە خۆرئـاوادا گەرچـی هەندێجـار لـە گەیاندنـی هەمە ڕەنگـی بیرکردنەوە و جیـاوازی ئایدیاکاندا ڕۆڵێکـی پۆزەتیڤـی هەیـە، بـەڵام هەندێجـاری دیـش بـە ڕوونـی کەرەسـتەیەکی ئایدۆلـۆژی و کوشـندەی دەسـتی سیسـتمە و کاری شـێواندنێکی سیسـتماتیکی وێنـەی دونیـا و ڕاسـتییەکان دەگرێتـە بـەر.

ئەوەی لە میدیای خۆرئاواییدا ترسناکە، ئەو ڕەهەندەیەتی کە دەیەوێت تا بتوانێت دونیای واقیعی فەرامۆشبکات، کێشە ڕاستەقینەکان لە یادبکات و دونیایەکی تەریب دابمەزرێنێت کە قابیلی تەماشاکردن بێت. لە بڕێکی زۆری میدیای ئەورووپی و ئەمریکیدا گرنگ نییە چی لەسەر زەمینی واقیع ڕوودەدات، بەڵکو ئەوەیە خەڵک چی زۆر تەماشادەکەن... لێرەوە ستراتیژی سەرەکی، دروستکردنی بینەرە، دروستکردنی جیهانێکی ناواقیعییە کە سەرنج ڕابکێشێت. گۆڕینی هەموو شتێکە بۆ شۆ، بۆ بابەتێک بینەر مسۆگەربکات.

لە فلیمی «ترومان شۆ» ی دەرهێنەر پیتەر وایەردا (کە چەند ساڵێک پێشتر بە فلیمی یانەی شاعیرە مردوەکانەوە لەگەڵ ڕۆبن ویلیامزدا ناوبانگێکی جیهانی مسۆگەرکردبوو)، بەر ئەو غەریزە ترسناکەی میدیاکاری ئەورووپی دەکەوین، غەریزەی گۆڕینی هەموو شتێک بۆ بابەتی تەماشاکردن... دەستوەردان لە تایبەتیترین هەستی ئینسانی... گۆڕینی ژیانی ئینسان بۆ مادەیەکی کەیف و بەزمسازی بەردەوام . لەم فیلمەدا «ترومان بۆربانک» «کە جیم کاری ڕۆڵەکەی دەبینێت»، بێئەوەی خۆی بزانێت لە سکی دایکییەوە ئەکتەری زنجیرەیەکی تەلەفزیونییە کە بەردەوام بە لایف پەخشدەکرێت. کریستۆف کە بەرهەمهێنی زنجیرەکەیە ستۆدیۆیەکی گەورەی بە ئەندازەی شارێک دروستکردوە و لە ڕێگای زیاد لە ٥٠٠٠ کامێراوە، کە لە هەموو شوێنێکی شارەکەدا دانراون وێنەی ترومان دەگرێت... لە منداڵییەوە ژیانێکی دەستکرد بۆ ترومان دروستکراوە، تەواوی ئەو شارەی ئەو تێیدا دەژی، بە تەواوی خۆر و مانگ و هەور و بارانییەوە دونیایەکی دەستکردە، مامۆستاکانی ئەکتەرن، دراوسێکانی ئەکتەرن، هاوڕێکانی ئەکتەرن، ئەو کچەی خۆشیدەوێت، ژنەکەی پێکڕا هەموو دروستکراو و ئەکتەرن. هەموو کەس دەزانێت کە دونیای ترومان ستۆدیۆیەکی گەورەیە، ترومان خۆی نەبێت. فلیمەکە لە ڕێگای سیناریۆیەکی زۆر سەرکەوتووەوە کە لە نوسینی «ئەندرۆ

نیکۆل»ــە، هێدی هێدی ترومـان دەخاتـە سـەر ئـەو گومانـەی کـە شـتێک لـە دەوروبـەری و لـە ژیانیـدا تـەواو نییـە... هەتـا ئـەو کچـەی کـە خۆشـیدەوێت، کاتێـک دێتـە سـەر ئـەو خەیاڵـەی ڕاسـتییەکان بـۆ ترومـان ئاشـکرابکات، لـە زنجیرەکـە دووردەخرێتـەوە. لەگـەڵ بـەرەو پێشـچوونی هەرچی زیاتـری فلیمەکەدا هێدی هێدی ترومـان بـۆی ڕووندەبێتـەوە کـە چ یارییەکـی نائینسـانی بـە ژیانـی کـراوە و چـۆن لـە منداڵییـەوە هەرچییەکـی کـردوە، سـیناریۆیەکی پێشـوەخت ئامادەکـراو بـووە، چـۆن ئـەو هەرگیـز نـە هـاوڕێ و نـە خۆشەویسـتی نەبـووە و تەنیـا لـەم دیمەنـەوە بـراوە بـۆ ئـەو دیمەنـە و لـەم بـەر کامێـراوە چۆتـە بـەردەم ئـەوی دی. کۆتایـی فیلمەکـە و ئاشـکرابوونی ئـەو درۆ گەورەیـەی لەگەڵ ئـەودا کـراوە، هـەم سـەمبولی و هـەم زۆریـش غەمگینـە... بـەڵام بەجۆرێـک لـە جـۆرەکان حەقیقەتـی ئـەو زیندانـە ترسـناکەش ئاشـکرادەکات کـە میدیـا بـۆ ترومـان و بـۆ ئێمەشـی دروسـتکردوە. ئـەو ژیانـە دەسـتکردەی ترومـان بەجۆرێک لـە جـۆرەکان سـەمبولە بـۆ کـۆی ئـەو جیهانـە ناراسـت و دڕنـدە و دەسـتکردەی میدیـا بـۆ هەمووومانـی سـازاندوە... جیهانەکـەی ئـەو ئاماژەیـە بـۆ جیهانـە گەورە و پـڕ درۆکـەی میدیـا... ترومـان وەک ئەکتـەر و قوربانـی لـە نـاو ئـەو جیهانـەدا دیلـە، بـەڵام ئێمـەش وەک ئـەو قوربانیـن، ئێمـەش وەک بینەر، وەک کەسـێک کە کاڵایەکـی سـاختەمان پێدەفرۆشـرێت نێچیـری نـاو هەمـان گەمەیـن.

فلیمەکـە بەبـڕوای مـن تەنیـا ئـەو خواسـتە ناشـیرینەی میدیـاکاران پیشـان ناداتـەوە، کـە دەتوانـن مرۆڤـەکان بکـەن بـە ڕۆبـۆت و ئەکتـەری خۆیـان، بەڵکو ئـەوەی لای مـن زۆر ترسـناکە، نیشـاندانی ئـەو گەشـە گـەورە و بێسـنوورەیە کە پیشەسـازی درۆکـردن و شـێواندن بریوێتـی. میدیـا دەتوانێـت هەمووومـان بخاتـە نـاو جیهانێکـی ناڕاسـتەوە، هەموومـان بخاتە قەفـەزی خۆیـەوە، دەموچاوێکمان بـۆ دروسـتبکات کـە نامانەوێـت و ژیانێـک و شوناسـێکمان بداتـێ کـە ئـەو خۆی دروسـتیکردوە. دەتوانێـت غەریـزە سـەرەتاییەکانمان بجوڵێنێـت، غەریـزەی چاودێـری و تەماشـاکردنی ئەوانـی دیمـان تیـا گەورەبـکات، وامـان لێبکات ببینە

بینەرێکی چاوچنۆک کە لەسەر خولیای بینینی دونیای ئەوانی تر دەژین، لە تێفکرینمان دووربخاتەوە و بمانگۆڕێت بۆ مێگەلێک لە بینەری پاسیڤ کە دادەنیشین و لەزەت لە بینینی جیهانی تایبەتی و نهێنی ئەوانی تر وەردەگرین... ئەوەی لای من کارەساتە ئەوە نییە کە ئێمە لە جیهانێکدا دەژین کە بەرهەمهێنی وەک کریستۆفی تێدایە، بەڵکو ئەوەیە کە کاڵای کەسێکی وەک کریستۆف کڕیار و بینەری هەیە... میدیای مۆدێرن تەنیا ئەوانە ناشێوێنێت کە دروستیدەکەن، یان دەبن بە قوربانی ئامێرەکەی، بەڵکو ئینسانیەتی ئەوانەش دەشێوێنێت کە دەیبینن.

دیارە میدیا شایستەی وەستانی دوور و درێژ و قووڵترە، بەڵام لەم گۆشە بچوکەوە، زەحمەتە بتوانم لەوە زیاتر بڵێم. من ئەوەندەم مەبەستە، میدیاکارانی خۆمان لە ڕەهەندی ترسناکی ئیشەکەیان ئاگاداربکەمەوە... ئەوەندەم مەبەستە بزانین میدیا دەشێت کەرەستەیەکی ترسناکی درۆکردن و سەحنەیەکی وەحشەتناکی شێواندنی مرۆڤ بێت... میدیاکاری راستەقینە دەبێت کەسێک بێت هەستی ئینسانی خۆی نەدۆڕێنێت، ئاگاداری ئەوە بێت چەکێکی کوشندەی بە دەستەوەیە، ئاگاداری ئەوە بێت چۆن نابێت ویژدانی خۆی بە دەسەڵات و حاکمان بفرۆشێت، نابێت ویژدانی خۆشی بە خوێنەری سەتحی و بینەران و خواستی بازاڕ و مەیلی پۆپۆلیستی بفرۆشێت. میدیا دواجار کەرەستەیەکی کۆمۆنیکاتسیۆنە کە نابێت واقیعێکی ئەلتەرناتیڤ لەسەر حیسابی واقیعی راستەقینە دروستبکات... نابێت جیهانێکی دەستکرد لەسەر حیسابی جیهانی واقیعی دابرێژێت. دەبێت بزانێت هەموو بابەتێک لە میدیادا هەڵگری بارگەیەکی ئایدۆلۆژییە... بزانێت، میدیا هیچ کات شوێنێکی بێ گوناه نییە کە تەنیا کاری گەیاندنی ڕاستی ساف و بێگەرد بووە. هەموو وشەیەک لە تورەکانی میدیادا، نیشانەیەکی ئایدۆلۆژییە و سەر بە سیستمێکی وێناکردن و تێگەیشتنە، کە هەمیشە بڕێک لە ڕاستی دەشکێنێت و دەیچەپێنێت.

# ترس لە دۆستۆفسکی

یۆرگـن شـپیتز، لـە یەکێـک لـە وتارەکانیـدا دەربـارەی دۆستۆفسـکی دەڵێت لەڕوسیا چاوم بەوەرگێڕێـک کـەوت، پێـی گووتـم «نۆسـاڵە نەمویـراوە دۆستۆفسـکی بخوێندمـەوە و بچـم بەلایـدا، چونکـە هـەر کات ڕۆمانێکـی ئـەو دەگـرم بەدەسـتمەوە دەزانـم باسـی خـۆم دەکات». لـە راسـتیدا بەرگەگرتنـی دۆستۆفســکی ئاســان نییــە. تۆمــاس مــان لەســەر هەقــە کــە دەڵێــت «دۆستۆفسـکی بـەڵام بـە ڕێژەیەکـی دیاریکـراو». برێکـی زۆر لـەم نوسـەرە، دەبێتـە مایـەی غـەم و تێڕامانـی زۆر و ئەفسـوردەگی. جوانتریـن و غەمگینتـر وەسـفێک سـەبارەت خوێندنـەوەی دۆستۆفسـکی بینیبێتـم لای هێرمـان هێسـە بـووە، ئـەو دەڵێـت «کاتێـک دەبێت دۆستۆفسـکی بخوێنینـەوە کە غەمگینین، کاتێـک گەیشـتبینە سـەر دوا سـنووری تواناەمـان لەسـەر ئـازار، کاتێـک هەمـوو ژیـان وەک یـەک برینـی داگیرسـاو و بەسـوێ دەبینیـن، کاتێـک دوودڵـی هەڵدەمژیـن و هەمـوو ئومێدمـان مردبێـت، کاتێـک لـە غەمگینیـدا تەنیـا و پەککەوتـە لـە ژیـان دەروانیـن و نامانەوێـت چیتـر لـەو سـامناکییە جـوان و دڕندەیـەی هیـچ تێبگەیـن و هیچمـان هەبێـت، تەنیـا ئەوکاتە ئێمە کـراوە دەبین بـۆ ئـاوازی ئـەم نوسـەرە ترسـناک و گەورەیـە». ئـەو یەکێکـە لەو نوسـەرانەی جیهانێکـی زۆر پـڕ و جەنجاڵـی هەیـە، سـەفەرکردن بـە ڕۆمانەکانیـدا، گەشـتە بـە نـاو دارسـتانێکی پـڕ لـە کاراکتـەر و ڕۆحی جیـاواز جیاواز کە زۆر لە شـێواز و چەشـنە سـایکۆلۆژییەکانی مـرۆڤ دەگرێتـە بـەر. ئـەو پاڵەوانێکـی نۆرماڵـی

نییە، هۆکەشی ئەوەیە کە شتێک نییە ناوی مرۆڤی نۆرماڵ بێت. ڕەنگە دۆستۆفسکی زووتر و زیاتر لە هەر کەسێکی دیکە دەرکی بەو ڕاستییە کردبێت کە مرۆڤی نۆرماڵ بوونی نییە. نۆرماڵبوون درۆیەکی گەورەیە مرۆڤ جگە لە هەمەڕەنگی و جیاوازی هیچی تر نییە. بەڵام لەگەڵ هەموو جیاوازییەکانیشدا مرۆڤەکان لای دۆستۆفسکی یەکەیەکی هاوبەشیان هەیە، خاڵێکی جەوهەریان هەیە کە کۆیاندەکاتەوە. دۆستۆفسکی مرۆڤ وەک گوناهبار دەبینێت، لای ئەو مرۆڤەکان چەند هەمەڕەنگ و جیاوازبن، لەوەدا هاوبەشن کە گوناهبارن. پاڵەوانی بێخەتا لە ئەدەبی دۆستۆفسکیدا بوونی نییە. بەڵام لای دۆستۆفسکی هەموو گوناهبارەکان دەرفەتی ئەوەیان بۆ دەرەخسێت مرۆڤبوونی خۆیان بسەلمێنن، لای ئەو مرۆڤ تەنیا دەتوانێت مرۆڤبوونی خۆی بسەلمێنێت نەوەک بێگوناهی خۆی. باختین، دۆستۆفسکی بە نوسەرێکی زۆر دیموکرات دەبینێت، ئەو لەتێکستەکانیدا ڕێگا بە هەموو جۆرەکانی مرۆڤ دەدات بێنە قسە. لەو نوسەرانە نییە کە تەنیا دەنگێک لە ڕۆمانەکانیدا زاڵ بێت. فرەدەنگی لەڕۆمانی دۆستۆفسکی دا تەواو گرێدراوی جیهانبینی دۆستۆفسکییە، وەک نوسەرێک مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی بیرکەرەوە لە دۆخی وجودی خۆی دەبینێت. مرۆڤەکان گوناهبارن، بەڵام گوناه لە لۆژیکی دۆستۆفسکیدا دۆخە سروشتییەکەی بوونی مرۆڤە. فرۆید هۆی ئەم هەستە قووڵە بە گوناه لای دۆستۆفسکی دەگێڕێتەوە بۆ خواستێکی نهێنی کوشتنی باوک، ئەو وادەبینێت کە کوژرانی باوکی و بە منداڵی ئەو ئارەزووە ئۆدیبییە نهێنییەی بۆ تێرکردوە «ئارەزووی کوشتنی باوک»، کە دواتر وەک هەستێکی گەورەی گوناه گەڕاوەتەوە ناو تێکستەکانی دۆستۆفسکی.

لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا، ڕەخنەگری سۆڤێتی «گێنادی ڤیۆدۆرۆڤ» تەواوی ئەم چیرۆکەی وەک درۆ سەلماند. ڤیۆدۆرۆڤ لە لێکۆڵینەوەیەکی ورد و درێژدا باس لەوەدەکات کە تێزەکەی فرۆید لەسەر ئەوە ڕاگیراوە،

گوایە باوکە بەدکارەکەی دۆستۆفسکی بەدەستی یەکێک لە بەردەستەکانی خۆی کوژراوە و ئەو کوشتنەش پرۆسەیەکی سایکۆلۆژی قووڵی لای دۆستۆفسکی منداڵ بەگەڕخستووە کە تا کۆتایی لەگەڵیدا بووە، فرۆید هەتا کوشتنی فیۆدۆر کارامازۆف بە کێشەی ویژدانی کوشتنی باوکی دۆستۆفسکییەوە گرێدەدات و وەک درێژکراوەی ئەوتاوانە واقعییە دەیبینێت. بەڵام گێنادی فیۆدۆرۆف دەڵێت باوکی دۆستۆفسکی نەکوژراوە. باوکی دۆستۆفسکی مەرگێکی سروشتی مردوە، چیرۆکی کوشتنی باوک هیچ نییە جگە لە حیکایەتێکی نادروست و دروستکراو، گەر واشبێت تەواوی تێزە فرۆیدییەکە سەبارەت بە ڕیشەکانی هەستکردن بەگوناه لای دۆستۆفسکی هەرەسدەهێنێت.

لە ڕاستیدا گەر قووڵ فەلسەفەی ژیانی دۆستۆفسکی بپشکنین دەبینین کە فەلسەفەی گوناه لای دۆستۆفسکی بیرۆکەیەکە زۆر بە سیستمی تێروانینی ئەم نوسەرەوە بەندە. گوناه لای دۆستۆفسکی بیرۆکەیەکە پتر بەرەو یەکسانی مرۆڤەکانمان دەبات، بیرۆکەی گوناه لە فیکری دۆستۆفسکیدا تەنیا بارێکی سایکۆلۆژی نییە، بەڵکو ڕەهەندێکی فەلسەفی قووڵی هەیە، گوناه ئەو دۆخە مرۆڤانەیەیە کە یەکسانماندەکاتەوە، لێکمان نزیکدەکاتەوە، لە بەردەم ئاسماندا یەکمان دەخات. گوناه لە قووڵاییدا خاڵی هاوبەشی هەموو مرۆڤەکانە، بەوەدا هەموو گوناهبارین کەواتە بەچ هەقێک یەکێک خۆی دەکاتە دادوەر و دەسەڵاتدار بەسەر ئەوانی ترەوە. لە برایانی کارامازۆفدا برگەیەکی سەرنجڕاکێش هەیە کە زیاد لە هەر برگەیەکی تری ڕۆمانەکە لام گرنگە «بیر لەوە بکەرەوە کە تۆ هەرگیز بۆت نییە ببیتە دادوەر بەسەر کەسەوە، لەمسەر زەوییە هیچ کەس بۆی نییە دادوەر بێت بەسەر تاوانێکەوە، گەر پێشوەخت ئەو ڕاستییەی نەسەلماندبێت کە ئەویش چەشنی ئەو تاوانبارەی لە پێشدەمیدا وەستاوە تاوانبارە، هەتا لەو تاوانەشدا کە تاوانباری بەردەمی کردوێتی دەشێت

برێکـی گەورەتـر لـە گوناهیشـی بەربکەوێـت، کـە زیاتـر بێـت لـە بەشـی هەمـووان، کاتێـک ئـەوەی سـەلماند، ئـەو کات دەتوانێـت ببێتـە دادوەریـش».

دۆستۆفسـکی لـەو نوسـەرانە نییـە کـە لـە گوناهـ ڕایانکـردوە، جیاوازیـی لەگـەڵ دینـدارە سـادەکاندا ئەویـە کـە هەرگیـز بـاوەڕی بەپاکبوونـەوەی تەقلیـدی نەبـووە، مـرۆڤ تەنیـا جـەوری گوناهـی خـۆی هەڵناگرێـت. بەڵکـو دەبێـت بـاری هەمـوو گوناهێـک هەڵبگرێـت، تـا یـەک گوناهبـار هەبێـت هەموومـان گوناهباریـن. ئەگەرچـی دۆستۆفسـکی خـۆی دینـدار بـوو، بـەڵام بـە بـڕوای مـن بیرۆکـەی گوناهـ لـەلای ئـەو بیرۆکەیەکـی دینـی نییـە، گوناهـ بریتـی نییـە لـە خەتاکردنـی مـرۆڤ بەرامبـەر خـودا، بەڵکـو ئـەو دۆخەیـە کـە مـرۆڤ بـە مرۆڤەکانـی تـرەوە گرێـدەدات، دەرگای یەکەمـی خۆشەویسـتییە، گـەر مـرۆڤ دان بـە گوناهبـاری خۆیـدا دەنێـت بۆئـەوە نییـە لای خـودا بـۆ پاکبوونـەوە بگەڕێـت، بەڵکـو بـۆ ئەوەیـە بـە مرۆڤەکانـی تـر بڵێـت مـن بەشـێکم لـە ئێـوە، هەڵگـری سروشـتی ئێـوەم، هەڵگـری ئازارەکانتانـم. لێـرەدا گوناهـ ئـەو پردەیـە کـە مرۆڤـەکان لـە یـەک نزیکدەکاتـەوە، وادەکات کەسـیان خۆیـان بەچاکتـر و بەرزتـر و جوانتـر نەبینـن. گوناهـ لێـرەدا سـەرپێچییەک نییـە مـرۆڤ دەرهـەق بـە یاسـاکان بیـکات، بەڵکـو ئەکتێکـە وەک ئەکتـی بەرجەسـتەکردنی خـود، سـەلماندنی ئـەو ڕاسـتییەی کـە مرۆڤ هـەم ئازارکێش و ئازارسـازە. هـەم گوناهـی دەرهـەق دەکرێـت و هـەم گوناهـ دەکات، تەنیـا لـە ڕێـگای گوناهیشـەوە دەتوانێـت بـوون و ماهییەتـی ئینسـانی خـۆی دەربخـات، گـەر باوەڕمـان بـە گوناهـ نەبێـت ناتوانیـن باوەڕمـان بەخۆشەویسـتی و بەزەیـی هەبێـت، هەموومـان گوناهباریـن، بـەڵام هـەر یەکێـک لـە ئێمـە لـەوە لاوازتریـن بـە تەنیـا جـەوری گوناهـی خۆمـان هەڵبگریـن، بۆیـە پێویسـتیمان بـە بەزەیـی و تێگەیشـتن و خۆشەویسـتی هەیـە. دۆستۆفسـکی دەڵێـت مـرۆڤ لـە یەککاتـدا دەتوانێـت دادوەر بێـت بەسـەر ئەوانـی تـرەوە کـە خـۆی گوناهـی خـۆی بناسـێت، کاتێـک دان بـەوەدا بنێـت خۆشـی بەشـدارە لەتاوانەکـەدا،

چونکە تەنیا لەو کاتەدا چەمکی ڕاستەقینەی عەدالەت کەمێک دێتەدی. لەوکاتەدا دادەوەر و تاوانبار تێدەگەن هەردووکیان جەوهەرێکی یەکسان و سەرتاسەر کۆیاندەکاتەوە کە گوناهباریی مرۆڤە... ئەوەی لای دۆستۆفسکی جوانە ئەوەیە، بەپێچەوانەی هەموو لۆژیکێکی دینی و ئەخلاقی و یاساییەوە بیردەکاتەوە. دادوەر لەدۆخی ئاساییدا بۆ ئەوەی ببێت بە دادەور دەبێت پاکێتی خۆی بسەلمێنێت، دەبێت بیسەلمێنێت کە گوناهبار نییە، بەڵام لای دۆستۆفسکی تەواو بە پێچەوانەوە، دادەوری ڕاستەقینە کەسێکە دەزانێت ئەویش زۆر لە تاوانبارەوە دوور نییە، وەک ئەو گوناهبارە. پاکی درۆزنانە لەجیهانی دۆستۆفسکیدا جێگای نابێتەوە، پاکییەک مرۆڤ بەرەو ئاسوودەگی بەرێت، ئەو پاکێتییەی کە وادەکات حاکم و دادەورانی ئەم دونیایە ئاسوودە سەربخەنە سەر سەرین و بخەون. تاکە ڕێگایەک بەرەو عەدالەت بڕوات ئەوەیە، کاتێک بەرامبەر گوناهبارێک دەوەستین، بزانین ئێمەش گوناهبارین، شتێکی پاکتر و گرنگتر و باشتر نین لەو... ئەوە ئەو ڕاستییە ترسناکەیە کە بە زۆر ڕۆحی بچوک و خۆ بە پاکزان قەبووڵ ناکرێت. لای دۆستۆفسکی مەرجی گەورەی بوونە مرۆڤ، داننانە بە گوناهباریدا... چونکە بەبێ ئەوە ناکرێت بیر لە خۆشەویستی وبەزەیی و عەدالەت بکەینەوە.

بە هەر دیوێکدا دۆستۆفسکی بخوێنینەوە، هێشتا وەک نوسەرێکی ئەخلاقی دێتە پێشچاومان... کەم نوسەر هەیە وەک ئەو مرۆڤی تاسەر ئێسقان ڕووتکردبێتەوە، هەتا شەکسپیر بەراورد بەم وەک ماکیاژکارێکی گەورە دەردەکەوێت، ئەم بەجۆرێکی بێڕەحمانە هەموو دەمامکەکان دادەماڵێت، بوارێک ناهێڵێتەوە بۆ ئەوەی بە درۆ باس لەجوانی مرۆڤ بکەین. ترس لە دۆستۆفسکی لە جەوهەردا ترسە لەو ڕووتکردنەوە دڵرەقانەیە، ترسە لە وێنەی خۆمان کاتێک یەکێک تائەوپەڕی ڕاستگۆیی دەینێتەوە بەردەستمان. بەڵام مەبەستی دۆستۆفسکی ئەوە نییە ئازارمان

بدات، ئەو نوسەرێکی سادیست نییە چێژ لەوە ببینێت خوێنەرانی خۆی بترسێنێت و تووشی شۆکیانبکات بەوەی دیوێکی خۆیان بۆ دەربخات کە دەشێت لەلایان پەنهان بووبێت. ئەو هیتشکۆک نییە لەگەڵ ترسە نهێنییەکانماندا سەروکاری بێت. مەبەستی دۆستۆفسکی لە رووتکردنەوەی مرۆڤ ئەوەیە بڵێت مرۆڤ بوونەوەرێکە شایستەی خۆشەویستییە. کە مرۆڤ ڕووتدەکاتەوە بۆئەوەیە پێمان بیڵێت عاشقی ئەم گوناهبارە بن. دەرخستنی خراپەی مرۆڤ بۆئەوەیە نیشانمانبدات ئەم بوونەوەرە بەدبەختە چەندە شایستەی بەزەییە. مرۆڤ شایەنی میهرەبانی و عەشق نییە، چونکێ پاک و بێگەردە، بە پێچەوانەوە، شایستەی خۆشەویستییە، چونکە بەدبەختێکی گوناهکارە. کاری گوناهبارانە لای دۆستۆفسکی بەپێچەوانەی زۆربەی نوسەرانی ترەوە کارێک نییە گوناهبار ئەوانی تری پێ وێرانبکات... لای دۆستۆفسکی، گوناهبار لە رێگای گوناهەوە تەنیا خۆی وێراندەکات. ڕستە بە ناوبانگەکەی راسکۆلینکۆف لە سەرجەم تێکستەکانی ئەودا و لە هەموو کونج و کەلێنێکی دەرونی پاڵەوانەکانیدا دەنگدەداتەوە « من ئەو پیرێژنەم کوشت؟ من خۆمم کوشت نەوەک ئەو پیرێژنە. بە یەک گورز بۆ ئەبەد خۆم لە نێو برد، یەکجار و بۆ هەتاهەتایە» ... چ کەسێک هەیە ئەم ڕستەیە یەکجار بخوێنێتەوە و لەبیریبکات. من سی و دوو ساڵ لەمەوبەر ئەو ڕستەیەم خوێندۆتەوە و ئێستاش وەکو خۆی لە یادمە... گوناهبارەکانی دۆستۆفسکی جگە لەوەی خۆیان لە نێودەبەن، هیچی دی ناکەن، کوژراوەکان تەنیا سەمبولن، قوربانی ڕاستەقینە تاوانبارەکانن. گوناه لای دۆستۆفسکی نە تورەییە، نە تۆڵەیە، نەرقە بەرامبەر دونیا، بەڵکو جۆرێکە لە خۆسزادان. مرۆڤ خۆی بە بەدکار دەبینێت و لە رێگای گوناهەوە هەم بەدکاری خۆی دەسەلمێنێت و هەم خۆی سزا دەدات. لای دۆستۆفسکی گوناه و سزا دوو شتی دژ بە یەک و جیاواز نین. گوناه هیچ نییە جگە لە خۆسزادان، سزاش هیچ نییە جگە لە جۆرە

گوناهێکی گەورە. لای ئەو گوناه خۆی سزایە و سزاش خۆی گوناهە. لێرەوە لێکچوونێکی جەوهەری لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا هەیە کە لای ئەو هیچ کات لە یەک ناترازێن. بەپێچەوانەی هەموانەوە دۆستۆفسکی مەرجی پاکی و باشی بۆ خۆشەویستی مرۆڤ دانانێت. «کەسێکمان خۆشبوێت، واتە بەو جۆرە خۆشمان بوێت کە خودا دروستیکردوە». ئەو وادەڵێت، دەبێت چ گەورەییەک لەوەدا بێت مرۆڤمان تەنیا کاتێک خۆشبوێت کە باش و چاک و بێگوناه بێت. پاڵەوانەکانی دۆستۆفسکی زۆربەیان ژیان و شێوە و بوونی خۆیان وەک جۆرە قەدەرێکی چەسپاوی خودایی سەیردەکەن. دەبێت مرۆڤ بەوجۆرە وەربگرین و بیگرینە ئامێز بەو شێوەیەی خودا مەبەستی بووە، گەر مرۆڤ بەدکارە، بەتەنیا خۆی بەرپرس نییە لە بەدکاری خۆی... خودا و سروشت و کۆمەڵگا و ئەوانی تر هەموو بەشداران، بۆیە گەر خۆشمان دەوێت نابێت بیخەینە قەفەسی گوناهبارانەوە و دادگاییبکەین. بەڵکو وەک مەبەستێک لە مەبەستەکانی خودا لێی بروانین. جارێکی تر لە «یاداشتەکانی نوسەرێک» دا دەڵێت «مرۆڤ کە خۆی دەکاتە داوەر بەسەر ئەوانی ترەوە، دەبێت بزانێت ئەو دوا داوەر نییە، بەڵکو ئەو خۆشی تەنها گوناهبارێکە و هیچی تر، تەرازوی داد لە دەستیدا بێمانایە... گەر هاتوو لە تاکە رێگای هەڵهاتنەوە بۆ بوار و دەربازبوون نەگەڕا، کە ئەویش رێگای بەزەیی و خۆشەویستییە».

ئامانجی دۆستۆفسکی دواجار تەنیا مرۆڤ بووە. لێرەدا دەبێت بڵێم کە پێداگرتنی دۆستۆفسکی لەسەر گوناهباری مرۆڤ، شتێکە پێچەوانەی رۆحی سەردەمی خۆیەتی. لەسەردەمی ئەودا زۆربەی فەلسەفەکان باس لە پاکی مرۆڤ و خراپی کۆمەڵگا دەکەن. تۆلستۆی گەورەترین نوسەری هاوزەمانی ئەو هەر لە منداڵییەکی زووەوە رۆسۆی خوێندبووەوە و سەرسامی بوو. فەلسەفە باوەکانی تریش زۆربەی چەپگەرابوون کە پێیان لەسەر باشی مرۆڤ و خراپی سیستەم دادەگرت، بەڵام دۆستۆفسکی

دڵسۆزی ئەو تێزە مەسیحییە بوو سەبارەت بە گوناهباری مرۆڤ. هۆبزییەک نەبوو مرۆڤ بە گورگێک بزانێت کە دەبێت هەمیشە خۆمانی لێ بپارێزین، گوناهی وەک قەدەر و وەک سزا و وەک بارێکی ئینسانی سەیردەکرد. گوناهبارانی بەلاوە گرنگ بوو نەوەک قوربانیان، چونکە قوربانی کەس نییە جگە لە گوناهبار خۆی. دۆستۆفسکی تێگەیشتنی ڕۆسۆییانە بۆ مرۆڤ بە جۆرێک لە سادەیی و کاڵفامی دەزانێت. زۆر لە دۆستۆفسکی ناسان ڕایان وایە ئەمیر مشکین لە ڕۆمانی گەمژەدا نمونەی مرۆڤی ڕۆسۆییە... مرۆڤی باش و بێگوناه. گەر بزانین دۆستۆفسکی بەشێکی زۆری ڕۆمانەکەی لە جنێڤ، شاری لەدایکبوونی ڕۆسۆ و نزیک لە پەیکەرەکەی ئەوەوە نوسیوە، دەزانین کە دیالۆگ لەگەڵ ڕۆسۆدا بەشێکی گرنگی پاشخانی تێکستەکانی ئەوە، خودی ئەمیر مشکینیش منداڵی و مێرد منداڵی خۆی لە سویسرا بە مەبەستی چارەسەری بردۆتە سەر. کە دەگەڕێتەوە جگە لەوەی دەیەوێت مرۆڤێکی باش و ڕاستگۆ و بە ئەخلاق بێت، خراپە نەکات هیچ نیازێکی تری نییە. ئەمیر مشکین باشترین و پاکترین پاڵەوانی دۆستۆفسکییە. بەراورد بە ڕاسکۆلینکۆف یان پاڵەوانەکانی کارامازۆف بێگوناه و دڵساف دەردەکەوێت، بەڵام خودی ئەو پاکییە وای لێدەکات توانای ژیانی نەبێت، گەرچی گەنجێکی تا بڵێی زیرەک و ورد و دڵباشە، بەڵام هەموو وەک «گەمژە» سەیریدەکەن، بە گەمژە ناوی دەڕوات و دواجار شێت دەبێت. هەندێک دەڵێن «گەمژە» کۆمیدیترین تێکستێکە دۆستۆفسکی نوسیبێتی، بەڵام لای من یەکێکە لە هەرە تراژیدیترین ڕۆمانەکانی ئەو. مرۆڤی بێگوناه بوونەوەرێکە ناتوانێت بژی، گەمژەیەکە کەس نرخێکی بۆ دانانێت... دۆستۆفسکی لە وێنەی ئەمیر مشکیندا گاڵتە بە ڕۆسۆ دەکات. مرۆڤی ڕۆسۆیی دواجار وەک ئەمیر لە شێتی و وێرانییدا کۆتایی دێت. لای دۆستۆفسکی مرۆڤ گەر سادە و ڕاست بێت وەک مشکین یاخود ئاڵۆز و بەپلان وەک راسکۆلینکۆف هەر

لە وێرانی و ئازاردا دوای دێت. ڕاسکۆلینکۆف لە تاوان وسزادا رستەیەکی زۆر ترسناکی هەیە دەڵێت «وەک پیاوێکی زیرەک دەستمدایە ئەم کارە، بەڵام سەیرکە ئەوە نابووت و وێرانیکردم». نە سادەییەکەی مشکین و نە زیرەکییەکەی ڕاسکۆلینکۆف لە ئازار نایانپارێزێت. مرۆڤ بوونەوەرێکی مەحکومە بە ئازار... پلانەکەی ڕاسکۆلینکۆف لەوە نایپارێزێت بتوانێت لە گوناهباری خۆی ڕابکات، زیرەکی مرۆڤ بەشی ئەوە ناکات بەختەوەر بێت، وەک چۆن سادەییەکەشی بەشی ئەوە ناکات بتوانێت جێگای خۆی لە ناوەراستی ژیاندا بکاتەوە. پاڵەوانەکانی دۆستۆفسکی هەموو لە گێژاوی خۆ وێرانکردندان، مرۆڤ بە گشتی لە گێژاوی خۆوێرانکردندایە، ئەو ڕێگا جیاوازانەی دەیگرێتە بەر هەموو لە گومان و گوناهی قووڵتردا دوایی دێن. دۆستۆفسکی خۆی مەسیحی بوو، بۆ دەربازبوون لەو گێژاوە بێبنە... لەوگوناهە ئەزەلییە، ئیمان بە مەسیح یەکێک بوو لە ڕێگا تایبەتی و شەخسییەکانی ئەو. بەڵام دەبێت بڵێم کە دۆستۆفسکی مەسیحییەت تا ئەوپەڕی ڕادەکێشێت. چەمکی خۆشەویستی لای دۆستۆفسکی، چەمکێکی مەسیحییە، بەڵام بە زۆر زیادتر لەوە بارکراوە کە خودی مەسیحییەت هەڵیدەگرێت. لە مەسیحییەتدا گوناه مایەی خۆشەویستی نییە، بەڵام لای دۆستۆفسکی مرۆڤ تەنیا کاتێک دەتوانێت مرۆڤ بێت کە دان بەتاوانی خۆیدا بنێت. لای ئەو داننان بەتاواندا ساتێکی ستاتیکییە، ترۆپکی دەرکەوتنی مرۆڤبوونی پاڵەوانەکانە. لای ئەو تاوان و خۆشەویستیش لە یەک جیانابێتەوە، بایەخدانی بە مەسیحییەت لەوەوە دێت کە لە مەسیحییەتیشدا وەک لای ئەو، دوو چەمک سەنترالن... چەمکی گوناه و چەمکی خۆشەویستی. لە نامەیەکیدا کە چەند هەفتەیەک دوای بەربوونی لە زیندان و لە شوباتی ساڵی ١٨٥٤دا نوسیویێتی لە کاتێکدا باس لە کۆمەکی ئینجیل دەکات بۆی لە چوار ساڵی زیندانی سیبریادا، دەڵێت«ئەگەر وابێت حەقیقەت بکەوێتە دەرەوەی مەسیح و لێکدووربن، وام پێخۆشە

لـە کەنـاری مەسـیحدا بمێنمـەوە، نـەوەک لـە پـاڵ حەقیقەتـدا». مەسـیح لای ئـەو سـەمبولی هەڵگرتنـی گوناهـ و خۆشەویسـتییە... حەقیقـەت لـە بەرامبـەر خۆشەویستی و بەزەییدا دەبێـت چـی بێـت و چ نرخێکی هەبێـت؟. لەڕاستیدا گـەر زۆر وردبینـەوە دەتوانیـن بڵێیـن مەسیح خـۆی لـە پاڵەوانێـک لەپاڵەوانەکانـی دستۆفسـکی دەچێـت. لایەنگـری بـۆ مەسـیحییەت لـەوەوە دێـت کـە مەسـیح خـۆی بـاری هەمـوو گوناهەکانـی مـرۆڤ هەڵدەگرێـت. ئـەو قـەرزاداری دیـوە هیومانیسـتییەکەی مەسـیحییەتە. گوناهـ و لێبـوردن، تـاوان و بەزەیـی ئـەوە سـەر دێـڕە گەورەکانـی تێڕوانینـی دۆستۆفسـکییە، نـەوەک تـاوان و سـزا. سـزا پێشـوەخت لـە ناوخـودی تاواندایـە... گوناهبـار هیـچ سزایەکی توندتـری بـۆ نایـەت لـەو ئازارەی خـۆی دەیبینێـت و دەیچێژێـت... لێرەوە تـرس لـە دۆستۆفسـکی، ترسـە لـە تێکچوونـی تێڕوانینمـان بـۆ خـودی خۆمـان و بـۆ ئەوانـی تـر. دۆستۆفسـکی لـەوە دەمانپارێزێـت تەسلیمی پاکێتی درۆزنـی خۆمـان بیـن و بـە نـاوی چاکـە و مۆراڵـی بـەرز و عەدالەتـەوە ببیـن بـە داوەر بەسـەر ئەوانـی تـرەوە... بـەڵام کـێ لـە ئێمـە جورئەتـدەکات بڵێـت، لـە نێـوان مـن و خراپتریـن گوناهبـاردا جیاوازییـەک نییـە؟ کـێ هەیـە خـۆی بخاتـە ئاسـتی تاوانبـارە گـەورەکان و نەترسـێت؟ کـێ هەیـە لەمـڕەوەوە سـڵ لـە دۆستۆفسـکی نەکاتـەوە؟ کـێ هەیـە بتوانێـت ئەوانـی دی بـە هەمـوو گوناهەکانیانـەوە خۆشـبوێت؟ کـێ هەیـە هێنـدە پاکبێتـەوە گوێنەداتـە چییەتـی مـرۆڤ و تەنهـا بـەو شـێوەیە خۆشـیبوێت کـە هەیـە و دروسـتبووە؟ دۆستۆفسـکی دەمانخاتـە بـەر ئـەو پەیامـە سـەختانەی کـە بـە ئێمـەی مـرۆڤ هەڵناگیرێـت... خوێندنـەوەی دۆستۆفسـکی تەنیـا خوێندنەوەی ڕۆماننوسـێک نییـە مرۆڤمـان بەجوانـی بـۆ وەسـفدەکات، بەڵکـو وانەیەکـی سـەختی ئەخلاقییـە کەوامـان لێـدەکات بـۆ ئەبـەد نائـارام بیـن و خـودی خۆمـان بخەینـە ژێـر پرسـیارەوە. کارێـک تەنیـا هەڵاوێردەیەکـی مـەزن و کـەم لـە مرۆڤـەکان دەتوانـن پێیهەسـتن.

# پۆل ڤالێری

## ١

لە یەکێک لە وتارەکانیدا دەنوسێت «ئیلام، نەینەوا، بابل، ناوگەلێکی بە شکۆن، بەلاّم لەناوچوونی ئەم جیهانانە بۆ ئێمە، وەک بوونیان هیچ مانایەکیان نەماوە. ئەمرۆش ناوی وەک فەرەنسا، ئینگلتەرە، ڕوسیا دەشێت بە شکۆ و زرینگەدار بن... بەلاّم دەبینین خەرەندی مێژوو جێگای هەمووانی تێدا دەبێتەوە، کولتوورەکانیش وەک تاکەکەسان دەشێت بکەون و بمرن». ئەوە رستەکانی ڤالێرییە لە وتارێکیدا بە ناونیشانی «قەیرانی ڕۆح» کە ساڵی ١٩١٩نوسیویێتی... قسەکانی یەکێک لە هێمادارترین شاعیرانی دونیا. لە سەردەمێکدا جەنگ ئەورووپای خواردبوو، بڕوا بە جوانی و نوسین لە نزمترین ئاستدا بوو، سەردەمێک تەنیا جۆرە فۆرم و ستایلێکی شیعری تایبەتی بە ڤالێری نەبەخشی، بەڵکو جۆرە بەدبینییەکی قووڵیشی تیا چاند، بووە بناغەیەکی گەورەی هەموو تێڕوانینەکانی. بەشێکی گرنگی ژیانی ڤالێری دەکەوێتە ناو ئەو هەرەسە سامناکەوە، ناو سەردەمی جەنگە کوشندەکان، گەرچی ڕۆحێکی ناوەکی و ناخنشین بوو، بەلاّم لە بەختیدا بوو دوو جەنگی جیهانی ببینێت. ئەو ڕستەیەی «خەرەندی مێژوو جێگای هەمووانی تێدا دەبێتەوە» ئاماژەیەکی قووڵە بۆ بڕواکانی ئەم مرۆڤە لاوازە چاوشینە، کە هەندێک بە باشترین شاعیری سەدەی بیستی دەزانن. پرسیارێک بۆ من لە ناسینی

ڤالێرییەوە جێماوە ئەوەیە : بۆ ئەم پیاوە بەجۆرێکی بەرنامەدار، بە کینەیەکی قووڵ و بێزێکی گەورەوە دژی «ئیحساسات» بووە، واتە دژی نیگای عاتیفیانە و سۆزاوی بووە بۆ شتەکان، بۆ دژی دیدگا و هەستی تایبەتی و شەخسی بووە، وەک لای کاراکتەریی «مۆنسیۆر تێستە» دەیبینین، کاراکتەری سەرەکی یەکێک لە هەرە گرنگترین بەرهەمەکانی؟.
ڤالێری تەنیا لە شیعر و ئەدەبیاتدا دژی «هەستگەرایی» و عاتیفە جۆشدان نەبوو، بەڵکو لە سیاسەتیشدا بۆ جەوهەرێک دەگەڕا بەرهەمی تێڕوانینی گروپێک یان فەردێک نەبێت، بەڵکو بەرهەمی تێفکرینی ورد بێت. دەربارەی مرۆڤ بێباک نەبوو، بەڵام ئەوەی وێنەیەکی مرۆڤ بکێشین بەرهەمی جۆرە هەستێکی سیاسی و عاتیفی دیاریکراو بێت، بەرهەمی تێڕوانینێکی سنووردار بێت، دەیترساند و نەفرەتی لێدەکرد. لە وتارێکیدا بە ڕوونی دەنوسێت «چیمان دەوێت و دەبێت چیمان بوێت؟ ئەم پرسیارە داوای بڕیارێکمان لێدەکات، خواستێتی لایەنێک بگرین. مەبەستی پشت پرسیارەکە ئەوەیە، وێنەیەکی مرۆڤ بکێشین و لە ژینگەیەکدا جێگای بۆ بکەینەوە، وێنەیەک بتوانێت لەو ژینگەیەدا بژی. ئەم وێنەیەی مرۆڤ دەبێت بەرهەمی چاوەدێری ورد بێت، نەوەک هەست و ئیحساساتی ئەم یان ئەویدی. بەتایبەت نابێت بەرهەمی هیوا و ئومێدە سیاسییەکان بێت».

ڕەنگە لەو برگەیەوە جوانتر لە «پۆل ڤالێری» تێبگەین... ئەو لەسەردەمێکدا ژیاوە کە عاتیفەی سیاسی مرۆڤایەتی بەرەو جەنگ و وێرانکاری گەورە کێشاوە، ئەوەی هەر ئایدۆلۆژیایە بەویستی خۆی وێنەی مرۆڤ و حەقیقەت و پاشەڕۆژ دەکێشێت و دەیەوێت بەسەر هەمووانذا بیسەپێنێت بەشێکی گرنگی ڕۆحی ئەو سەردەمە بووە. لێرەوە گومانی گەورەی لە هەموو شتێک، بێزی لە ئیحساسات، ترسی لە هەموو کارێکی مرۆڤ، ڕیشەیەکی قووڵی لەو فەزا ترسناک و تاریکەی

ئەورووپـادا هەیـە، لـە سـەردەمی گواسـتنەوەدا لـە ئومێدە گەورەکانی سـەدەی نـۆزدەوە بـۆ جەنگـە خوێناوییەکانـی سـەدەی بیسـت. گومانـی ڤالێـری لـە سـۆز و عاتیفـەی مـرۆڤ، گومانێکـی دەرونـی نییـە کـە بەرهەمـی ڕۆحێـک بێـت، کینەیەکـی شـاردراوەی بەرامبـەر مـرۆڤ هەبێـت، بەڵکـو گومانێکـی عەقڵییـە و لـە خۆشەویستی و بایەخـی قووڵییـەوە بـۆ مـرۆڤ هاتـووە. هـەر خـۆی لـەو وتـارەی پێشـوودا دەربـارەی قەیرانـی ڕۆح دەنوسـێت «بەچـاوی خۆمـان بینیمـان، چـۆن دڵسـۆزانەترین کار، بەپلانترین و باشـترین شـێوەی پـەروەردە، چاکتریـن و جیدیتریـن ڕەنـج، دەشـێت بکەونـە خزمەتـی دزێوتریـن و تاریکتریـن خواسـتەوە».

چاوپێکەوتنێکـی «ئەندریەپارینـۆد» ــم لەبەردەسـتدایە لەگـەڵ باوکـی سـوریالیزم «ئەندریـە بریتـون»دا ئەنجامیـداوە. پارینـۆد دەپرسـێت «حەزدەکـەم بزانـم کەسـێکت لەبەرچـاوە، لـەم سـەردەمی گواسـتنەوە و ئاڵوگۆڕەدا لـە سـەدەیەکەوە بـۆ سـەدەیەکی دی، بتوانێـت ئـەم دوو قۆناغـە پێکـەوە گرێبـدات؟». بریتـۆن بـێ هیـچ گومـان و دوودڵییەک دەڵێـت «بەڵێ، بەدڵنیاییـەوە، ئەوکەسـە پـۆل ڤالێرییـە». بریتـۆن لەسـەر هەقـە، ڤالێـری بـە میتـۆدی، بـە ژیانـی، بـە ترسـەکانی، بـە بێدەنگییەکـەی، ئاوێتەیەکـی ئاڵـۆز و نـاوازەی دروسـتکردوە کـە ئاوێنـەی تێفکرینـی ئـەو دوو سـەردەمەیە.

بـە حوکمـی سروشـت و بـە هـۆی ڕۆحـی وردەکارییـەوە، لـە زۆر قۆناغـی ژیانیـدا گۆشـەگیری و تەنهایـی و بێدەنگـی هەڵبـژاردوە، بەجۆرێـک لـە هەنـدێ کاتـدا وەک مـردوو حیسـابیان بـۆ کـردوە، بـەڵام لـە هەمـوو سـەردەمەکاندا کاریگەریـی قووڵـی لەسـەر ئەوانـی دی بـووە. بـۆ نمونـە سـارتەر کـە نوێنەری نەوەیەکـی دی بـوو لـە ڕۆشـنبیران و بیرمەندانـی فەرەنسـی، ڤالێـری وەک زیندوویەکـی لـە کارکەوتـوو تەماشـادەکرد، بـەڵام وەک «کارل بوشـنەر و ئێـکارت کویـن» لـە کتێبەکەیانـدا «نزیکبوونەوەیـەک لـە ڤالێـری» دەڵێـن، فیکـری ئەدەبـی سـارتەر لـە زۆر خـاڵ و بەتایبـەت لـە مەسـەلەی جیـاوازی

نێوان شیعر و پەخشاندا هیچ نییە جگە لە دیالۆگێکی ناوەکی قووڵ لەگەڵ پۆل ڤالێری دا. زۆرجار ئەو بێدەنگییەی وایکردوە سەردەمانێکی درێژ لە نوسین و بڵاوکردنەوە دووربکەوێتەوە. ئەندریە جید «کە پێدەچێت لەگەڵ مالارمییەدا دوو تاکە هاوڕێی زۆر نزیکی بووبن» لە وتارێکی زۆر جواندا باس لەوە دەکات، چۆن قەپۆز زللەکانی ناوەندی ئەدەبی هیچ کات لەپاشەکشە و بێدەنگی ڤالێری تێنەگەیشتوون. جید دەڵێت لەو ماوەیەدا کە ڤالێری بێدەنگ بوو، بەردەوام تانەی ئەوەیان لێدەدایـن و دەیانگووت، بڕوانن ئەم ئاغای ڤالێرییەی ئەوەندە باستاندەکرد و گەورە دەتان نرخاند، ئەو کەسە گەورەیەش نەبوو، ئەوە نوقمی بێدەنگییەکی قووڵ بووە و هیچی پێ نەماوە. بەڵام بێدەنگی ڤالێری، بێدەنگی کەسێکی وردەکار و گومانکار بوو... دوو سیفەت کەمجار بەوجۆرە چڕ لە مرۆڤێکدا پێکەوە کۆدەبنەوە. ڤالێری زیاد لە پازدە ساڵ هیچ بڵاوناکاتەوە، ئاخۆ هۆی دوورکەوتنەوەی لە ئەدەبیات ئەو خولیا قووڵەی بوو بۆ ماتماتیک؟ لەوانەیە... دواجار وردی و بێهەڵەیی ماتماتیک دونیایەک بوو، بۆ کەسێکی وردەکاری وەک ڤالێری سەرنجڕاکێش. ئەندریە جید دەڵێت زۆرجار بە سەعات منی دادەنا و هاوکێشەی ماتماتیکی بۆ شیدەکردمەوە، گەرچی دەیزانی من لەو بوارەدا کوێر و نەزانی تەواوم و لە یەک وشەشی تێناگەم... دەڵێن لە وانەکانیشیدا بەردەوام وەهابووە وەک ئەوەی لە دیالۆگێکی تایبەتدا بێت لەگەڵ خۆیدا و بۆی گرنگ نەبووە ئاخۆ بەرامبەرەکەی تەواو تێگەیشتووە یان نا. پێدەچێت زیاتر ئەوەی بۆ گرنگ بووبێت کە هەڵە نەکات، لە پێناوی ئەوانی دیدا و هیچ کات لە قووڵی و وردەکاری لانەدات. ئەو کوڕی سەردەمێک بووە پڕبووە لە حوکمی خێرا، لە دەرەنجامگیری پەلە کە کاری کوشندەیان لێ کەوتۆتەوە، لەبەر ئەوە خۆی نەداوەتە دەست ئەو ڕۆحە و باجێکی گەورەشی داوە تا تەسلیمی نەبێت. ئەندریە بریتۆن لەو چاوپێکەوتنەیەدا

بەراوردێکی جوان لە نێوان بێدەنگی ڕامبۆ و بێدەنگی ڤالێریدا دەکات. خودی ئەو بێدەنگییە درێژە، وەک بێدەنگییەکەی ڕامبۆ بە بەشێک لەسیحر و کاراکتەری ڤالێری دەزانێت، دەڵێت دوای قۆناغێکی گەلێک جوان و سەرسوڕهێنەری نوسین، هەردووکیان دەچنە بێدەنگییەکی قووڵەوە. «وەک بەرهەمەکان وەها لە ترۆپکدا بن، خاوەنەکانیان توردەن و بیخەنە لاوە». بریتۆن دەڵێت، هەڵبەت بەشێکی زۆری سیحری ڕامبۆ ئەمڕۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئەفسونی ئەو بێدەنگییەی، یان سیحری ئەوەی لە هێرار چی کردوە، بەڵام ڕامبۆ دەمرێت و ژیان دەرفەتی دەست پێکردنەوەیەکی دیکەی پێنادات. بەڵام ڤالێری دوای ئەو بێدەنگییە درێژە دەگەڕێتەوە و دەبێتەوە بەیەکێک لە کاراکتەرە هەرە چالاکەکانی فەرهەنگی ئەورووپی. بەمانایەکی تر ڤالێری ئەزموونی ڕامبۆ دووبارەدەکاتەوە و دەگاتە ئەو دیویشی. هەڵبەت گەڕانەوەکەی هەموو کەس دڵشاد ناکات، بۆ نمونە خودی ئەندریە بریتۆن بە گومانەوە سەیری کارەکانی دواتری ڤالێری دەکات، هەتا لە جێگایەکدا وشەی خیانەت بە کاردەهێنێت، وەک ئەو کارە شیعرییانەی لە قۆناغی دووەمدا نوسیوینی شتێک لە تیشک و بریسکەی کارە کۆنەکانی کەمکردبێتەوە.

## ٢

ڤالێری خۆی پیاوێکی لاواز و باڵا مامناوەندی بوو، فرانسواز ڤالێری کوڕی، وتارێکی گەلێک جوانی لەسەر باوکی نوسیوە و ورد و کورت تیشکی ناوەتە سەر کاراکتەری و دەڵێت، باوکم هەرگیز ژوورێکی کارکردن و نوسینی گەورە و گونجاوی نەبوو، هەمیشەش خەونی بە ژوورێکی گەورەوە بینیوە، بتوانێت شتەکانی خۆی بەڕێکی لە ناویدا ڕیزبکات. بەڵام پیاوێک بوو بەو دونیا داخراوەی خۆی ڕازیبوو، گەرچی بەردەوام لەوە دەترسا ڕۆژێک بێت، چیتر نەتوانێت بیپارێزێت یاخود نەداری

و دەستکورتی گورزی لێبوەشێنن و تووشی نەهامەتی بکەن. ئەندریە جیدی هاورێی دەڵێت لە ژوورەکەیدا دروشمێکی هەڵواسیبوو «لە بیرت نەچێت بەرامبەر خۆت بەدگومان بیت». ئەم ڕستەیەی ڕستەیەکی ناو تێکستی «مۆنسیۆر تێستە» ـم بەیادا دەهێنێتەوە، کە بڕوای وایە «مرۆڤ دەبێت بە هەموو چەکێک دژی خۆی بێتە مەیدان». ڤالێری لەوکەسانە بوو کە بەجۆرێک گومانکار بوو، ئەستەم بوو بگاتە یەقین و سەخت بوو دڵنیاییەک بدۆزێتەوە بشێت بەسەریدا بخەوێت، قەناعەتی بە ژینگەیەکی بچوک بۆ ژیان، هاوشانی قەناعەتێکی ڕۆشنفیکرانە نەبوو بە سنوورێک بۆ گومان. بەدگومانی لە هەموو شتێک، یەکێکبوو لەسیفەتە سەرەکییەکانی کاراکتەری پۆل ڤالێری، لەسەردەمێکدا دڵنیایی و نەبوونی گومان مرۆڤیان کردبوو بە دڕندە و شەڕکەرێکی جانەوەرئاسا. گومانی ڤالێری تەنیا لە شتە شەخسی و تایبەتییەکانی مرۆڤ نەبوو، بەڵکو لە خودی وەزیفەی ڕۆحیش بوو لەڕەوتی شارستانی مرۆڤدا. ئاخۆ شتێک هەیە مرۆڤ بوەستێنێت و خاڵێک هەیە گەشە و پەرەسەندنی ئەم ڕۆحە تێیدا بگاتە مانای خۆی و پێیوابێت ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بوەستێت و بڵێت ئیدی تا ئێرە بەسە و با سەرقاڵی پاراستنی ئەو دەستکەوتانەبم کە هەمە. ئاخۆ ڕۆح دەوەستێت؟ ئەوە پرسیاری هەرە گەورەی ڤالێری بوو هەم لە شارستانییەت و هەم لەخودی ڕۆح. گومان لەوەدا نییە کە وەڵامی ڤالێری وەک وەڵامی بیریارە ڕەشبینەکان بە نا بوو، ئەو لە جەوهەردا باوەڕی وابوو «کە مرۆڤ تەنیا بە ڕووکەش مرۆڤە»، هیوایەکیش نییە بیسەلمێنێت ئەم بوونەوەرە بەرەو خەرەند ناڕوات.

مارسیل رایمۆند لەوتارێکیدا بەناوی «پۆل ڤالێری و دوودڵی ڕۆح» ڕستەیەکی بۆدلێرمان بەیادا دەهێنێتەوە «جیهان بەرەو کۆتایی دەڕوات، تەنیا هۆیەک وای کردوە تا ئێستا خۆی بگرێت، ئەوەیە هێشتا ماوە». ئەمەچ مانایەکی هەیە؟ بۆ بۆدلێر وادەڵێت؟ بۆدلێر ڕای وایە جیهان و

شارستانییەت ڕەهەندە ڕۆحییەکەی خۆیان لە دەستداوە و تەنها شتێک هەبێت، ئەوەیە بوونێکی مەتریالی و بێڕۆح درێژەپێدەدەن، بوونێک تەنیا وەک سزا و حوکمێکی بێهۆ دەبێت جێبەجێیبکەین و ژانی مانەوەی بچێژین. واتە جیهان بەمانا ڕۆحییەکەی بەرەو مردن دەڕوات، بەلام وەک مەتریالێکی بێڕۆح و بوونێکی بێمانا درێژە بەخۆی دەدات. پۆل ڤالێری تەواوی دیمەنەکە بەجۆرێکی تر دەبینێت، ڕایمۆند ڕستەیەکی ڤالێری دەگوازێتەوە کە گەلێک سەرنجڕاکێشە و تەعبیر لە دوودڵییەک دەکات قووڵتره لەدوودڵی و ڕەشبینی ئاسایی، ڤالێری دەنوسێت «لەوانەیە ڕۆح ئەو کەرەستەیە بێت کە گەردون دروستیکردوە تا خێرا کۆتایی بەخۆی بهێنێت». لای ڤالێری ڕۆح کەرەستەی مانەوە و بەردەوامی و جاویدانەگی نییە، بەڵکو هۆیەکە لەو هۆیانەی لە ڕێگایەوە گەردون مردنێکی خێراتر، مردنێکی هوشیار بەخۆی دەبەخشێت. بە واتایەکی تر مرۆڤ لەم ڕوانینەدا ئەو دەستکردەی گەردونە کە سازاندوێتی تا مەرگی خۆی پێ خێراتربکات. بەلام ئەو پرۆسێسە چییە ڕۆح دەتوانێت لە ڕێگایەوە گەردون بەرەو کاولی و نەهامەتی ببات؟. ڤالێری ڕای وایە... ئەم دۆخەی کە ئێستا مرۆڤ خۆی تێهاویشتووە و چەندین سەدەیە لەسەری دەڕوات و بووە بەڕەوتێک کە وەستانی نییە، جەوهەرەکەی لەوەدا کورتدەبێتەوە کە مرۆڤ لە هەوڵێکی بێوچاندایە بۆئەوەی یاسا سروشتییەکان، ئەو یاسایانەی کە ملیۆنەها ساڵە گەردون لەسەری دەڕۆن، بە کۆمەڵێ ڕێسا و ڕێکخستنی مرۆڤانە بگۆڕێت... ڕۆح چیتر یاسا سروشتی و مەتریالییەکانی قەبووڵ نییە، خوازیارە بە یاساگەلێکی تایبەت بە خۆی جێگایان بگرێتەوە. هەرخودی ئەم هەوڵەشە ڤالێری بە هەوڵێکی گەردون بۆ خودکوژی سەیریدەکات، گەردون لە ڕێگای شێتێتی ڕۆحی مرۆڤەوە کەرەستەیەکی دروستکردوە کۆمەکیدەکات خۆی لەناو ببات، بە کورتی بەبڕوای ڤالێری مرۆڤ ئەو ژەهرەیە کە دونیا

بە نیازی مردن دەیخواتەوە. بەڵام وەک «مارسیل رایمۆند» دەڵێت، پرسیارێک لێرەدا دێتە پێشێ ئەوەیە: چی سیفەتێکی ڕۆحە ئەو هێزەی پێدەبەخشێت وەها دونیا رووەو کۆتایی بەرێت؟. ڤالێریێ دەڵێت گەورەترین سیفەتێک هێز دەبەخشێتە ڕۆح «ئاڵوگۆڕکردنە». مرۆڤ دەتوانێت هەموو شتێکی مەتریالی و ڕۆحی بگۆڕێت، واتە ڕۆح هەم شت دەگۆڕێت و هەم خۆشی دەگۆڕێت. بەڵام ڤالێری دەپرسێت ئاخۆ ئەم سیفەتە دواجار لەخزمەتی مرۆڤدایە یان دژێتی؟. هەڵبەت ڤالێری ڤانەتیکیکی نەیار بە مرۆڤ نییە، بەڵکو خۆی ڕۆحسازە... خۆی جارێک دەنوسێت «خەڵکانی تر کتێب دروستدەکەن، من ڕۆحی خۆم»، ئەو دەزانێت عەقڵ و خەیاڵی ئادەمیزاد شتگەلی گرنگیان لێوەشاوەتەوە، بەڵام کاتێک دێتە سەر ئەو دیمەنی جەنگ و وێرانکاریی و دڵڕەقییەی باڵی بەسەر دونیادا کێشاوە، دەپرسێت، ئاخۆ دوا مانا بوونی هەیە؟ ئاخۆ جێگایەک هەیە مرۆڤ تێیدا بوەستێت؟ ڕۆح تاکەی و تا کوێ دەڕوات؟. ڤالێری وادەبینێت کە ڕۆح سنووری نییە، خێرایی و جوڵان و گۆڕان لە سیفەتە سەرەکییەکانی ئەون. ئاستەنگێک نییە کە ڕۆح بۆ خۆی دابنێت، لێرەوە تا سەر لێواری خەرەند و تا دەگاتە کاولبوون بێوەستان خەریکی گۆڕینی خۆی و دونیا دەبێت. کێشەی سەرەکی لای ڤالێری ئەوەیە «خود» بەردەوام دەیەوێت «بوون» خوداوییکات، واتە بیخاتە ژێر ڕکێفی خەیاڵ و خولیای خۆیەوە. بەڵام ئەم گومانە لەڕۆح هاوشانیشە بە گومانێکی قووڵتر لە خودی مرۆڤ. لای ڤالێری مرۆڤ هەر بەسروشت خودپەسەندە و بەرامبەر ئەوانی تر کینەی هەیە. ڤالێری دەنوسێت «مرۆڤ بۆ ئەوانیدی تەنیا دیوە خراپەکەی خۆی بەیاندەکات». ئەو وادەبینێت کێشەی گەورەی ئینسان لەو شتانەدا نییە کە خاوەنداریانە، بەڵکو ئەو شتانەیە کە نییەتی، لە بەرئەوە هەمیشە لە ژێر باری نوقسانییەکی ئەبەدیدا دەناڵێت و گەیشتنی بە ئارامی

مەحاڵ دێتە بەرچاو. بەبڕوای ئەو بۆ ئەوەی بەسەر دیوە کوشندەکەی ڕۆحدا سەرکەوین، پێویستیمان بە دەسەڵاتێک هەیە، بەر بەو ڕەوتە نەوەستاوەی مرۆڤ بگرێت کە هەموو نیشانەکان ئاماژە بەوەدەکەن ڕەوتێکە بەرەو کارەسات... بەڵام دەسەڵات شتێکە هێندەی کەوتە دەست مرۆڤ، خراپ بەکاریدەهێنێت. بەکارهێنانی خراپی دەسەڵات لە سیفەتە سەرەکییەکانی ڕۆحە لای ڤالێری. بەرای ئەویش فەرامۆشکردنی مرۆڤ بۆ زیرەکی خۆی ڕۆڵێکی گرنگ لەم کارەساتەدا هەیە، لێرەوە هەتا لە شیعردا باوەری بەوردی و سیستم و ڕێکخستن بوو نەوەک بەعاتیفە. ئەو بیروبۆچوونانەی بەرەو ناوەوەی خۆی پاڵیان پێوەنا، بەرەو گۆشەگیری. کوڕەکەی دەنوسێت «پاشەکشەی باوکم لە ژیان... تەواو خودویستانە بوو. نەخوازی و دوورەپەرێزی کردبووە دیسپلین، هەڵهاتنی کردبووە ستراتیژی خۆی. توێکڵ و سەدەفە ڕەقەکەی ئەو لە ناوەوە بوو، لە ناخدا بوو نەوەک لە دەرەوە. ئەو زۆر بەدەستییەوە دەیناڵاند، وەک یەکێک بە دەست تەنێکی نامۆ وە بناڵێنێت»

بەڵام ئەندریە جید لەبەشێکی وتارەکەیدا لە هەمووان ڕوونتر وەسفیدەکات. «ڤالێری هەردەم بێبڕوابوو، شتگەلی زانراو یان شتگەلێک کە بەوردی پشکنینیان بۆ نەکرابوو ڕەتیدەکردنەوە، گومانکار بوو - هەم دوودڵ و هەم پشکنەر -. چەپڵە و ئافەرینی بۆ گرنگ نەبوو، بۆ هاوسۆزی نەدەگەڕا و بۆی گرنگ نەبوو لەگەڵیدا هاوڕا بیت یاخود نا، پێدەچوو لە هەموو لاوازییەکانی مرۆڤ پاکبووبێتەوە... هەرشتێک لە گەڕان وپشکنیندا ببایە بەڕێگری پێیدەگووت نا»

بەڵام وەسفی ت. س. ئالیۆت بۆ ڤالێری لە هەمووان قەشەنگتر دەمێنێتەوە «ڕۆشنفیکرێک لە هەرە باڵاترین پلەکانی زیرەکیدا، زیرەکییەک کە دەرگا لەسەر قەناعەت و دوابڕوا ناکاتەوە، زیرەکییەک بێئۆقرەییەکی قووڵ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. هەندێک بە فەیلەسوف

ناویاندەبرد، بەڵام فەیلەسوف بە مانا باوەکەی، کەسێکە کە سیستمێکی فەلسەفی دادەڕێژێت یان نوێنەرایەتی سیستمێکی فەلسەفی دەکات. بەم مانایە دەتوانین بڵێین: ڤالێری لەوە زیرەکتربوو ببێتە فەیلەسوف»

گومانکاری وڕەشبینییەکەی کردیان بە گەڕۆکێکی هەمیشەیی. خۆی دەیگووت «بیریار ئەو کەسەیە کە سەر لە نوێ بیر لەشتەکان دەکاتەوە، پێشی وایە ئەوەی لەوەوبەر بیری لێکراوەتەوە، هیچ کات بەتەواوی بیری لێ نەکراوەتەوە» ... ئەم پێناسەیەش ڕاستترین و کورتترین پێناسەیە بۆ خودی پۆل ڤالێری، کە بەردەوام خەریکی دووبارە تێفکرینەوە بوو لەو شتانەی خەڵکی وایاندەزانی قووڵ بیریان لێ کراوەتەوە.

# ماستەر ئێکهارت

لەساڵی ١٣٢٥دا لە شاری کۆلن، یەکێک لە دادگاییە گرنگەکانی مێژووی مەسیحییەت بەڕێوەچوو، ماستەر ئێکهارت، کە خۆی ڕەبەنێکی پلە باڵای نێو دۆمێنیکانەکان بوو، بە تۆمەتی نەبوونی ئیمانی ڕاست و دروست و هەرتەقەبازی درا بوو بە دادگا و کەوتبووە ژێر ڕەحمەتی لیژنەکانی پشکنینی ئیمانەوە. تا ئەودەمە ڕووی نەدابوو کە تیۆلۆگێکی گەورە و فەیلەسوفێکی ئیمانداری ناسراو، کە بەهۆی ئیمانی بەهێزییەوە، ڕێگای درابوو لە کلێسەکانی ژنان و لە ناو ڕەبەنخانووناندا کاری ئیرشاد بکات، بە تۆمەتی لادان و هەرتەقە باربکرێت. ئێکهارت کە بە داڕێژەری زمانی فەلسەفەی ئەڵمانی حیسابدەکرێت، دەبوو بیسەلمێنێت کە قسە و نوسینەکانی لادانێکیان لە ڕێگای خودا تێدا نییە. لەوێ دوو لیستی درێژ ئامادەکرابوون، پڕ لەو ڕستە و ئاماژانەی دەکرا جێگای گومانی پیاوانی سوننەتی و ئیمانی باوی نێو دینداران بن. نیکۆلاوس فۆن شتراسبورگ کە قەشەیەکی دۆمێنیکی باڵا بوو، سەرەتا سەرۆکایەتی لیژنەی پشکنینەکەی لەئەستۆ بوو، ئەو لە نێو ڕستە و گوفتارەکانی ئێکهارتدا شتێکی ئەوتۆی نەدۆزییەوە شایستەی ئەوەبێت، تۆمەتی کوفر و هەرتەقەبازی هەڵگرێت، لەدەرەنجامی ئەو هەڵوێستگیرییەیدا نەیارانی ئێکهارت و شکایەتکەران خودی نیکۆلاوسیشان خستە بەر تۆمەتی هەرتەقەبازی. لەساڵی ١٣٢٦ و ١٣٢٧ دا دادگایی ئیکهارت درێژەی هەبوو، لە بەرئەوەی دادەوەرانی

ناوخۆ نەیاندەتوانی بگەنە بڕیارێک، کێشەکە بەرزکرایەوە بۆ ئەوەی پاپا خۆی بڕیاری لەسەر بدات. کۆمۆیسیۆنی پشکنینی پاپایی لە کۆی ۱٥٠ ڕستە کە گومانی کوفرو لادانیان لێدەکرا، تەنیا ۲۸ گووتەی هێشتەوە. بەوەدا بڕێکی زۆر لە ڕەبەن و پلەدارە دۆمێنیکانەکان لە پشتی ئێکهارت بوون، تۆمەتی «هەرتەقەبازی سەرسەخت» کە دەکرا ئێکهارت ڕەوانەی مەرگبکات، لادراو و گۆڕدرا بۆ تۆمەتی هەڵەی هەرتەقیانە، ئێکهارتیش ئەوەی سەلماند کە دەشێت لە بنەما تیۆلۆگییەکانی خۆیدا هەڵەیکردبێت، بەڵام هیچ کات نیازێکی لادەرانە و خواستی کافرانە لە ڕوانینیدا نەبووە. بێئەوەی لە بۆچوونەکانی خۆی پاشگەزبێتەوە، ئەوەی ڕاگەیاند کە هیچ خواستێکی هەرتەقی لە پشت تێڕوانینی ئەوەوە نییە، بەبێ بوونی خواست و نیازی وەهاش، تۆمەتی هەرتەقەبازی بەتاڵە و ناسەلمێت. بەڵام کۆمیسیۆن کە سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو ۲۸ ڕستەیە کوفری تەواوە درێژەی بە دادگاییەکەدا، تا ۲۸ ی کانونی دووەمی ۱۳۲۸ کە ئێکهارت کۆچی دواییکرد. دادگایی ئێکهارت دوای مردنیشی هەر بەردەوام بوو، لەساڵی ۱۳۲۹ دا پاپا خۆی بە حوکمی ئەوەی گوایە ئێکهارت لە بۆچوونەکانی پاشگەزبۆتەوە، خۆی لەوە پارست تۆمەتی هەرتەقەبازی بنێتە پاڵ تەواوی دونیابینی ئیکهارت و کۆتایی بەدادگاییەکە هێنا.

بیروبۆچوونەکانی ئێکهارت نزیکییەکی زۆری لەگەڵ بۆچوونی سۆفییە خۆرهەڵاتییەکاندا هەیە، بەتایبەت «مەنسوری حەلاج»، کە نزیکی ٤٠٠ ساڵ پێش ئێکهارت ژیاوە. لای ئێکهارت مەرجی سەرەکی بۆ دۆزینەوەی خودا بە ڕەتکردنەوەی خود و ڕەتکردنەوەی دونیادا دەڕوات. گەر فەلسەفەی ڕەسمی دین لەسەر جیاکردنەوەی تەواوی مەملەکەتی خودا لە مەملەکەتی ئینسان بەندبێت، گەر خودا و مرۆڤ دوو چەمک بن قەبووڵی لەیەکدان و یەکخستن نەکەن، ئەوا بە پێچەوانەی جیهانبینی دینی تەقلیدییەوە، نزیککردنەوەی خودا لە مرۆڤ و ڕوانین لە مرۆڤ وەک

خودا، بەشێکی گرنگی هەندێک لە ڕوانینی مستیک و سۆفییە گەورەکانە. گومان لەوەدا نییە کە بۆچوونی ئیکهارت بۆچوونێکی حلولییە. خودا لای ئیکهارت دروستکەر و سەرچاوەی هەموو شتێک نییە، بەڵکو ڕوناکی ناو هەموو ڕوناکییەک و جەوهەری ناو هەموو جەوهەرێک و مانای ناو هەموو مانایەکە، بە واتایەکی تر خودا لای ئێکهارت تەنیا دروستکەری خەلق نییە، بەڵکو خودی خەلقە، واتە بوون و خودا دوو جەمسەری لەیەک دوور و لەیەک جودا نین، بەڵکو بوون خودایە و خودا بوونە. یەکێک لەو ڕستانەی کە ئێکهارتی لەسەر دادگاییکرا. ئەوەیە کە دەڵێت «هەموو شتەکان خودان». هەڵبەت ئەوە بەو مانایەی کە پرۆسەی خەلق شتێک نییە جارێک لە ڕابوردوودا ڕوویدابێت و ئیتر کۆتایی هاتبێت، بەڵکو بەو مانایەی کە خەلیقەت و دونیا شتێکە بەردەوام دروستدەکرێتەوە، شتەکان بوونگەلێکیان نییە گەر خودا دەستیان لێبەربدات بمێنن و نەکەونەوە ناو دەریای عەدەم و نەبوونەوە، لێرەوە گەر بڵێین دونیا بۆیە بەردەوامە، جیهان بۆیە هەیە، چونکە شتەکان دەتوانن سەربەخۆییەکی خۆیان هەبێت و بەبێ خوداش، بەبێ دەستی خالقیش دەشێت هەر بەردەوامبن، ئەوە بۆچوونێکی هەڵەیە. «بوونەوەرەکان هیچیان هیچ نین» وەک ئێکهارت دەڵێت، دونیا بەبێ خودا جگە لە «هیچی» هیچی تر نییە، خەلیقەت واتە خالیق، بەبێ خالیق شتەکان ناتوانن بەردەوامبن . ئەم گێڕانەوەیەی خودا بۆ ناو جیهان، ئەم مامەڵەیە لەگەڵ خودادا، نە تەنیا وەک خالیق، بەڵکو وەک خودی خەلقیش، واتە نەوەک بوونەوەرێکی باڵانشین و دەرەکی و ترانسدینتال، بەڵکو وەک بوونەوەرێکی ناونشین کە لە شێوەی دیکەشدا بەرجەستە دەبێت، بۆ تێڕوانینی ڕەسمی ئەو دەم وەک لادان و کوفر تەماشا دەکرا. پیاوانی کلێسە تا ئەو جێگایە شتەکانی ئێکهارتیان بەدڵ بوو، کە دەیگووت خودا دروستکەر و بەردوامدەر و وزەبەخشی جیهانە، بەڵام شتەکان بگاتە ئەوەی کە بڵێین شتەکان هەر خودی خودا

خۆینی، لێرەدا ئێکهارت تێڕوانینێکی حلولی سەرپەڕانەری دادەمەزراند، کە بە کەنیسە قەبووڵ نەدەکرا، هەر لێرەوە کێشەکەی ئێکهارت لەگەڵ کەنیسەدا بەجۆرێک ئاڵۆز بوو، زۆر لە کۆمیسیۆنەکانی ڕاپشکنین نەیاندەتوانی حوکمی کۆتایی تێدا بدەن، چونکە بنەماکانی تەواو لەگەڵ عەقڵییەتی دینی باودا تەبابوو، بەڵام دەرەنجامەکانی بەجۆرێکی لۆژیکی دەگەیشتن بە جێگایەک کڵێسەی تووشی گومان و سەرسوڕمان دەکرد.

یەکێک لە هەرە تێزە سەرەکییەکانی ئێکهارت وەسفکردنێتی بۆ ڕێگای گەیشتن بە خودا، ئێکهارتیش وەک هەموو سۆفییە خۆرهەڵاتییەکان گەرچی خودا لە خۆی و لە دونیادا دەبینێت، گەرچی خودا لەلایان سوڵتانێکی باڵانشینی فرەهێزی تواناداری نییە کە لە سەرەوە جارێک وەک حاکمێکی دڵرەق و جارێک وەک باوکێکی میهرەبان حوکمدەکات. بەڵام بۆ گەیشتن بە خودا جگە لە پشتکردنە دونیا ڕێگایەکی دیکە پێشنیارناکەن، چونکە خودا وەک مەتریاڵ، وەک نیشتەجێی ناو توێژاڵکە مادییەکەی دونیا سەیرناکەن، ڕاستە خودا بەشێکی بوونە، ڕاستە لای ئەوان خودا نیشتەجێی ناو سروشت و کاتە، بەڵام ناشێت خودا لە ناو شتە بچوک و چرکە تێپەڕەکاندا ونبکەین. خودا لە ناو دونیا و کاتدایە، بەڵام بە لۆژیکی سروشتی نادۆزرێتەوە، بەو چاوە نابینرێت و بەو پێوەرە سادانە ناپێورێت کە دەبێت شتەکانی پێ بپێوین. لەبەرئەوە مرۆڤ پێویستی بە ڕێگایەکی تایبەت هەیە بۆ ئەوەی خودا ببینێت و بیدۆزێتەوە. ئێکهارت بۆ ئەوەی ئەو جیاکارییانە بکات، لە نێوان دوو جۆر زەمەندا جیاوازیدەکات. زەمەنێک کە ڕاستە هێڵانەیە، سەرەتایەک و کۆتاییەکی هەیە، لە جێگایەکدا دەست پێدەکات و لە جێگایەکدا کۆتایی دێت، کە زەمەنە بە تێگەیشتن و تێڕوانینی مرۆڤ. لەگەڵ زەمەنێکی خوداییدا کە سەرەتا و کۆتایی نییە، لەدەرەوەی توانای تێڕوانینی ئێمەوەیە بۆ زەمەن... لەم بۆچوونەدا دونیا سەرەتایەکی

نییە، چونکە تێڕامان لە دونیا و تەفسیرکردنی لەسەر ڕۆشنایی زاراوەی سەرەتا و کۆتاییدا هیچ نییە جگە لە سەپاندنی پێوەر و لۆژیکی دونیای ئێمە بەسەر دونیایەکی دیکەدا کە بە لۆژیکێکی خودایی ئیشدەکات. ئێکهارت پێی وایە، دەمێک دونیا هەیە و بەردەوامە، لەبەرئەوەیە کە خودا لە ئێستادا درێژە بە خەلق دەدات. پێشیوایە کە ئەبەدییەتی خەلق شتێک نییە دەرەکی، بەڵکو ڕەوشێکە بە ئێستادا دەڕوات و لە ئێستادا دەردەکەوێتەوە، جیاوازیدەکات لە نێوان دوو جۆر کاتدا یەکەمین بە «ئێستای کات» ناودەبات و ئەویدیان بە «ئێستای ئەبەدییەت». ئێستای کات ئەو چرکەساتەیە کە ئێمە تیادەژین، واتە ساتێکە لە ناو ساتەکاندا، خاڵێکە لەسەر هێڵێکی درێژ، ساڵێکە لە نێوان بێشومار ساڵدا، بەڵام زەمەنی ئێمە جگە لەوەی ئاماژەیە بۆ خۆی، هەڵگری ڕەهەندێکی تریشە کە ئێستای ئەبەدییەتە، زەمەنی ئێستا تەنیا ئاماژەیە بۆ ئەوشتانەی کە ئێستا هەن، بەڵام ئێستا جگە لە شتەکانی خۆی، شتگەلی هەموو زەمانەکانی تریش لە خۆی دەگرێت، ئێستا تەنیا چرکەیەکی خێرا و تێپەڕ و بەسەرچوو نییە، بەڵکو ئەو چێوەیەشە کە ئەبەدییەتی تێدا بەرجەستەدەبێت. ئێکهارت بە شێوەی بەرجەستەبوونی ئەبەدییەت لە ئێستادا دەڵێت «چرکەسات» و جیای دەکاتەوە لە زاراوەی «ساتەوەخت». ساتەوەخت لەزمانی ئێکهارتدا ئاماژەیە بۆ دیوە تێپەڕ و زوو راگوزەر و بەسەرچووەکەی زەمەن، بەڵام «چرکەسات» ڕەهەندی بەرجەستەبوونی ئەبەدییەتە لە فۆرمێکی هەنوکەییدا، لێرەوە بە بڕوای ئێکهارت چۆن خودا لە شتەکان جیاناکرێتەوە، ئەبەدییەتیش لە هەنوکە جیانابێتەوە. واتە هەنوکە هەر خۆی نییە بەتەنیا، بەڵکو ئەو ڕەهەندانەش لە خۆی دەگرێت کە تێپەڕیوون و ئەوانەش کە لە داهاتوودا دێن. بۆیە خودی زەمان دوور لەو ڕەهەندە ئەبەدییەی خودا پێیدەبەخشێت، هیچ نییە. زەمەن تەنیا بەو مانایە بوونی هەیە کە

چرکەساتی بەرجەستەبوونی ڕەهەندی ئەبەدییەتە.

لە فەلسەفەی ئێکهارت دا زاراوەی «هەژاریی» ڕۆڵێکی سەنتراڵ دەبینێت. هەژاریی لێرەدا بەومانایە نییە کە خاوەنی هیچ نەبیت، بەڵکو بەو مانایەی کە خۆت لە هەموو جۆرە خاوەندارێتییەک پاکبکەیتەوە. هەژاریی ڕۆح کە ئێکهارت ستایشیدەکات، هەژارییەکی سەرتاسەرییە، واتە مرۆڤ بچێتە دابڕانێکی موتڵەقەوە لە شتەکان «هیچی نەوێت، هیچ نەزانێت، هیچی نەبێت». تەنیا لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ پنتی نەبوونی ڕەها، مرۆڤ دەتوانێت ماڵاوایی لە جیهان بکات. گێڕانەوەی هەموو شتەکان بۆ سەرخاڵی سفر مەرجی ماڵاواییە لەدونیا، گێڕانەوەی شتەکان بۆ پلەی عەدەم مەرجی سەرەکی دابڕانە لە مادییات. ئەو دەڵێت لە نێوان دابڕان و عەدەمدا نابێت هیچ شتێک هەبێت، دەبێت هەژاریی بگاتە پلەی تەواوی خۆی. مرۆڤ دەبێت هیچی نەوێت، خۆی بەوە ڕابهێنێت خواستی نەبێت، هەوڵی ناسین و زانینی دەوروبەری مادی خۆی نەدەدات، چاو لە دونیا لادات و بەرەو قووڵایی ناوەوەی خۆی بڕوانێت. هەڵبەت ئەم خۆپاککردنەوەیە لە هەموو شتێک، لە خۆڕا نییە، مرۆڤ نایەوێت لە خۆی و لە دونیا لە پێناوی هیچدا دابڕێت. بەبڕوای ئێکهارت ئەم دابرانە پێویستە تا مرۆڤ بگاتە بنی ڕۆح، قووڵایی هەرەقووڵی ڕۆح... بەڵام بنی ڕۆح چییە؟ بەڕای ئێکهارت بنی ڕۆح نازانرێت چییە، بەو مانایەی کە وەسف ناکرێت، ناونانرێت، وشە لە توانایدا نییە لەخۆی بگرێت. بەوەدا بنی ڕۆح لە خوداوە نزیکە ئەوا ئەویش وەک خودا پێناسە ناکرێت. ئێکهارت دەیگووت دەبێت خودا وەک خۆی بناسین، وەک خۆی خۆشمان بوێت، وەک نا ـ خودا، وەک نا ـ ڕۆح، وەک نا ـ کەس، وەک نا ـ نیگار. مەبەستیشی لەو نەفیانە دوورخستنەوەمان بوو لە هەوڵی پێناسەکردنی خودا بە لۆژیک و عەقڵی خۆمان. لێرەوە ڕای وابوو بنی ڕۆحیش چەندی لێبزانین هێشتا هیچی لێ نازانین. بەڕای ئێکهارت هەر

کاتێک مرۆڤ بەرەو بنی بێقەراری ڕۆح ڕۆیشت لەوێدا خودا دەبینێت، مرۆڤ تەنیا لە قووڵایی ڕۆحێکی پاک و بێخەوشدا کە لە هەموو شتێک پاکبۆتەوە دەتوانێت بەخودا بگات... لێرەوە سەفەر بەرەو بنی ڕۆح سەفەرە بەرەو خودا. هەر کات لە دەرون و ڕۆحی خۆماندا ڕۆچووین دەگەین بە خالق.

فەلسەفەی ئێکهارت لێرەدا تووشی کێشەیەک دەبێت، گەر بڵێین قووڵایی ڕۆح جێگایەکی دروستکراوە، کەواتە گرێدانەوەی بەخوداوە ئەستەمە، چونکە ئێکهارت باوەڕی وایە کە هەرچییەک دروستکرابێت «واتە خەلق بێت» تێپەڕە، لە نێودەچێت... واتە لە نێوان خەلق و خالیقدا خەڕەندێکی قووڵ و پڕنەکراوە هەیە، خالیق لە ناو ناچێت و خەلق قابیلی لە نێوچوونە. کەواتە دەبێت قووڵایی ڕۆح دروستنەکرابێت و لە سروشتی خالیق خۆی بێت. ئێکهارت بۆئەوەی لەو کێشەیە دەرچێت، سیفەتێکی ئیلاهی دەبەخشێتە بنی ڕۆحی مرۆڤ... بنی ڕۆح سەر بە هەرێمی خەلق نییە، بەڵکو سەر بە هەرێمی خالیقە. کەواتە لە ناو مرۆڤدا بەشێک لەخودا هەیە. بەو واتایەی خودا نیشتەجێی ناو مرۆڤە، خودا لە ناو مرۆڤدایە و مرۆڤ بە مانایەک لە ماناکان خودایە. ئێکهارت تا ئەو جێگایە دەڕوات بڵێت بنی ڕۆح و خودا جیاوازییان نییە. ئەو دەڵێت «قووڵایی من قووڵایی خودایە و قووڵایی خودا قووڵایی منە» و«من و خودا یەکین». ئێکهارت ڕای وابوو مرۆڤ دوو لەدایکبوونی هەیە، یەکێکیان لەدایکبوونە لە دونیادا، ئەویتریان لەدایکبوونە لە دەرەوەی دونیادا، واتە لەدایکبوونەوەیەکی ڕۆحییە لە خودادا. مرۆڤ دەمێک خۆی لە دونیا دادەبڕێت و لە قووڵایی ناخدا خودا دەبینێتەوە، لەگەڵ ئەودا دەبێتەوە یەک و لە ناویدا دووبارە لەدایکدەبێتەوە.

لەم ڕوانگەیەوە لای ئێکهارت هەتا چەمکی گوناهیش دەگۆڕێت. ئەو بێئەوەی خۆی لە پێناسە پێشینەکانی گوناه بدات، دەکەوێتە وەسفی

گوناه بە جۆرێکی دیکە. گوناهـ وەرچەرخانە لە خودەوە بەرەو دونیای شتە مادییەکان، تێکدانی ڕیزبەندی شتە گرنگەکانە، وەژێرنانی شتە بایەخدارەکانە بۆ شتە بێبایەخەکان. گوناهـ لای ئەو پابەندی نەبوونی باشییە... واتە گوناهـ خۆی بوونی نییە، بەڵکو ئەوەی هەیە کورتهێنانی ئیرادەی چاکەکاری ناو مرۆڤە. گوناهی تەواو، گوناهی موتڵەق بوونی نییە، گوناهـ هەیە تا لە کەمی چاکە بە ئاگابین، خودا گوناهی دروستکردوە، لێرەوە نابێت بەجۆرێک لە گوناهـ پەشیمان بین وەک ئەوەی ئاواتەخوازبین گوناهـ نەبایە. بە بڕوای ئەو، ئەو جۆرە لە ئاواتخواستن دژ بە ئیرادەی خالیقە، گەردون بێگوناهـ ناتەواو دەمێنێتەوە، گوناهـ هەیە چونکە خودا دەیەوێت هەبێت. هەڵبەت ئێکهارت لێرەشدا جۆرە بۆچوونێک دەخاتە روو کە پیاوانی کلێسە بە تێڕامان و گومان و دوو دڵییەوە سەیریاندەکرد.

ئەوەی لای ئێکهارت زۆر سەرنجڕاکێش دەیبینم، ئەوەیە کە لە سەفەری گەیشتن بەخودا دا «ئیمان» ڕۆڵێکی سەنترالْ نابینێت لەلای، بەڵکو عەقڵ بەو دەورە هەڵدەستێت. ئێکهارت یەکێکە لەو فەیلەسوفە دینییە دەگمەنانەی کە لە دامەزراندنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودادا ڕۆڵێکی بەرچاو بە عەقڵ دەبەخشێت، بەبڕوای ئەو ئەوەی کە لە دۆزینەوەی خودادا لە ناو خۆماندا ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت، عەقڵە نەوەک جۆرە ئیمانێکی مستیکی. ئەو لەو بڕوایەدایە کە مرۆڤ لە هەموو کردارێک و لە هەموو شتێکدا دەبێت عەقڵی بخاتە گەڕ.

دوای مردنی ئیکهارت، کتێبەکانی بە شێوەیەکی بەربڵاو قەدەغەکران. گەرچی ئێکهارت ڕاستەوخۆ و بە گشتی تۆمەتی هەرتەقەی نەخرایە پاڵ بەڵام کەنیسە ترسی لەوە هەبوو کە خەڵکانی سادە، ئیماندارانێک کە توانای تێگەیشتنیان کزە دەشێت بەخوێندنەوەی ئێکهارت بکەونە هەڵەوە و ڕستەکانی ئەو بەجۆرێکی نادروست وەربگرن و لە دین لابدەن.

لەسەدەکانی دواتردا هیگڵ سەرسامییەکی زۆری بە ئێکهارت پیشاندا. هەڵبەت گەر قووڵ بڕوانین خزمایەتییەکی ڕاستەقینە لە نێوان هیگڵ و ئێکهارتدا دەدۆزینەوە. دەمێک ئێکهارت دەڵێت «ئەو کەسە خودا باش دەناسێت، کە خودا بە یەکسانی لە هەموو شتەکاندا بناسێتەوە». لێرەدا بەڕوونی دەتوانین ئەو پەردە بدۆزینەوە کە بە هیگڵەوە دەیبەستێتەوە، لای ئەویش فەلسەفە بریتییە لەگەڕان بەدوای بەرجەستەبوونی ڕۆحی موتڵەق لە شتەکاندا، واتە لە حلولی خودا لە ناو سروشت و مێژوودا.

بایەخێکی تری ماستەر ئێکهارت لەوەدایە کە بۆ تەعبیر لە تێڕوانینەکانی خۆی بەپێچەوانەی لاهوتییەکانی ترەوە، لە بری زمانی لاتینی، زمانی ئەڵمانی بەکارهێنا. ئەوە یەکەمجار بوو زمانی ئەڵمانی بەو شێوە فەلسەفییە وەک زمانی بیرکردنەوە جێگا بە لاتینی لەقبکات، لەوەدەمەشەوە تا ئەمڕۆ زمانی فەلسەفی ئەڵمان قەرزاری فۆرم و دارشتنەکانی ئەوە. لەم ڕوانگەیەشەوە نازییەکان بایەخێکی بێوێنەیان بە ماستەر ئێکهارت دا، بە فیگەرێکی بنەڕەتی کولتووری جێرمانیان حیسابدەکرد.

بۆ ئێمە لەخۆرهەڵات ئێکهارت تا ئێستا دەنگێکی دوور و نەناسراوە، گەرچی بە بڕوای من کەم فەیلەسوفی خۆرئاوایی هەیە کە بە تێڕوانین و تەفسیر هێندەی ئێکهارت لە فەلسەفەی سوفی خۆرهەڵاتییەوە نزیک بێت. ئێکهارت نیشانەیەکی گەورەیە کە ڕیشەکانی تێڕوانینی مستیکی لە تەواوی دونیادا نزیکییەکی بەرچاویان لەگەڵ یەکدا هەیە. بەش بە حاڵی خۆم لێکۆڵینەوە و کتێبی گرنگم لەسەر ئێکهارت بە زمانە خۆرهەڵاتییەکان نەبینیوە. لە کاتێکدا لەو بڕوایەدام پشکنینی قووڵی ئێکهارت ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخات کە عەقڵی مرۆڤ گەرچی پاشخانە کولتوورییەکانی جودا بێت، بەڵام دواجار لەسەر یەک ڕێتم و یەک بونیاد ئیشدەکات. ڕۆحی ئێکهارت بۆ من نامۆ نەبوو، فەیلەسوفێک

كە بڵێت «خودا عەشقە، ئەوەی لە عەشقدا نیشتەجێبوو لە خودادا نیشتەجێیە و خودا لە لای نیشتەجێیە» فەیلەسوفێک نییە نامۆبێت بە ئێمەی خۆرهەڵاتی کە ڕیشە سۆفیستییەکان لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ لە خوێنماندا دەجۆشێت و زیندووە.

# ئاورەکەی ئۆرفیۆس

لە ناو ئەفسانە یۆنانییەکاندا، لە پاڵ هەر یەک لە سیزیف و پرۆمیسۆس و نەرسیسیۆسەوە، لای من ئەفسانەی ئۆرفیۆس لە هەموویان قەشەنگترە، بە درێژایی مێژوو ئۆرفیۆس نزیکییەکی قووڵی لەگەڵ مەعشەری مۆسیقار و شاعیراندا هەبووە، قەت نەبووە مرۆڤ مۆسیقار و شاعیرێکی راستەقینە بێت و ئۆرفیۆس نەناسێت، ئۆرفیۆس بەجۆرێک لە جۆران باپیری هەرە هەرە دێرینمانە، نوێنەری ئەو نمونە ئیدیال و ئەبەدییەیە کە دەربارەی داهێنەری گەورە هەمانە. ئەو لە خۆیدا هەر سێ رەگەزە رۆمانسی و خەیاڵبزوێن و جاویدانەکەی داهێنەرانی هەڵگرتووە «بلیمەتی، عاشقی، شەهادەت». لێرەوە هیچ سەردەم و قۆناغێک نییە، مۆسیقاران، شێوەکاران، شاعیران، فیلمکاران نەگەڕابێتنەوە بۆ سەر ئۆرفیۆس، لە ئۆڤیدەوە تا دەگەینە سەر جۆرج تراکل، ریلکە، تینسی ویلیامز، جان کۆکتۆ... ئۆرفیۆس هەمیشە بزوێنی خەیاڵی هونەریی بووە. ئەو بە ئەندازەیەک جوانە فەرامۆش ناکرێت. ئەو دەنگخۆش و « لیرا» ژەنێکی بێوێنە بوو، هەڵبەت لیرا ئەو ئامێرە تاردارە گریکییە کۆنەیە، کە لە چەشنی قەیسارە و هارفە، لە هەندێ سەرچاوەشدا بە دایکی هەر دوو ئامێرەکە حیسابدەکرێت، سەردەمانێک ئامێرەکە خۆی وەک رەمزی شاعیران و بیریاران وەها بوو، هەتا وشەی لیریک بۆ شیعر کە ئەمڕۆ بەکاریدەهێنین لە لیرا وە

هاتـووە. ئۆرفیـۆس لیراکـەی خـۆی لـە ئەپۆلـۆ وەردەگرێـت، کـە ئەویـش لـە شـوێنی پەنجـا مانـگا دزراوەکانـی لـە هێرمسـی بـرای دەسـتێنێت، واتـە هێرمس یەکەمیـن داهێنـەر و دروسـتکەری لیرایـە، ئـەو ئامێـرەی ئۆرفیـۆس دونیـای پـێ شـەیدادەکات. ئاوازەکانـی ئۆرفیـۆس وەهـا ئەفسـوناوی بـوون درنـدەی ترسـناکی جەنگەڵانـی خاوکردۆتـەوە، دەریـای تـوڕەی هێـور کردۆتـەوە، هەتـا گاشـە بـەردی کێوانـی هێناوەتـە گریـان. بـەڵام ڕۆژێـک ئۆرفیـۆس تووشـی نەهامەتییەکی ناخـۆش دێـت، ئـەو زۆر شـەیدای «ئۆردیـکا» ـی ژنێتـی. بـەڵام کورەکـەی ئەپۆلـۆ «ئەریسـتایۆس» «کـە بـە گشـتی خوداوەندێکـی خـراپ نییـە و ژیاننامەکـەی بـە پێچەوانـەی زۆر لـە خوداوەنـدە یۆنانییـەکان کاری زۆر باشـی تێدایـە» ئەویـش شـەیدای ئۆردیـکا دەبێـت و تەقـەلای ئـەوە دەدات لاقەیـکات و دەسـتی بـۆ بەرێـت، کـە ئۆردیـکا لەدەسـتی هەڵدێـت، لـە کاتـی خۆشـاردنەوە و ڕاکردنـدا بـە هەڵـە پـێ بـە مارێکدا دەنێـت، مارەکـەش دەیگەزێـت و دەیکوژێـت. مردنـی ئۆردیـکا بـۆ ئۆرفیـۆس ئازاربەخشـە. ئۆرفیـۆس بـەو تراژیدیایـە دەبێتـە یەکەمیـن هونەرمەنـد و داهێنـەری نەفـرەت لێکـراوی مێـژوو، کـە بەدبەختـی وەک کولتـوور بـۆ هەمـوو داهێنەرانـی دوای خـۆی جێدەهێڵێـت. لەگـەڵ مردنـی ئۆردیـکادا تراژیدیـای ڕاسـتەقینەی ئۆرفیـۆس دەسـت پێـدەکات. ئۆرفیـۆس وەک هەمـوو هونەرمەنـدە گـەورەکان لـە هونـەر زیاتـر چەکێکـی نییـە، ئـەو لـە نـاو قارەمانەکانـی گریکـدا لـە هەمـووان زیاتـر ڕۆحـی هونەرمەنـدی مۆدێرنـی پێـوە دیـارە، ئـەو بـاوەڕی وایـە بـە هێـزی هونـەر دەتوانێـت بەگژ مردنـدا بچێتـەوە... ئـەوەی ئۆرفیـۆس بیـر لـەوە دەکاتـەوە دابەزێـت بـۆ دونیـای خـوارەوە، بـۆ دۆزەخ «هـادەس»، بـۆ جیهانـی مـردوان و لەوێـوە ئۆردیـکا بهێنێتـەوە، دوو شـتی گرنگـی ڕۆحـی شـاعیران لـە هەمـوو ئـان و زەمانێکـدا بەرجەسـتەدەکاتەوە، کـە بریتییـن لـە «تەسـلیم نەبـوون بـە واقیـع» و «شـەڕکردن بـە هونـەر لەگـەڵ مـردن» دا. سـەفەری

ئۆرفیۆس بۆ هادەس سەفەرێکی رەمزییە، نیشانەی ئامادەگی هونەرمەند و شاعیرانە بۆ دابەزین بۆ دۆزەخ، ئۆرفیۆس باوەڕی وایە کە بە دەنگە خۆشەکەی خۆی و بە نەغمەی لیراکەی، ئۆردیکا بهێنێتەوە بۆ ژیان... هەر واش دەبێت. هەتا خوداوەندان و جانەوەرە دڕەکانی دۆزەخ، هەتا سەگە سێ سەرە بە ناوبانگەکەی هادەس «کربیرۆس» دەکەونە ژێر کاریگەریی هونەری ئۆرفیۆسەوە. دڕترین جانەوەرانیش ناتوانن خۆیان لە جوانی و سیحری هونەر بپارێزن، ئۆرفیۆس بە بەرزی هونەری خۆی خوداوەندانی دۆزەخ نەرمدەکات و لە پاداشتی ئاواز و نەغمەی قەشەنگیدا ڕێگای پێدەدەن ئۆردیکا لەگەڵ خۆی بباتەوە بۆ سەرەوە، بە مەرجێک تا لە هادەسە، تا پێی نەخستۆتە سەر زەمینی ئاسایی ئاوڕ لە ئۆردیکا نەداتەوە. گەر ئاوڕی لە ئۆردیکا دایەوە دەڕوات و دەکەوێتەوە بنی دۆزەخ و بۆ هەتاهەتایە لە دەستی دەچێت. فەرمانی خوداوەندان لەمڕووەوە ئاشکرایە، ئۆرفیۆس بۆی نییە ئاوڕبداتەوە... تەنیا بەوە دەتوانێت دیوارە ئەستورەکانی مردن ببڕێت کە گۆرانی بڵێت و بژەنێت و بڕوات و بڕوات تا جیهانی ژێرەوە جێدەهێڵێت. بەڵام ئۆرفیۆس لە سەفەری سەرکەوتن و گەڕانەوەدا بۆ ژیان، لە ساتێکدا گوێی لە دەنگی پێی ئۆردیکا نابێت، هەڕەشە و مەرجی خودایان لە یاددەکات و ئاوڕدەداتەوە تا بزانێت بەراستی ئۆردیکا لە دواوەیەتی، بەو ئاوڕەش ئۆردیکا دەکەوێتەوە بنی هادەس و بۆ هەتاهەتایە لە دەستدەچێت.

بۆ ئۆرفیۆس ئاوڕدەداتەوە؟ چ دەردێک لە ئۆرفیۆسدا دەگەڕێت و پاڵی پێوەدەنێت ئاوڕبداتەوە؟ بۆ ئەو هەموو ئازار و ماندووبوونە دەکێشێت تا مەعشوقەکەی ڕزگاربکات، کە دەگاتە ئەوەی هەنگاوێکی مابێت بگاتە خەونی خۆی ئاوڕدەداتەوە و هەموو ڕەنجێک بەبادەدا؟ چۆن بلیمەتێک و عاشقێکی وەها هێندە سادەبین و کاڵفام ڕەفتاردەکات؟ چی پاڵنەرێکی

نهێنی لە پشت ئەم ئاوڕەی ئۆرفیۆسەوەیە، کە بێگومان بەناوبانگترین و تراژیدیترین و غەمینترین ئاوڕی مێژووە... نە لە مێژووی ڕاستەقینەدا و نە لە مێژووی هونەردا ئاوڕێکی تری وەها گرنگمان نییە؟.

یەکێک لە تەفسیرەکان ئاوڕەکەی ئۆرفیۆس دەگێڕێتەوە بۆ هۆمۆسێکسوالییەتی ئەو، ئۆرفیۆس لە ناخیدا هاوجنسبازە بۆیە بێئاگای خۆی لە نەستیدا، لە قووڵایی ناخودئاگایدا خواستێکی نهێنی و شاردراوە هەیە ئۆردیکا لە دەستبدات، ئەو خواستە بەهێز و بێخودە پاڵی پێوەدەنێت ئاوڕ بداتەوە. تەفسیرەکە بنەمای بەهێزی لە ناو چیرۆکە گریکییەکەدا هەیە، ئۆرفیۆس کە ناکام و غەمگین و تێکشکاو دەگەڕێتەوە سەر زەمین، تەواو پشت لە دونیای ژنان دەکات و دەبێتە هیجاکەرێکی بێپەروایان، بە جۆرێک دواجار هەر ژنان دەیکوژن و هەلاهەلایدەکەن و سەریدەبڕن و لەگەڵ لیراکەیدا دەیخەنە ڕوباری هێبرۆسەوە. ئەوەی دیمەنی کوشتنەکەی ئۆرفیۆس لە کتێبی میتامۆرفیۆسی ئۆڤیدا بخوێنێتەوە، دەبینێت ئەو بڕگانە لە بەشە هەرە جوانەکانی کتێبەکەی ئۆڤیدن، ژنانی سەر بە دینیۆسیس بە کینەیەکی بێوێنەوە ئۆرفیۆس پارچەپارچە دەکەن، یەکێکیان کە قژی لە هەوادا بادەیبات، ئۆرفیۆس لە دوور دەبینێت و هاواردەکات « ببینین، ببینن ئەوەتا، ئەوەی سووکایەتی بە ژنان کردوە». کوشتنەکەی ئۆرفیۆس بەو جۆرە و بەدەستی ژنان هەمیشە وەک بەڵگەیەک بۆ هاوجنسبازی ئۆرفیۆس بەکاردەهێنرێت.

هەڵبەت تەفسیرێکی تر هەیە کە پێچەوانەی ئەوەیە، ئۆرفیۆس عاشقێکی گەورەیە، ئەو ئاوازە سیحراویانەی کە خواوەند و جانەوەرانی هادەس سڕدەکەن نەغمە و ئاوازی ئاسایی نین، بەڵکو دەبێت لە ڕۆحێکی هونەرمەند و زۆر عاشقەوە هاتبن... وەک چۆن سۆفییەک گەر خودا خۆی بۆ دەربخات ناتوانێت چاو بەرزنەکاتەوە و هەوڵی بینینی

مەعشوقی خۆی نەدات، هەتا گەر بەو نیگایە چاویشی لە دەستدابێت. ئۆرفیۆسیش ناتوانێت بەسەر ئەو خواستە گەورەیەدا سەربکەوێت کە خواستی بینینی ئۆردیکایە، ئەگەر بۆ چرکەیەکی کورتیش بووە، گەر بە ئاوڕێکی کوشندەش بووە. ئاوڕەکەی ئۆرفیۆس ئاوڕی گەمژەیەک نییە، بەڵکو ساتێکە لە ناویدا هەموو عەشق و ئارەزوو و ویستی ئۆرفیۆس چڕ بۆتەوە... کێ دەڵێت لە بنەڕەتدا ئۆرفیۆس تەنیا بۆ ئەو نیگایە دانەبەزیوە، بۆ ئەو ئاوڕە نەهاتووە بۆ هادەس؟ ئاخۆ بەو ئاوڕە پتر عەشقی خۆی بۆ ئۆردیکا ناسەلمێنێت لەوەی هەر بڕوات و هەر مل بنێت و هەر لێرا بژەنێت؟ . ئاوڕەکەی ئۆرفیۆس یەک چرکەساتی عەشقە بەڵام بە بەرتەقای دەیان تەمەن مانادار، هەموو عەشقی ئۆرفیۆس لەو ئاوڕەدا کۆبۆتەوە... گەر ئۆرفیۆس ئاوڕی نەدابایەتەوە نەدەبوو بە ئۆرفیۆس. ئەگەرچی ئەو ئاوڕەی ئەو تابڵێی دولبەر کوژە، بەڵام پڕە لە بارگەی گەورەی عەشق.

من تەفسیرێکی سەرنجڕاکێشی دیکەم لای «کلاوس تێڤێلایت» بینیوە. تێڤێلایت لە ئەدەبناسە پرکارەکانی ئەڵەمانیای دوای جەنگە، کتێبێکی چوار بەرگی هەیە ناونیشانە سەرەکییەکەی «کتێبی پادشایان»ـە، لکە ناونیشانی بەرگی یەکەمی هەر بە ناوی «ئۆرفیۆس و ئۆردێکا»یە. لەوێدا تێڤێلایت بەرگری لە تێزەیەک دەکات و پێیوایە بەدرێژایی مێژوو لە ئۆرفیۆسەوە تا دەگەینە سەر شاعیرێکی وەک گۆتفرید بن و مۆسیقارێکی نوێژەنی وەک گوستاف مالەر، نوسەران و هونەرمەندان، ژنان و دڵدارانی خۆیان وەک کەرەستەیەک بۆ خرۆشاندنی داهێنانی خۆیان بەکارهێناوە. ئەو ئاوڕەکەی ئۆرفیۆس لەو نیگایەوە تەفسیردەکات کە بەبێ ئەو ئاوڕە دەکرا ئۆرفیۆس توانای هونەری خۆی لەدەستبدات، ئاوڕەکە تەنیا زامنە بۆئەوەی ئۆرفیۆس بە هونەرمەندی بمێنێتەوە. تێزەکەی تێڤێلایت لەوەدا کورتدەبێتەوە، هونەرمەندان هونەری خۆیان،

بلیمەتی خۆیان لە کوشتنی مەعشوقەوە بەدەستدەهێنن، دەبێت مەحبوبە بگەڕێتەوە بۆ هادەس بۆ ئەوەی ئۆرفیۆس بە هونەرمەندی بمێنێتەوە... ئەمە تێزەیەکە گەرچی ڕەخنەی توندی لێگیراوە، بەلام شایەنی تێڕامانە. ئۆرفیۆس دێت بەرەو جیهانی بنەوە، خواوەندەکان بە مۆسیقای خۆی مەستدەکات، دەزانێت ئەوەی ئەو کردویتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تینوێتییە ئەبەدییەی بۆ ئۆردیکا. بەلام چی دەبێت گەر ئێستا دووبارە ئۆردێکا بەدەستبخاتەوە، چی دەبێت کە بەهانەی ئەو هەموو سووتان و ئارەزووە بێتەدی و خرۆشی دابمرکێت؟. لە ساتێکدا ئۆرفیۆس دەبێت بیری لەوە کردبێتەوە لە نێوان سیحری هونەری خۆی و ئۆردیکادا دەبێت یەکێکیان هەڵبژێرێت، دەبێت یان ئەو بەبێ ڕۆحی هونەرمەند لە هادەس دەرچێت، یان ئۆردیکا بکرێتە قوربانی... بە ڕای تێڤێلایت داهێنەران بەردەوام مەعشوقە دەکەنە قوربانی، تێزێک ڕەنگە بێئینسافییەکی گەورەی تێدا بێت، بەلام بێگومان یەکێک لە ئەگەرە گەورەکانی ئاوڕەکەی ئۆرفیۆسە. بەبڕوای تێڤێلایت، ئۆرفیۆس بە مەبەست ئۆردێکا دەکوژێت، ئۆردیکا دەبێت بمرێت تا ئۆرفیۆس بتوانێت گۆرانی بڵێت... ئەوەی دەیبینین تاوانێکی کوشتنە، نەوەک هەڵەیەکی تراژیدی یان لەیادچوونێکی عاشقانەی ساتێکی غەفڵەت. تێڤێلایت داهێنەرانی وەک برێخت، کنۆت هامسن، کافکا، ئێزرا پاوەند، دەخاتە لیستی مەعشوقە کوژانەوە، دەیانکات بە کوڕانی ئۆرفیۆس، بە وەچەکانی دواتری.

دیارە دەشێت تەفسیری تر بۆ ئەم ئاوڕە هەبێت، بەلام بە ئەندازەی خوێندنەوە و ئاگایی بچوکی خۆم هەر ئەوەندەیان کەوتوونە بەرچاوم و پێم گرنگ بوون. لێرەدا هەوڵدەدەم زۆر کورت تەفسیرێکی بچوکی خۆم بنوسم، تەفسیرێک کە دەشێت جیاواز بێت لەو تەفسیرانەی دی، بەبڕوای من لە قووڵایی هەموو هونەرمەندێکدا گومانێکی زۆر قووڵ

دەرهەق بە هێزی هونەر هەیە، لە ڕاستیدا هونەرمەند چەند باوەڕی بە کاری خۆی بێت، هێشتا تەواو لە کاریگەریی هونەری خۆی لەسەر دونیا و ئەوانی تر تێناگات. کەم هونەرمەند هەیە گومان لە ناوەوە ویرانی نەکات، گومان لە توانای خۆی و گومان لە کرانەوەی ئەوانی دی بۆ کاریگەریی داهێنانی ئەو. هونەرمەند گەلێک خێراتر و زیاتر و قووڵتر لەوانی دی جیاوازی نێوان واقیع و فەنتازیا دەزانێت. ئەوە خەڵکانی دین بە جۆرێک دەکەونە ژێر سیحری هونەرەوە کە دیواری نێوان واقیع و فەنتازیایان لا هەڵدەگیرێت، بەڵام هونەرمەند خۆی هەمیشە دەزانێت واقیع شتێکە و فەنتازیاش شتێکی دی، دەزانێت هونەر جیهانێکە و حەقیقەتیش جیهانێکی تر... بۆ دەبێت ئۆرفیۆس باوەڕ بە خوداوەندانی ژێرەوە بکات، بۆ دەبێت دڵنیابێت کە ئاوازەکانی تا کۆتایی کاریگەر دەبن و ڕێگای ترسناکی دۆزەخی بەرەو بالا بۆ پاکدەکەنەوە؟ ئاخۆ ئەو گومانە سروشتیترین گومان نییە کە هەموو نوسەر و هونەرمەندێکی دونیا هەیەتی؟. ئۆرفیۆس دەشێت لە ساتێکدا باوەڕی بە هێزی هونەر و کاریگەریی گۆرانییەکانی نەمابێت، ئاوڕەکەی ئۆرفیۆس ئاوڕێکی گەورەی گومانە لە هەموو توانای هونەر خۆی، لەوەی تا سەر بتوانێت کار لە جانەوەرەکەی ناو ئەوانی تر بکات... بەبڕوای من کە ئۆرفیۆس ئاوڕدەداتەوە ئاوڕ لە ئۆردیکا ناداتەوە، بەڵکو ئاوڕ لە هونەری خۆی دەداتەوە، سەیردەکات بۆ ئەوەی هێزی هونەری خۆی ببینێت، بزانێت ئەو سیحرە بەردەوامە، هێزی ئەو ئەفسونە وەک خۆیەتی. ئاوڕەکەی ئۆرفیۆس نیشانەی گومانێکی قووڵە هەم لە هێزی هونەر و هەم لەوانی دیش کە هونەر دەبیستن و گوێی لێدەگرن... ئۆرفیۆس نایەوێت ئۆردێکا بکوژێت وەک تێڤێلایت دەڵێت، بەڵکو دەیەوێت دڵنیابێت ڕزگاریکردوە، دڵنیابێت هونەرەکەی بەشی ئەوە هێزی هەیە کە ئۆردیکا تا کۆتایی لە هادەس دووربخاتەوە، ئەوەی تاوانی ئۆرفیۆسە ئەو گومانەیە، گومانێکی

قووڵــە کــە لــە ئۆرفیۆســەوە تــا ئەمــڕۆ شــاعیران و هونەرمەنــدان ئــازار دەدات. ئۆرفیــۆس دەزانێــت ئــەو مەخلوقێکــە ســەر بــە زەمینــی فەنتازیــا و ئۆردیــکا بوونەوەرێکــە لــە جەهەنەمێکــی ڕاســتەقینەدا، چەنــدە فەنتازیــای ئــەو دەتوانێــت واقیــع بگۆڕێــت... چەنــدە خەیاڵــی مۆســیقیانەی ئــەو دەتوانێــت دەســتکاری هاوکێشــە ڕاســتەقینەکانی ژیــان بــکات؟ ئۆرفیــۆس ئــاوڕ لــەو پرســیارانە دەداتــەوە. بەبــڕوای مــن گــەر قــووڵ بڕوانیــن ئاوڕەکــەی ئۆرفیــۆس ســاتێکی کــورت نییــە، چرکەیەکــی تێپــەڕ نییــە، بەڵکــو درێژتریــن ئــاوڕی مێژووشــە... ئــاوڕی هونەرمەنــدە لــە کاریگەریــی خــۆی لەســەر دونیــا، ئــاوڕی فەنتازیایــە لــە ئیشــی خــۆی لەســەر ژیــان... ئاوڕێکــە لــە ئۆرفیۆســەوە تــا ئەمــڕۆ درێژبۆتــەوە و بەردەوامــە و هەمیشــەش دەمێنێتــەوە.

## کوشتنەکەی ئۆرفیۆس

ئاوڕەکــەی ئۆرفیــۆس ســاتێکی لاوازی قووڵــە. ئۆرفیــۆس لــە ســاتی ئاوڕەکەیــدا بــەدوای دڵنیاییەکــی ونــدا دەگەڕێــت... وەسواســی دڵنیایــی لای ئۆرفیــۆس تەنیــا لــەوەدا کــورت نابێتــەوە، بزانێــت خۆشەویســتەکەی بــە ڕاســتی لەدوایەوەتــی یــان نــا، بەشــێکی لەوەدایــە بزانێــت خــوداکان ڕاســتگۆن... ئۆرفیــۆس گومانــکارە، بــەڵام بــۆ گومانــکارە؟ . بــا وادابنێیــن کــە ئۆرفیــۆس لــە ڕێــگای گەڕانــەوە لــە دۆزەخــەوە «لــە هادەســەوە» بیــری لــەوە کردۆتــەوە «چــی دەبێــت گــەر چوومــە ســەرێ و گەڕامــەوە ســەر زەوی و ئۆردێــکام لەگــەڵ نەبــوو؟»، چ گاڵتەجــاڕی و ئابڕووچونێــک دەبێــت، چ دڵشــکانێکی قــووڵ دەبێــت، چ شکســتێکی گــەورە دەبێــت بــۆ مۆســیقا و شــیعر و گۆرانــی؟. بەبــڕوای مــن گرفتــی نەبوونــی دڵنیایــی و بــڕوا، گرفتــی ســەرەکی مرۆڤــە، هەمــوو ئــەو پرســیارانەش دەشــێت بەســەری ئۆرفیۆســدا تێپەڕیبــن. بــەڵام ئۆرفیــۆس بــەر لــەوەی گومــان لــە خــوداکان بــکات، گومــان لــە خــۆی دەکات. ئاوڕەکــەی ئامــاژەی بڕوانەبوونــە بــە خــۆی. بەپێــی ئــەو

نمونانەی کە مێژوو دەیخاتە بەردەستمان بڕوا بە خۆ نەبوون بەشێکی گرنگی هەست و جیهانبینی شاعیران و هونەرمەندانە، ئۆرفیۆس باوەڕی بەوە نییە کە دەتوانێت حەقیقەت بگۆڕێت، ئەو قەناعەتەش وەک قەدەر بۆ هەموو شاعیرانی تر جێدەهێڵێت. زۆربەی تەفسیرەکانی ئۆرفیۆس لەسەر ئەوە تەبان کە جیابوونەوەی دونیای فەنتازیا و هونەر لە دونیای حەقیقەت و واقیع لە پشت تراژیدیای ئۆرفیۆسەوەیە. کوشتنەکەی ئۆرفیۆس ئەم بابەتە زیاتر زەقدەکاتەوە، ئۆرفیۆس بەدەستی ژنانی هەواداری دینیوسیس دەکوژرێت... دەگووترێت کە خودی دینیوسیس لە پشتی ئەوەوەیە کە ژنانی لایەنگری خۆی لە ئۆرفیۆس هانداوە، لە داخی ئەوەی ئۆرفیۆس لە گۆرانییەکانی خۆیدا لە هادەس ناوی هەموو خوداکانی هێناوە و ستایشیکردون، دینیوسیس نەبێت، ئەوەش بەجۆرێک دڵی دینیوسیسی لە ئۆرفیۆس ڕەشکردوە، حەز بە مردنی بکات.

دینیوسیس خوداوەندی شەراب و مەستی و خوماربوون و خرۆشان و شەیداییە، خوداوەندی سەما و ئاهەنگە... پێچەوانەی ئەپۆلۆ یان ئەپۆلۆن، کە خودای عەقڵ و هێمنی و داهێنان و بیروردییە. نیتشە هەر یەک لەم دوو خوداوەندە بە دوو پۆلی جیاوازی ناو ڕۆحی گریکی لەقەڵەمدەدا. هەڵبەت جیاکارییەکە دەگەڕێتەوە بۆ زۆر بەر لە نیتشە، بەڵام جیاکارییەکی گرنگە و لە نیتشە بەدواوە تەواو شوێنی خۆی دەگرێت. لێرەوە هەر یەک لە نیتشە و ڕیلکە زۆر ورد لەسەر پەیوەندی نێوان ئۆرفیۆس و دینیۆسیسیشیان نوسیوە. گەر تەماشابکەین ئۆرفیۆس وەک هونەرمەند لە دینیۆسیسەوە نزیکە، ڕاستە ئەو کوڕی ئەپۆلۆیە، بەڵام جیهانی ئەو وەک دینیوسیس جیهانی خرۆشان و شەیداییە، جیهانی مۆسیقایە، هەتا مردنەکانیشیان زۆر لە یەک دەچێت، چونکە دینیۆسیسیش بەدەستی «تیتانەکان» پارچەپارچەدەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم لێکچوونانە برێک جیاوازیی گەورە و بینراویان لەگەڵ خۆیاندا

هەڵگرتووە. خرۆشانی دینیۆسیسی پتر خرۆشانی جەستەییە، خرۆشانی مەستی و سەمای شێتانە و ئۆرگازمی توندە. خرۆشانی ئۆرفیۆسی بە پێچەوانەوە خرۆشانێکی ڕۆحییە، مۆسیقای ئۆرفیۆسی مۆسیقایەکی هێورکەرەوەیە، مۆسیقایەکە پتر لەوەی لەزەتی هەستەوەرانمان بجوڵێنێت، هێمنی و تێرامانمان تێدا دروستدەکات، هێندەی قسە لەگەڵ لەشماندا بکات، جیهانی ناوەوەمان دەدوێنێت، پتر لەوەی ورووژانێکی سێکسوالیانە بێت، عەشقێکی گەورەمان تیا دەچێنێت. هەر یەک لە دینیوسیس و ئۆرفیۆس هونەرمەندن، بەڵام ئۆرفیۆس نوێنەری ئەو بەشەی هونەرە کە بە ناوەوە، بە جاوید، بە ناکۆتاوە گرێماندەدات، واتە نوێنەری ئازادبوونی ڕۆحە. لە کاتێکدا دینیوسیس بە خوماربوون، بە مەستی، بە نارێکی، بە کایۆس و غەریزەوە دەمانبەستێتەوە، ئەو نوێنەری ئازادکردنی جەستەمانە. لێرەوە ڕۆحی دینیۆسیسی لە هونەری مۆدێرندا زۆر گەورەیە... تا شارستانییەت و عەقڵانییەت، تا دیسپلین و ڕێنمایی و ڕێکخستن زۆرتر بن، هونەر بە پەرچەکردارێکی پێچەوانە، پتر بەلای نارێکی و ئەنارشییەت و غەریزەپەرستی و لەزەتگەراییدا دەڕوانێت. ئێمەی مەعشەری شاعیران و هونەرمەندان هەردوو ڕۆحەکە لە ناوماندا دەگەڕێت، لە کوێدا مادییات زاڵبوو دەگەڕێینەوە بۆ ڕۆحانییەت، لە کوێدا ئەخلاق بووە کەرەستەی ئەشکەنجەدان دەگەڕێینەوە بۆ ڕەهەندە دینیۆسیسییەکەی ناومان. بەش بەحاڵی خۆم هونەر وەک کەرەستەی هاوسەنگ ڕاگرتنی ئینسان لە نێوان زەبر و هاوار و خواستی ڕەهەندە دژەکانیدا تێگەیشتووم... هەر کات ناعەقڵانییەت لە لغاوەکانی دەرچوو، هاوار بۆ عەقڵ دەبەین، هەر کات عەقڵ خنکاندینی و دەستی نایە گەروومان هاوار بۆ سەما و خواست و غەریزە دینیۆسیسییەکان دەبەین ڕزگارمانبکات. هەرکات ژیان کورتبووەوە بۆ خواردن و جنس و خەوتن، پەنا بۆ بڵندگەراییەکەی ئۆرفیۆس دەبەین، هەر کاتێکیش لەش و ڕۆح

عەقڵیـان فەرامۆشـکرد، ئەپۆلۆکـەی ناخمـان لـە خـەو هەڵدەسـتێنین.

گـەر سـەرنجبدەین بـە ڕوونـی دەبینیـن کـە ئـەو پرۆسـە عەقلانـی و دیالەکتیکییـەی ڕۆشـنگەریی و مۆدێرنـە لەگـەڵ خۆیانـدا هێنایـان، پـتر دژی دینیۆسیسـیزم بـوو وەک دژی ئەپۆلـۆ بێـت. بۆیـە کاریگـەری دینیۆسیسـی لەسـەر سـەرجەم هونـەری سـەدەی بیسـت و لەسـەر ڕۆحـی ئاڤانگاردانـە لـەم هونـەرەدا زۆر گەورەیـە. لـە هـەر کوێیـەک دیسـپلین و ئەخـلاق و ڕێکخسـتن مرۆڤیـان خـوارد، پێویسـتیمان بـە شـتێک لـە ڕۆحـی دینیۆسیسـی هەیـە بۆئـەوەی بـە نارێکـی و فەوزاسـازییەکەی خـۆی ئازادمانبـکات، ئـەو پێغەمبـەری ئانارشیسـتەکانە. بـەڵام ئۆرفیـۆس نوێنـەری دیـوە جاویدانەکـەی عەشـقە، ئـەو وەک دینیۆسـیس لەشـمان ناخاتـە سـەما، وەک ئەپۆلـۆی باوکـی عەقـڵ و دانایـی و ڕێکوپێکـی بـەرز نانرخێنێـت، ئـەو نەجسـتەگەرای تـەواوە و نـە عەقڵگـەری تـەواو، ئـەو نوێنـەری شـتێکی تـرە، شـتێکی شارسـتانیتر و بڵندگەراتـر لـە غەریزەپەرسـتییەکەی دینیۆسـیس، ئازادتریـش لـە ڕێکپەرسـتییەکەی ئەپۆلـۆ، نوێنـەری ڕۆحـە، نوێنـەری عەشـقە، نوێنـەری بەرزبوونەوەیـە بەسـەر دراوەکانـدا، نوێنـەری ئـەو دیـوەی هونـەرە کـە وامـان لێدەکات بـە گڕ ئەسـتەمدا بچینـەوە. ئـەو نـە نوێنـەری عەقڵـە و نـە نوێنـەری غەریزەیـە، بەڵکـو نوێنـەری هونـەرە بـەو مانایـەی کـە چالاکییەکـە نـە تـەواو دەکەوێتـە نێـو هەرێمـی عەقـڵ و نـە وابەسـتەی غەریزەشـە.

بـەڵام بـۆ ئۆرفیـۆس لـە هـادەس ستایشـی هەمـوو خـوداکان دەکات دینیۆسـیس نەبێـت؟ . پێموابێـت هۆکـە کەمێـک ئاشـکرا بێـت، ئۆرفیـۆس عاشـقە و ڕۆحـی هانـی دەدا بەگڕ ئەسـتەمدا بچێتـەوە و حەقیقەتـی مـردن بشـکێنێت و دابەزێـت بـۆ جیهانـی خـوارەوە تـا ئۆردیـکا بهێنێتـەوە. ئـەو بـەدوای لەشـی ئۆردیـکادا دانەبەزیـوە، بـەدوای شـکاندنی موسـتەحیلدا هاتـووە، دەیەوێـت بـە هونـەر مـردن ببەزێنێـت، عەشـقی ئـەو عەشـقێکی غەریزیـی نییـە، عەشـقێکی سـۆفییانەیە، ڕووی لـە ئـۆرگازم نییـە، ڕووی

لـە سـروتە جەسـتەییەکان نییـە، بەڵکـو ڕووی لـە ئەبەدییەتـە، ڕووی لـە گەیاندنـی هونـەرە بـە بڵندترین پلەکانـی کاریگـەری خـۆی. لێـرەوە زۆر سروشـتییە، دینیۆسـیس فەرامۆشـبکات و ڕێـزی بـۆ دانەنێـت.

ئۆرفیـۆس کـە دڵشـکاو و غەمگیـن لـە هـادەس دەگەڕێتـەوە، دەبێتـە دوژمنـی ئافـرەت، بـە هیجاکەریـان. ئـەو حـەزی لـە «ژن» نییـە، بەڵکـو حـەزی لە ئۆردیکا بـوو، دوای ئۆردیکا شتێک بەو جنسـەوە نایبەستێتەوە، دەگەڕێـت و گۆرانـی دەڵێـت، هەتـا کـە ژنانـی هـەواداری دینیۆسـیس پارچەپارچەیدەکـەن و سـەری لێدەکەنـەوە، سـەرەکەی هـەر بـە ئـاودا دەڕوات و گۆرانـی دەڵێـت، دەڵێـن تـا ئەپۆلـۆ داوای لـێ نەکردوە بێدەنـگ نەبـووە... ئـەو هونەرمەنـدی ئەبەدییـە، تـا کۆتایـی بێدەنـگ نابێـت.

چیرۆکەکـەی ئۆرفیـۆس قووڵ بە مانای هونەر خۆیەوە گرێدراوە.

ئـەو پەیامـەی هونـەر هەڵیدەگرێـت پەیامێکـی ئەسـتەمە، ئەویـش ڕزگارکردنـی مرۆڤـە لـە هەمـوو مەرجـە مادییـەکان، ئازادکردنـی ڕۆح و جەسـتەیەتی لـە هـەر بەنـداو و بەربەسـتێک کـە دێنـە بەردەمـی. کێشـەی ئۆرفیـۆس لەوەدایـە کـە توانای گەورەی خۆی، ئـەو ئامانجە زۆر بڵندگەرایەش کـە بـۆ خـۆی دادەنێـت، لەگـەڵ توانـا و ڕەهەنـدە وجودییـە بچوکەکانـی دیکەیـدا ناگونجێـت... ئـەوەی هونەرمەندێکـی بـەرزە، هیـچ لـەوە ناگۆڕێـت کـە بوونەوەرێکـی لاواز و گومانـکار و دوودڵـە. لـە دوای ئۆرفیۆسیشـەوە چ هونەرمەندێـک لەسـەر ئـەم زەوییـە هەیـە کـە چەنـد هونـەری بەرزبووبێـت، توانیبێتـی بەسـەر لاوازییـە ئینسـانییەکانیدا سـەربکەوێت؟ لـە ڕاسـتیدا ئۆرفیـۆس ناتوانێـت ئـاوڕ نەداتـەوە، چونکـە گـەر ئاوڕنەداتـەوە واتـە نـە گومانـی لـە خـۆی هەیـە، نـە گومانـی لـە هونـەر هەیـە، نـە گومانـی لـەو دونیایـە هەیـە کـە تیـادەژی، نـە گومانـی لـە هاوجنسـەکانی هەیـە، نـە گومانـی لە خـوداکان هەیـە، کەسـێکیش ئـەو گومانانـەی نەبـوو هونەرمەنـد نییـە. هونـەر لـە بنەڕەتـدا لـەوەوە سـەرچاوە دەگرێـت کـە مـرۆڤ ناتوانێـت

دڵنیابێت... مرۆڤی دڵنیاش ناتوانێت هونەرمەند بێت، هونەرمەند چەندە وەک ئۆرفیۆس باوەڕی بە خۆی بێت، لەو گومانە گەورانە پاک نابێتەوە، چونکە پاکبوونەوە لەو گومانانە پاکبوونەوەیە لە ڕیشەکانی هونەر خۆی، هونەر نائارامییەکی هەمیشەیی و نادڵنیاییەکی بەردەوامە. ئۆرفیۆس شێت نییە «وەک فێرجیل دەڵێت»، بەڵکو گومانکارە، ڕۆحێکی دیکارتییە و لە سەردەمی خوداکانی یۆناندا ژیاوە. یەکەمین کەس کە ئۆرفیۆسی وەک گومانکار وەسفکردبێت «سینیکا»یە کە لە سەدەی یەکی زاینیدا ژیاوە، بەڵام سینیکا ئەم گومانە بە گومان لە هونەرەوە نابەستێتەوە... ئۆرفیۆس وەک هەموو هونەرمەندێکی تر کوشتەی ئەوەیە دەیەوێت بە هونەر موعجیزە دروستبکات، بەڵام لە ناخیشیدا سنووری ئیشکردنی هونەر و کاریگەرییەکەی دەزانێت، ئەو دیوارە دەبینێت کە هونەر لە حەقیقەت جیادەکاتەوە... دەزانێت ئەوەی هەلومەرجە مادییەکان دەیسەپێنن هونەر نایگۆڕێت، ئاوڕەکەی ئۆرفیۆس نیشانەی ئاگاداربوونێتی لە ناکۆکی قووڵی هونەر، لە سنووری، لەو بەربەستە هەمیشەییەی جوانییە فەنتازییەکانی ئەو لە دونیا دادەبڕێت. ئۆرفیۆس کە ئاوڕدەداتەوە باوەڕی وایە ئۆردیکا بەر لە ئاوڕەکەی ئەو کەوتۆتەوە هادەس و ئەو تەنیا ئاوڕ لە کەوتنەکەی دەداتەوە. ئۆرفیۆس باوەڕی وایە کە موعجیزەکە لە بنەڕەتدا ڕووی نەداوە... بەبێ ئەو گومانەش نەدەکرا ئۆرفیۆس ئەو هونەرمەندە گەورەیە بێت.

دابەزینەکەی ئۆرفیۆس بۆ هادەس، سەمبولی ئەو سەر کێشییە گەورەیەی هونەرمەندە، توانای لەسەر کارتێکردن لە خوداکان و جانەوەرەکانی هادەس سەمبولی هێزی شارستانی و توانای هونەرە لەسەر ڕامکردنی لایەنە درندەکانی ناو مرۆڤ. ئۆرفیۆس هەمیشە وەک سەمبولێک بۆ هەوڵی ڕامکردن و دەستەمۆکردنی ڕەهەندە ترسناکەکانی ژیان سەیرکراوە، وەک فیگەرێکی شارستانی، بەڵام ڕامکردنی ئەو

دڕندەیە هەتاهەتایە شوێنی گومانە. ژنە باخۆسییەکان کە ئۆرفیۆس پارچەپارچەدەکەن، نوێنەری ئەو هێزە عەوامەن کە لە ڕۆحی هونەرمەند تێناگەن، نوێنەری قەبوولْ نەکردنی هونەرن لەسەر زەوی. خودی کوشتنەکەی ئۆرفیۆس ئاوێنەی ئەو بەدگومانییە هەمیشەیی و دووبارە و گەورەیەیە کە بەرامبەر هونەر هەمانە. ئۆردیکا دەبێت بمرێت چونکە هونەرمەند هەمیشە گومانکارە، ئۆرفیۆسیش دەبێت بمرێت لە بەرئەوەی هونەرمەند هەمیشە شوێنی گومانە. ئۆردیکا دەبێت بمرێت چونکە هەمیشە گومانی ئەوە هەیە خوداکان هونەر قەبوولْ نەکەن و دان بە موعجیزەکانیدا نەنێن، ئۆرفیۆسیش دەبێت بمرێت، چونکە هونەرمەند دەشێت هەمیشە بەر نەفرەت و تووڕەیی خوداکان و عەوام و لایەنگرەکانیان بکەوێت. کوشتنەکەی ئۆرفیۆس و مردنەکەی ئۆردیکا هەردووکیان نیشانەی ئەوەن کە لە بنەڕەتدا هونەر جەوهەرێکی تراژیدی هەیە. کوشتنەکەی ئۆرفیۆس درێژکراوەی ئاوڕەکەیەتی، سەلماندنی ئەو گومانە قووڵەیەتی کە بەرامبەر دونیا هەیەتی... تەسلیمبوونێتی بەو ڕاستییەی کە هونەر هێزێکی ڕاستەقینەی نییە. ئۆرفیۆس شەڕێکی گەورە لەگەڵ مردنی ئۆردیکادا دەکات، بەڵام بەرامبەر مردنی خۆی بەرگرییەکی ئەوتۆ پیشان نادات. کوشتنەکەی ئۆرفیۆس لە دەیان تابلۆدا نیگارکراوەتەوە، لە زۆربەیاندا ئۆرفیۆس بە بێ بەرگری تەسلیمی بکوژەکانی بووە. ئەو ڕاستییەی کە ناتوانێت مردن ببەزێنێت بووە بە حەقیقەتێکی چەسپاو لەلای... ئەم ژیاننامە ئۆرفیۆسییە، ئەم مردنە کە نیشانەی ڕەهەندە هەمیشە تراژیدییەکەی هونەرە، لە ژیان و تێکستی چەندەها هونەرمەند و شاعیردا بەرجەستە بووە.

# وەچەکانی ئۆرفیۆس

## «پۆشکین»

کوشتنی دڕندانەی ئۆرفیۆس، بەدەستی ژنانی هەواداری دینیۆسیس، نیشانەی هەستێکە کە قووڵ لە ڕۆحی شاعیر و هونەرمەندانـدا بنجبەست بووە، هەستکردن بەوەی کە ئەوان بوونەوەری «خۆشەویست نین». خودی کوژران و هەلاهەلابوون بەدەستی ژنان ڕەمزێکە بۆ «خۆشەویست نەبوون». لێرەوە لە زۆر سات و سەردەمدا ڕەتکردنەوەی جنسەکەی دی بۆ شاعیر، دەبێت بە سەمبولی ڕەتکردنەوەیەکی قووڵتر و گەورەتر، ڕەتکردنەوەیەکی کۆمەڵایەتی و گەردونی کە لە ڕقی ئافرەتدا لە «شاعیر» یان «هونەرمەند» تەعبیر لە خۆی دەکات.

چیرۆکی ئۆرفیۆس بەردەوام بە شێوەی جۆراوجۆر لە مێژووی ئەدەبیاتدا و بە فۆرمی جیاواز جیاواز دووبارە دەبێتەوە، جارێک وەک تێکست، جارێک وەک زیندەگی ڕاستەقینەی خودی شاعیران. گلیوم ئەپۆلۆنێر لە جێگایەکدا ڕستەیەک دەنوسێت، جێگای تێڕامانە، ئەو دەڵێت «هەموو شاعیران، لە مەرگێکی پڕئازاری وەک مەرگی ئۆرفیۆسەوە نزیک بوون». کوشتن و هاڕین لە ژێر زەبری مەکینەیەکی گەورەدا ئەوە قەدەری چەندەها شاعیرە. «مەرگی پڕ ئازار» شێوازی زۆرە، بەڵام بە گشتی هەموو مەرگە پڕ ئازارەکانی شاعیر دەچنەوە سەر ئەو بێهیوایی و نائومێدیی و بڕوانەبوونە قووڵەی شاعیران بە خود. یەکەمین شاعیرێکی ئۆرفیۆسی لە خەیاڵمدا بێت «ئەلکسەندەر پۆشکین» ـە. مەرگی پۆشکین مەرگێکی ئۆرفیۆسی پڕ ئازار بوو. هەموو نیشانەکان بۆ ئەوە دەچن کە پۆشکین کوژراوی دەستی پیلانێک بێت کە زۆر لایەن تێیدا بەشداربن، تاوانباری سەرەکی پێدەچێت ناتالیا پۆشکینی هاوسەری بێت. گومان لەوەدا نییە کە دەسەڵاتی تزاریی تەواو لە پۆشکین بێزار

بوو، دوایی نەفیکردنێکی سێ ساڵە لە قەوقاز بە ڕەزامەندی هەیئەتە باڵاکانی دەسەڵاتی قەیسەریی دەگەڕێتەوە بۆ نیشتەجێبوون لە موڵکێکی دایک و باپیدا، شاعیرێکی گەنجە، پڕ خەونە، ناوبانگی هەموو ڕوسیای گرتۆتەوە، بەڵام بیروڕاکانی و بێزاری وای لێدەکەن بیر لە کوشتنی قەیسەر و هەندێجار بیر لە کوشتنی خۆشی بکاتەوە. گەرچی پۆشکین نوسەرێکی پڕ شیعر و پڕ کارە، دەرهەق بەو تەمەنە کورتەی خۆی ژمارەگەلێکی بەرچاو شاکاری جێهێشتووە، بەڵام نیشانەکان بۆ ئەوەدەچن کە هیچ یەک لە شاعیرییەت و بەهرەمەندی بێسنوور و ناوبانگی گەورە، دڵنیاییان بە پۆشکین نەبەخشیوە. دۆخی پۆشکین سەخت بووە، سەفەری بۆ دەرەوەی وڵات لێ قەدەغە کراوە، لە ناو ڕوسیاشدا بێڕەزامەندی کەسە هەرە باڵاکان و مەقاماتە بەرزەکان نەیتوانیوە سەفەربکات. گەرچی بە ڕوکەش دەسەڵاتی قەیسەری شاعیری لە خۆی نزیککردۆتەوە، بەڵام بەردەوام لە ژێر چاوەدێرییەکی زۆردا بووە، هەموو نامەکانی خوێنراونەتەوە، فشارێکی هەمەلایەنەی لەسەر بووە، کە کەم و زۆر لەگەڵ ئەو ڕۆحە ئازادەیدا نەگونجاوە. پۆشکین دواجار لە تەمەنی سی و هەشتساڵیدا لە دووجەنگی «مبارزة ـ دوئێل»ێکی مێژوویدا بەدەستی گیۆرگیس چارلز دێئانتێس دەکوژرێت، ئەفسەرێکی گەنجی فەرەنسی کە پێدەچێت پەیوەندی لەگەڵ ناتالیا گەنچارۆڤی ژنی پۆشکیندا بووبێت. ناتالیا تەمەنی شازدە ساڵ دەبێت کە پۆشکین لە ئاهەنگێکی سەمادا دەیبینێت و خۆشیدەوێت، پۆشکین ئەوسا تەمەنی بیست و نۆ ساڵ بووە، گەرچی وەک شاعیری گەورەی ڕوسیا ناسراوە، بەڵام دایکی ناتالیا بە زەحمەت و دوای دوودڵییەکی درێژ ڕازیدەبێت کچەکەی شوو بە پۆشکین بکات... شاعیرییەت بەشی ئەوە نییە پۆشکین قەبووڵکراوبێت، هەمیشە هێزێکی گەورە هەیە، شاعیر ڕەتدەکاتەوە و دانی پێدا نانێت. وەک دەڵێن دێئانتێس لە ئاهەنگەکانی سەما و لەبەرچاوی کەسانی دەورووبەر

بە تزاردا وەها ئاشکرا چاوبازیی لەگەڵ ناتالیای ژنی پۆشکیندا کردوە، بەجۆرێک ئەو هیچ چارێکی نەمێنێت و ناچاربێت بانگی بەرابەرێنی بکات. پۆشکینی شاعیر شانسێکی ئەوتۆی لەبەردەم دێئانتێسی ئەفسەر و گەنجدا نییە، یەکەمجار ئەفسەرەکەی گاردی قەیسەریی، پۆشکین بە جۆرێکی کوشندە دەپێکێت و ڕۆژێک دواتر لەماڵەکی خۆیدا لە سانت پوترسبورگ گیان لەدەستدەدات. لە دوای کوژرانی پۆشکینەوە تا ئەمڕۆ دەیان کتێب لەسەر مەرگی پۆشکین و ئەو پرسیار و تەلیسمانە نوسراون کە دوای خۆی جێیهێشتوون. بۆ زۆربەی ئەو پرسیارانەش تا ئەمڕۆ وەڵامی ئاشکرا لەبەردەستدا نین، بەڵام وەک دەردەکەوێت بۆ کوشتنی پۆشکین زیاد لە بەرێک و زیاد لە هێزێک و زیاد لە هۆیەک بە ئاگا و بێئاگا کۆبوونەتەوە تا شاعیر بکوژن. پرسیارەکە ئەوەیە بۆ پۆشکین، دێئانتێس داوەتی دووجەنگی دەکات؟. حاڵەتی پۆشکین زۆر دوور نییە لە دۆخی ئۆرفیۆسەوە. ئۆردیکا یەکێک هەیە دەیەوێت لاقەیبکات و دەکەوێتە بنی هادەس و لە دەست ئۆرفیۆس دەردەچێت، ناتالیاش کەسێک هەیە دەیەوێت لاقەیبکات و لە پۆشکینی هەڵکەنێت و ئابڕوی بەرێت. بانگەکەی پۆشکین بۆ دووجەنگی درێژکراوەیەکی سەمبولیکی سەفەرەکەی ئۆرفیۆسە بۆ هادەس... پۆشکین دەبێت دابەزێت بۆ سەر سنووری مەرگ و ژیان بۆئەوەی هەم ناتالیا و هەم ئابڕووی خۆی بهێنێتەوە. برینەکەی پۆشکین برینێکی لە برینی ئۆرفیۆس قووڵترە، ئەگەر ئۆرفیۆس لای ژنانی دیکەی جیا لە ئۆردیکا خۆشەویست نەبێت و بەدەستی ئەوان بکوژرێت، پۆشکین هەستیکردوە لە نزیکترین کەسی خۆی، لە دایکی چوار منداڵەکەیەوە و لە بەرچاوی باش و خراپ دڵە ناسک و شاعیرانەکەی بریندارده‌کرێت. بیرۆکەی «خۆشەویست نەبوون» کە لە کوشتنەکەی ئۆرفیسەوە دەخزێتە ژیانی شاعیرانەوە لای پۆشکین تەواو بەجۆرێکی ترازیدی بەرجەستەدەبێت، تەواوی چیرۆکەکە وامان

بۆ دەردەخات وەک ئەوەی ئۆرفیۆس لێرەدا بەدەستی خودی ئۆردیکا بکوژرێت. ئاخۆ بە ڕاست ناتالیا گەنچارۆڤ، خوێنی پۆشکینی لە ملە؟ . دەنگۆی پەیوەندی نێوان ناتالیا و دێئانتێس دەگەڕێتەوە بۆ هەندێک نامەی نهێنی و بێناو کە ئاڕاستەی پۆشکین دەکرێن، دواجاریش لە ئاهەنگێکی گەورەی دەرباردا دێئانتێس بەجۆرێک لە ناتالیا نزیکدەبێتەوە هەموو ئەو دەنگۆیانە بۆ پۆشکین دەسەلمێنێت کە پێشتر کەوتوونە بەرگوێی. ئاخۆ نامەکان ڕاستیان بە پۆشکین گوتووە یان نا؟ ئاخۆ ئەو ڕەفتارەی دێئانتێس کە ڕاستەخۆ وا لە پۆشکین دەکات بانگهێشتی دووجەنگی بکات، پلانکراو بووە، ناتالیا بەشێک بووە لە پلانەکە، یان دێئانتێس تەنیا گەنجێکی لەخۆبایی بووە کە هەڵەیەکی کردوە و هیچی تر؟ لە ڕاستیدا هەموو پرسیارەکان تا ئەمڕۆ بێوەڵامن. ئەوەی گرنگە ئەوەیە هۆکان هەرچییەک بووبێت، دڵی پۆشکین بەجۆرێکی گەورە شکاوە و ئازاری چەشتووە، دووجەنگی و مردنی هەڵبژاردوە، هەستیکردوە خۆشەویست نییە، هەستیکردوە شیعر لێرەدا ناتوانێت هیچ بکات، گومانەکەی هەمان گومانی ئۆرفیۆسە کاتێک ئاوڕدەداتەوە. ئەو ساتەی ئۆرفیۆس ئاوڕدەداتەوە و ئەوساتەی پۆشکین بانگی دووجەنگی دەنوسێت دوو ساتی قووڵی گومانی شاعیر و هونەرمەندن لە مانا و سوود و نرخی شاعیرییەت.

لێرەدا سێ تەفسیرمان لە بەردەستدایە. یەکێکیان دەڵێت، خوێنی پۆشکین لە ملی ناتالیا گەنچارۆڤە، ئەو ژنێکی چاوباز بووە و بێئەوەی گوێبداتە ناوی پۆشکین چۆتە پەیوەندییەکەوە لەگەڵ ئەو ئەفسەرە فەرەنسییە گەنجەدا، ئەوە مایەی مردنی پۆشکینە، ئەو ئەو هەستە قووڵەی گومانی لە دڵی پۆشکیندا چاندووە، بەجۆرێک گومان لە خۆی بکات و بیەوێت خۆی بخاتە ئەو مەترسییەوە. ئەو بۆ پۆشکینی سەلماندووە کە بە ڕاستی کەسێکی قەبووڵکراو نییە، خۆشەویست نییە،

ناوبانـگ و بەهـرە شـتێکی تایبەتیـان پـێ نەبەخشـیوە، ئـەو نمونـەی ئـەو ژنـە بێباکانەیـە کـە شـاعیرییەتیان بـۆ گرنـگ نییـە و نازانـن لەگـەڵ چ جۆرە ڕۆحێکدا سـەروکاریان هەیـە. تەفسـیری دووەم ئەوەیـە کـە پۆشـکین خـۆی بـەدوای جۆرێـک لـە خودکوژیدا گـەڕاوە، مەسـەلەی پەیوەنـدی ناتالیـا و دیئانتێـس لـە دەنگۆیـەک بـەولاوە هیچـی تـر نەبـووە، ئـەوە گومانـی پۆشـکینە لـە خـۆی و گەڕانێتـی بـۆ بەهانەیـەک بـۆ مـردن وایکـردوە ئـەو چیرۆکـە بکاتـە هۆیـەک و مەسـەلەی دووجەنگییەکـەی لەگـەڵ دیئانتێسـدا وەک شانۆیەکی ئەلتەرناتیـڤ بـۆ خودکوژی بەکاربهێنێـت، گـەر وابێـت لێرەدا پۆشـکین گەلێـک لـە ئۆرفیـۆس نزیکدەبێتـەوە، گـەر ئاوڕەکـەی ئۆرفیـۆس بـۆ ئـەوە بێـت کۆتاییەکـی ئەفسـانەیی و ئەبەدیـی ببەخشـێتە عەشـقێکی گـەورە، لێرەشـدا پۆشـکین لـە دوای کۆتاییەکـی میتۆلۆگـی و سـیحراوی و پـڕ تەلیسـمدا بـووە بـۆ ژیانێکـی شـاعیرانەی قەشـەنگ. کاتێـک شـاعیر تـەواو بـڕوای بـە خـۆی و بـە شـیعر و بـە ژیـان نامێنێـت هەوڵـدەدات لـە ڕێـگای دروسـتکردنی کۆتاییەکـی ئەفسـانەییەوە، ئـەو دوودڵییـە قووڵـەی خـۆی تێپەڕێنێـت، وەک ئـەوەی بیەوێـت بـە مەرگـی خـۆی ئـازاری دونیـا بدات. تەفسیری سێهەم کـە پێدەچێت تەفسـیرە دروسـتەکە بێـت، پێیوایـە کوشـتنی پۆشـکین کارێکـی دەسـتەجەمعییە، دەوڵـەت و حوکمـی قەیسـەریی و دابونەرێـت و خێـزان و ژن و پۆلیـس پێکـڕا تێیـدا بەشـداربوون. لێرمەنتۆڤـی شـاعیر لـە قەسـیدە بەناوبانگەکەیـدا دەربـارەی کوشـتنی پۆشـکین کـە هـەر بـە نـاوی «مردنـی شـاعیر» ـەوەیە تـەواو دەسـەڵات وەک بکـوژی شـاعیر دەسـەلمێنێت و پێیوایـە پۆشـکین بـەزۆر ئاخنراوەتـە ئـەو جوغـزەوە، بەوەشدا ئـەو «کۆیلـەی شـەرەف» بـووە نەیتوانیـوە خـۆی لـەو دوو جەنگییە کوشـندەیە بدزێتـەوە. دیـارە دواتـر لێرمەنتـۆڤ لەسـەر ئـەم قەسـیدەیەی نەفیدەکرێـت و دوای ماوەیەکـی کـورت ئەویـش لـە دووجەنگییەکـی بێمانـادا و لـەو پـەری گەنجیـدا ژیـان لـە دەسـت دەدات. لێـرەدا ئـەو وێنـە دێرینـە

دووبارەدەبێتەوە کە شاعیران بەدەستی هێزە گەورەکان، بە هۆی کینەی ئەوانەوە، بە پیلانی ئەوان لە نێودەچن، وەک چۆن ئۆرفیۆس بە پیلانی دینیۆسیس دەکوژرێت. کوشتنی شاعیر لێرەدا هەرگیز وەک خواستی فەردی کەسێک سەیرناکرێت، بەڵکو وەک کاری دارێژراوی هێزێکی گەورە سەیردەکرێت کە بوونی شاعیر بە زیاد و ناپێویست دەزانن... لێرەدا کینەی ئەفلاتونی لە شاعیران، کینەی دینی، کینەی عەوام، کینەی ڕەگەزەکەی دی لە شاعیران پێکڕا یەکدەگرن و ئەو هاوپەیمانێتییە کۆن و دووبارە و هەمیشەییە دروستدەکەنەوە کە شاعیر بەرەو مردن دەبات. کوشتنی پۆشکین بەوجۆرە تراژیدییە، دووبارەکردنەوەی ئەو وێنەیەیە کە شاعیر بوونەوەرێکە موعجیزەکانی هەمیشە کاریگەر نین... هێزی شیعر وەرناگەڕێتە سەر هێزێکی مادی، پۆشکین وەک ئۆرفیۆس نیشانەی ئەبەدی نوشوستی شاعیرانە لەوەی خۆشەویست بن، لەوەی بگەنە دڵ و ڕۆحە بچوک و نابیناکان، بگەنە ئەوەی وەک خۆیان دەخوازن لەگەڵ هێزی خوداکاندا بجەنگن... پۆشکین کۆپییەکی تری نوشوستی ئۆرفیۆسییە، کۆپییەکی نوێیەتی، وێنە ڕاستەقینەکەیەتی کاتێک لە فیگەرێکی ئەفسانەییەوە دادەبەزێت و دەبێت بە شاعیرێکی واقیعی. تەفسیرەکان بە هەر لایەکدا بڕۆن ئەوە ناشارنەوە کە پۆشکین منداڵی ئۆرفیۆسە. دووجەنگییەکەشی دەرەنجامی ئەو گومانە قووڵەیەتی لەوەی هونەر و شاعیرییەت بتوانن شەرەفی بپارێزن، هەستدەکات وەک ئۆرفیۆس تاقیکردنەوەی بەزاندنی مردنی بڕیوە، بەڵام گومانی لە خۆی هێشتا هەر قووڵ و نەبوونی دڵنیایی لە ڕۆحیدا هێشتا هەر گەورەیە... مردنەکەی وەک ئۆرفیۆس بەدەستی مەکینەیەکی لە خۆی گەورەترە کە ناتوانێت ڕایبگرێت. بکوژەکانیشی ئەوانەن کە لە شیعر تێناگەن، بە کوشتنیشی ئەوە تۆماردەکاتەوە کە شاعیران لە هەموو ئان و زەمانێکدا دوژمنی گەورەیان هەیە.

## کۆرنیامێنتال

لە نۆی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٨ دا گیوم ئەپۆلونێر لە تەمەنی سی و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. هۆی مردنەکەی نەخۆشییەکی تایبەتی و ناوازە نەبوو، ڤایرۆسێک نەبوو کە تایبەت دەیدات لە شاعیران و داهێنەران و مەرگێکی ئەفسانەییان پێدەبەخشێت. مەرگێک نەبوو وەک مەرگی هاوپیشەکەی ئەلکساندەر پۆشکین... مەرگێکی تایبەت، پڕ تەلیسم، پڕ پرسیار. بەڵکو مەرگێکی سادەبوو، بە پەتایەک کە لەگەڵ ڕۆحی ئەپۆلۆنێردا ملیۆنەها گیانی تری کێشا.

ئەوەی ئەپۆلۆنێر بەوردی بخوێنێتەوە هەستدەکات وەک شاعیر هەمیشە ویستوێتی مەرگێکی ناوازەی هەبێت. ئەو یەکێکە لەوانەی باوەڕی زۆر بە تایبەتمەندیی ژیان و مردنی شاعیران هەیە. ڕاستە زۆربەی شاعیران خۆیان بە جنسێکی جیاواز لە ئادەمیزادانی دی دەبینن، هەندێکیان هێندەی دوای ژیان و مەرگی شاعیرانە دەکەون، ئەوەندە خودی شیعر نابێتە خولیایان، بەڵام ئەم هەستە و ئەم بابەتە هەموو جارێک لە نوسیندا دەرناکەوێتەوە، کەچی لە ئەدەبیاتی ئەپۆلۆنێردا قورساییەکی زۆر گەورەی هەیە.

ئەپۆلۆنێر بە پەتایەک مرد کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستدا و بە چەند شەپۆلێکی گەورە لە ئەوروپای دا و ملیۆنەها قوربانی جێهێشت. پەتاکە بە «ئەنفلۆنزای ئیسپانی» دەناسرێت، هەندێک سەرچاوە دەڵێن کە نزیکی ٢٥ ملیۆن مرۆڤی کوشتووە، هەندێکی دیش دەڵێن ژمارەی ڕاستەقینەی قوربانییەکان لەسەروو پەنجا ملیۆنەوەیە. لە ناودارترین ئەو کەسانەی بوون بە قوربانی ئەنفلۆنزای ئیسپانی، سۆسیۆلۆگی ئەڵمانی ماکس ڤێبەر و نیگارکێشی نەمساوی، ئیگۆن شیللی و سۆفیا فرۆیدی کچی سیگمۆند فرۆید بوون، بەڵام لە هەمووان ناودارتر خودی ئەپۆلۆنێرە.

مردنی ئەپۆلۆنێر بە پەتایەکی لەوجۆرە بە هەموو پێودانێک مەرگێکی ئۆرفیۆسی نییە... ئەوەی بە ڤایرۆسێک بمریت کە لەگەڵ ئەودا گیانی ملیۆنەهای دیکەی چنیوەتەوە، مەرگی ئەو تایبەتمەندێتیانە وندەکات کە شاعیران بۆ مردن پێویستیان پێیەتی. ئەپۆلۆنێر پێشتر بەدوای مەرگێکی پاڵەوانکارانەدا چووبوو بۆ بەرەکانی جەنگی جیهانی یەکەم، لەوێ بریندارییش دەبێت، بەڵام ڕێکەوت ئەو دەرفەتەی پێنابەخشێت، وەک لۆرد بایرۆن لە مەیدانەکانی شەڕدا بمرێت. ئەو دەرفەتەی پێ نابەخشێت وەک فیدریکۆ گارسیا لۆرکا بەدەستی دوژمن و لە شەوێکی پڕ ئەستێرەدا شەهید بکرێت... لۆرکاش وەک ئەپۆلۆنێر هەر بە سی و هەشتساڵی مرد، بەڵام بە کوشتنی، مەتەڵێکی گەورە و مەرگێکی شاعیرانەی دوای خۆی جێهێشت. پێش لە کوشتنی جیڤارا، مەرگی لۆرکا ڕەمزێکی گرنگی شۆڕشگێڕی و یاخیبوون بوو لە هەموو دونیادا.

بەڵام ئەپۆلۆنێر گەر نەیتوانیبێت مەرگێکی وا ئۆرفیۆسی بۆ خۆی زامنبکات، قارەمانێکی ئۆرفیۆسی بۆ جێهێشتووین کە کەسایەتی شاعیر کۆرنیامێنتالە، لە چیرۆکی « شاعیرە کوژراوەکە» دا. ئەپۆلۆنێر لە کەسی کۆرنیامێنتالدا نمونەی ژیانێکی ئۆرفیۆسیی نوێمان پێشکەشدەکات... کۆرنیامێنتال وەک منداڵێکی بەدبەخت دێتە دونیاوە، هەر هێندەی ئەو لە دایک دەبێت دایکی دەمرێت، باوەپیارەکەی کە ساختە بارۆنێکە، شەوێک لە مۆنتی کارلۆ و لەسەر مێزی قومار هەموو سامانی خۆی دەدۆڕێنێت و خۆی دەکوژێت. لەو سەرەتایانەوە سیفەتی نەفرەت لێکراوی کۆرنیامێنتال دەردەکەوێت، وەک کەسێک کە بوونی هاوبەست و گرێدراوی تراژیدیایە. دوای ئەو مامۆستایەکی هۆڵەندی سەرپەرشتی پەروەردەبوونی دەگرێتە ئەستۆ، بە جیهانی ئەدەبیاتی ئاشنادەکات و بە کتێبەکانی سێرڤانتس و گۆتەی دەناسێنێت. لە پاش مردنی ئەو دەچێتە پاریس و لەوێ ژیانی خۆی وەک شاعیر و شانۆنوس دەست

پێدەکات. لەوێ حەز لە سەماکەرێک بە ناوی تریزتۆیزا دەکات، خانم بۆ ماوەیەکی کورت پەیوەندی لەگەڵ کۆرنیامێنتالدا دەبەستێت، بەڵام هەر زوو نیشانە ئۆرفیۆسییەکان لە ژیانیدا دەردەکەون، کاتێک دڵدارەکەی زۆر ئاسان و بێباک بۆ شاعیرۆچکەیەکی خراپ دەستبەرداری دەبێت بە ناوی پۆپۆناتەوە. کۆرنیامێنتال بۆئەوەی دڵی خۆشەویستەکەی بەدەستبهێنێتەوە دەستدەکات بە گەشتێکی دوور و درێژ بەدوای دوو دڵدارەکەدا، بەشێکی تێکستەکە وەسفی ئەو سەفەرە درێژەی کۆرنیامێنتالە لە شار و جێگا جیاوازەکانی ئەورووپادا بە دوای تریزتۆیزادا. گەشتەکەی کۆرنیامێنتال درێژکراوەیەکی سەمبولی گەشتەکەی ئۆرفیۆسە بۆ هادەس، وەک چۆن ئەو دەیەوێت خۆشەویستەکەی لە بنی دۆزەخ دەربهێنێت، کۆرنیامێنتالیش دەیەوێت خۆشەویستەکەی لە بنی دۆزەخی ئەورووپادا بەدەستبهێنێتەوە. کۆرنیامێنتالیش وەک ئۆرفیۆس وادەردەکەوێت بڕوایەکی گەورەی بە هێزی هونەری خۆی هەبێت، بەڵام هەڵگری ئەو سیفەتە هەمیشەییەی شاعیرانیشە کە وا هەستدەکەن خۆشەویست نین، نەفرەت لێکراون. لەم تێکستەی ئەپۆلۆنێردا دژایەتی نێوان شیعر و جیهان دەگاتە ئاستێکی زۆر باڵا. لە چیرۆکی ئۆرفیۆسدا وادەرناکەوێت وەک ئەوەی داهێنانی ئۆرفیۆس مایەی کوشتنی بێت، ڕقی ژنان لە ئۆرفیۆس دەگەڕێتەوە بۆ ڕقی ئۆرفیۆس لە ژنان. بەڵام لەسەدەکانی دواتردا هەستی شاعیران بە تەنهایی و گۆشەگیری و دابڕان و نەفرەت تا دێت گەورەتر دەبێت، ئەو هەستەی کە ئەوان دونیایان بە دڵ نییە و دونیاش ئەوانی بەدڵ نییە، دەبێتە هەستێکی زاڵ. کۆرنیامێنتال لە مێرسیلیا تووشی دەبێت بە تووشی کەسێکی سەیرەوە کە دروشمی سەرەکی دژایەتی شاعیرانە... کیمیاگەرێکی ئەڵمانییەوە بە ناوی «تۆگراس»ـەوە. ئەپۆلۆنێر لە کەسایەتی تۆگراسدا تەعبیر لەو ڕۆحە زانستخواز و عەقڵییەتە داخراوە نوێیە مۆدێرنە دەکات کە تەواوی جیهانبینی مرۆڤ بە قازانجەوە گرێدەداتەوە. لە مێرسیلیا،

کۆرنیامێنتـال تێـدەگات کـە خۆشەویسـت نەبوونـی شـاعیران تەنیـا لـەوەدا کـورت ناکرێتـەوە کـە دڵدارەکانیـان تێیـان ناگـەن و خۆشـیان ناوێـن، بەڵکـو دەگاتـە کینەیەکـی جەماوەریـی گەورەتـر، ئـەوەی شـاعیران قەبـووڵ ناکـەن تەنیـا عەشـیقەکان نیـن، بەڵکـو تـەواوی جەمـاوەرە. تۆگـراس بـاوەڕی بـە لـە ناوچـوون و نەمانـی شـاعیران هەیـە، وەک مەخلوقاتـی بێسـوود دەیانبینێـت، وەک کۆمەڵێـک بوونـەوەر کـە ناوبانـگ و شـکۆی خۆیـان لەدەسـتداوە، وەک جنسـێکی مشـەخۆر کـە دەبێـت نەمێنـن. ئـەو نوێنـەری پۆڵـە پێچەوانەکـەی کۆرنیامێنتالـە، لـە کاتێکدا کۆرنیامێنتـال شـاعیران لـە ئاسـتی خوداوەندانـدا ڕادەگرێـت، ئـەو لـە هەمـوو شـوێنێک بانـگ بـۆ قڕانکردنیـان هەڵـدەدا و خەڵکـی عەوامیـان دەکاتـە گـژدا.

تۆگـراس لـە چیرۆکەکـەی ئەپۆلۆنێـردا بەمجـۆرە قسـەدەکات «شـاعیران دەبێـت دەسـتبەرداری شـکۆی خۆیـان بـن بـۆ زانـاکان، بـۆ فەیلەسـوفان، بـۆ ئەکرۆپاتـەکان، بـۆ فیلانسـرۆپییەکان، بـۆ کۆمەڵناسـەکان. شـاعیران ئەمـڕۆ جگـە لـەوەی پارەیـەک وەردەگـرن کـە شایسـتەی نیـن، کەڵکـی هیچیـان نییـە. ئـەوان هـەر هیـچ کار ناکـەن... شـاعیران کەسـیان مافـی ژیانیـان نییـە... دەبێـت لەسـەر زەوی نەمێنـن. ئـەی جیهـان لـە نێـوان ژیـان و شـیعردا یەکێکیـان هەڵبژێـرە... لـە سـبەێنێ وە سـەردەمێکی نـوێ دەسـتپێدەکات، چیتـر شـیعر لەسـەر ڕووی زەمیـن نامێنێـت... هەمـوو شـاعیرانیش سـەردەبڕدرێن».

ئەمـە تیـۆرەی تۆگراسـە، کـە دواجـار خەڵـک دژی شـاعیران هانـدەدات و لـە هەمـوو جێگایـەک ڕاوە شـاعیر دەسـت پێدەکرێـت، دەگیرێـن و دەخرێنـە زیندانـەوە و دەکوژرێـن. لـەو پەلامـارە گەورەیـەدا بـۆ سـەر شـاعیران کۆرنیامێنتـال ناتوانێـت خـۆی ونبـکات، خەڵکـی تـوڕە، عەوامـی ڕاپەڕیـو دژی شـیعر دەیگـرن و دەیکـوژن و پانیدەکەنـەوە.

کوشـتنی کۆرنیامێنتـال، کوشـتێکی تـەواو ئۆرفیۆسـییە. یورگـن

گریمیش لە کتێبەکەیدا دەربارەی ئەپۆلۆنێر تەواو پێ لەسەر سروشتی ئۆرفیۆسیانەی مردنەکەی کۆرنیامێنتال دادەگرێت. سەفەری کۆرنیامێنتال بەدوای دڵدارەکەیدا و کوشتنی بەدەست پۆلە عەوامێکی تورە لە دەستی شیعر و پانکردنەوەی، دووبارەکردنەوەیەکی نوێی ئەفسانەی ئۆرفیۆسە. هەر دوو کۆرنیامێنتال و ئۆرفیۆس تەواو ئەزموونی چارەنوسی تراژیدی شاعیر دەژین و لە پشتیشییەوە یەک ڕاستی گەورە وەستاوە کە داهێنانی گەورە بەشی ئەوە نییە مافێکی تەواوی ژیان بە شاعیر ببەخشێت، هێزی هونەر زۆرجار ناگاتە ئەوەی دەستی بکوژەکان بگرێت و چەقۆ و بەرد و گوللەیان بگێڕێتەوە. کۆرنیامینتال خۆی بە خوداوەندی شیعر دەزانێت، لێرەوە بۆ مەرگێکی شاعیرانەش دەگەڕێت، ئەوی ڕۆژ کە دەچێت بۆ لای تۆگراس، بێئەوەی غروری شاعیرانەی لەدەستدابێت دەڵێت «من کۆرنیامێنتالم، گەورەترین شاعیری زیندووی رووی زەوی. زۆرجار ڕوو بە ڕوو چاوم بڕیوەتە چاوی خودا، من شەوق و بریقەی خودابیم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرتووە، ئەوەش چاوە ئینسانییەکانی منیان لاوازکردوە. من ئەبەدییەت ژیاوم. بەڵام کە ڕۆژ و ساتی من هات، هاتووم، بۆ ئەوەی لە پێشدەمی تۆدا بڵندببمەوە».

کۆرنیامێنتال ئەو ژیان و مردنە شاعیریانەیە دەژی کە ئەپۆلۆنێر خۆی دەستی ناکەوێت. لەم تێکستەدا ئەوە دەخوێنیەوە ئەپۆلۆنێر چەند بڕوایەکی کەمی بە هێزی شیعر بۆ سەر دونیا هەبووە. ستاتیکای شیعر لەوەدا بەرجەستە دەبێتەوە کە بە جیهان نامۆیە، جوانی داهێنان لەوەدایە کە کاریگەرییەکی کەمی لە سەر دونیا هەیە، هەمیشەش شتێک پێشکەشدەکات کە بە جیهان نامۆیە. جارێکی تر شاعیر ئەو مەخلوقە گەڕۆکە نەسرەوتەیە کە هەم خۆشەویستی و هەم داهێنانی خۆی بە جیهان دەبەخشێت، بەڵام دونیا نە عەشقی شاعیرانی قەبووڵە و نە داهێنانیان. دوای مردنی کۆرنیامێنتال، هاوڕێیەکی کە بە «باڵندەکەی

بەنیـن» لـە چیرۆکەکـەدا نـاوی دێـت، وێنەگـر و پەیکەرتاشـێکی دۆسـتی کۆرنیامێنتالـە، لەسـەر داوای تریزتۆیـز پەیکەرێـک بـۆ شـاعیر دروسـتدەکات. هەندێـک دەڵێـن ئـەم کاراکتـەرە ئاماژەیـە بـۆ کەسـی پاپلـۆ بیکاسـۆ کـە هاوڕێـی نزیکـی ئەپۆلۆنێـر بـووە، دەشـڵێن کـە تریزتۆیزیـش هـەر ئاماژەیـە بـۆ ژنێکـی ڕاستەقینە لـە ژیانـی ئەپۆلۆنێردا، بـە جۆرێـک کـۆی چیرۆکەکـە وەک جـۆرە ژیاننامەیەکـی مەجـازی بـۆ خـودی ئەپۆلۆنێـر وایـە. واتـە ئەپۆلۆنێـر بـە چەنـد سـاڵێکی کـەم بـەر لەمردنـی لـە ئاسـتی مەجازیـدا ئـەو ژیـان و مردنـە شـاعیرییەی بۆ خـۆی نوسـیوەتەوە کـە ئارەزوویکـردوە. پێدەچێـت هەسـتیکردبێت، کـە ژیـان ناتوانێـت ئەوجۆرە مەرگە ئۆرفیۆسـییەی پێشکەشـیبکات، ئیـدی لەسـەر شـانۆ و بـە نمایـش و لـە ژێـر ناوێکـی خـوازراودا، ئـەو مەرگـەی پێشـکەش بـە خـۆی کـردوە.

کۆرنیامێنتـال وەک ئۆرفیـۆس پێویسـتی بـە هیـچ ئاوڕێکـی تراژیـدی نییـە، لـە ژیانـی پۆشـکیندا خـودی ئـەو سـاتە وەختەمـان بینـی کـە نزیکـە لـە سـاتی ئـاوڕە ئۆرفیۆسـییەکە... کۆرنیامێنتـال ڕاسـتە و ڕاسـت لەسـەر یـەک هێـڵ، بـە بڕوایەکـی تونـدەوە، بـە ئەزموونـی شـاعیرانی پێـش خۆیـەوە بـەرەو مـردن دەڕوات، دەزانێـت ئـەوەی ئۆردیـکای لـە کیـس دەدات ئاوڕکـەی نییـە، دەزانێـت ئۆردیـکای پێـش وەخـت و هـەر لەسـەر زەمیـن لـە دەسـتچووە. ژیانـی کۆرنیامێنتـال وەک ئـەوە وایـە ئۆرفیـۆس دابەزێـت بـۆ بنـی هـادەس و لـەوێ ببینێـت کـە ئۆردیـکا نایەوێـت لەگەڵیـدا بگەڕێتـەوە و هـەر لەوێـدا بـە دەسـتی ژنانـی باخۆسـی بکوژرێـت و بکەوێتـە بنـی دۆزەخ و هەرگیـز نەگەڕێتـەوە. شـاعیرییەت لەسـەردەمی نوێـدا بەشـی ئـەوە نییـە کـە خـوداکان ئۆردیـکا بـە ئۆرفیـۆس ببەخشـنەوە. شـاعیران لـەم سـەردەمەدا دادەبـەزن بـۆ هـادەس و دەزانـن لەوێـدا دەکوژرێـن و ناگەڕێنـەوە.

## یارۆمیل

ئایا ئۆرفیۆس کاراکتەرێکی بەهێز بوو یان لاواز؟.

ئـەم پرسـیارە، لـە پرسـیارە سـادە و ئاسـانەکان نییـە. چونکـە وەڵامەکـەی زۆر شـتمان دەربـارەی کاراکتـەری شـاعیران و داهێنـەران بـۆ دەستنیشـاندەکات. ئۆرفیـۆس بەسـەرێک زۆر بەهێـزە، بـە گۆرانـی و مۆسـیقاکەی دەتوانێـت کار لـە هەمـوو ڕۆحلەبەرێـک بـکات، ئەوەنـدەش لـە هێـزی خـۆی ڕازییـە، بیەوێـت بـە گـژ مردنـدا بچێتـەوە، بیەوێـت ئەسـتەمترین یاسـای بـوون بشـکێنێت و هەوڵبـدات کەسـێک لـە هادەسـەوە بگێڕێتـەوە بـۆ ژیـان. ئـەوە بەڵگـەی غرورێکـی بێسـنوور و هێزێکـی لـە بـن نەهاتـووە. بـەڵام ئۆرفیـۆس لـە هەمانکاتـدا بـە ئاوڕەکـەی، بـەوەی کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ دونیـا ناتوانێـت لەدەسـتدانی ئۆردیـکا لـە بیربـکات، بـەوەی زۆر ئاسـان و بێبەرگـری بەدەسـتی ژنـان دەکوژرێـت، لاوازییەکـی بەرچـاوی تێدایـە.

شـاعیرانی دوای ئۆرفیـۆس، وەک ئـەو دەبنـە هەڵگـری هەردوو سـیفەتەکە، غرورێکی بێسـنوور و لاوازییەکی بەرچاو. شـاعیران بەسـەرێک بە گژ ئەسـتەمدا دەچنـەوە و بەسـەرێکی دیـش بەرگـەی بچوکتریـن وەسوەسـەی ناخیـان ناگـرن. ئـەو خـۆ بـە گـەورە زانینـەی کـە لای کۆرنیامێنتـال بینیمـان، ئـەوەی پێیوایـە بـاق و بریقـی خودایـی لـە چاوانـی خۆیـدا هەڵگرتـووە، بەدرێژایـی مێـژوو بەشـێکی گرنگـی کاراکتـەری شـاعیران بـووە. «موتەنەبـی» بـاوەڕی وەهـا بـوو کـە ئـەو پێغەمبەرێکـی نوێیـە، «حەلاج»یـش لـە نێـوان خـودی خـۆی و خـودی ئیلاهیـدا بەربەسـتێکی نەدەبینـی. «شـێخ عەبدولقـادری گەیلانـی»ش بـاوەڕی وابـوو، گـەر بیەوێـت دەتوانێـت دەرگاکانـی جەهەنـەم داخـات. ئەمجـۆرە غـرورە بێسـنوورە بـە شـێوەی جیـاواز و بـە پلـەی جیـاواز لـە هەمـوو شـاعیرێکدا هەیـە. شـاعیران بەبـێ ئەوجـۆرە لەغـروری بێسـنوور، مانایـان نییـە... غـرور هەرگیـز لـە شـاعیرییەت جیانابێتـەوە، هەتـا شـاعیرە هـەرە شـەرمنەکانیش، ئەوانـەی بـەردەوام خۆیـان بـۆ دواوە

کێشاوەتەوە، گۆشەگیربوون، خاڵی نەبوون لە برێک لە غروری شاعیرانە. ئەم غرورە بەرەنجامی ئەو هێزە گەورەیەیە کە وشە هەیەتی، شاعیران بە هێزی بێسنووری وشە هوشیارن، لەجەوهەردا ئەو هێزەیە وادەکات کەسانی ئەفلاتونی یان دیندار یان مەعشەری حاکمان لە زۆربەی ئان و زەمانەکاندا دژی شاعیران بوەستنەوە کە چەکێکی زۆر کوشندەی وەک زمانیان لە بندەستدایە.

بەڵام ئەم غرورە لاوازییە دەرەکییەکانیان ناشارێتەوە. گەر لە قووڵاییدا سەیربکەین ململانێیەکی بەرچاو لە ژیانی شاعیراندا لە نێوان «کامڵبوونی ناوەکی» و «لاوازیی دەرەکیدا» دەبینین. شاعیران و داهێنەران زۆرجار لە ناخدا، بوونەوەرێکن لەگەڵ بڵندگەرایی و کەماڵ و جوانیدا سەروکاریان هەیە، بەڵام بۆ دەرەوە مرۆڤێکن نە دەتوانن ئەو کەماڵ و جوانییە ناوەکییە بخەنە سەر زمانی کار، نە دەورووبەریش وەک بوونەوەری کامڵ تەماشایاندەکات، نەدەتوانن قەناعەت بە دونیاش بهێنن بەدوای جوانی و بڵندگەرایی و کامڵیدا بگەڕێت. لێرەوە گومانی ئۆرفیۆسیانە، شاعیران بەرەو لاوازییە قووڵەکانیان دەبات. زۆرجار بەرەو ئەوەی دوو دەموچاوی زۆر جیاوازیان هەبێت. یەکێک لە کاراکتەرە هەرە لاوازەکانی شاعیر لە مێژووی ئەدەبیاتی نوێدا میلان کۆندێرا لە ڕۆمانی «ژیان لە جێگایەکی دیکەیە» پێشکەشماندەکات. ڕۆمانەکە ژیاننامەیەکی درێژی شاعیرێکە بە ناوی یارۆمیل «تاکە کاراکتەرێکی ڕۆمانەکەیە کە ناوی هەبێت». کتێبەکە لەگەڵ لەدایکبوونی یارومێل دەستپێدەکات و بە مردنی کۆتایی دێت. خودی ڕۆمانەکە چیرۆکی گەورەبوونی شاعیرێکی گەنجە لە ناو سیستمی کۆمۆنیستیدا. باوکی یارومیل، هەر زوو بە دەستی نازییەکان دەکوژرێت و ئەو لە بەردەست عەشیقێکی دایکیدا کە نیگارکێشێکی سوریالییە گەورە دەبێت. دایکی بەجۆرێکی نەخۆشانە و بە شێوەیەکی نائاسایی گیرۆدەی کوڕەکەیەتی و دەیپارێزێت و بەخۆیەوە

دەنوسێنێت. ئەو لەمنداڵییەوە سەرنجی بەهرەی شاعیرانەی کوڕەکەی دەدات و دەیەوێت بە هەر جۆرێک بووە بیکات بە شاعیر... بەلام شاعیر بوون هاوشانی گەورەبوونی خود و گەڕانیشە بە دوای شوناسی تایبەتیدا. یارۆمیل دەیەوێت خۆی بێت، دەیەوێت کۆپی هیچ کاراکتەرێکی تر نەبێت، دەیەوێت لەوە دەرچێت لە بن باڵی دایکییەوە سەیری دونیابکات. ترسی ئەوەی لە سەرەتاوە بە جیدی وەرنەگیرێت، بە بچوک ببینرێت، ڕەتبکرێتەوە بەشێکە لە ژیاننامەی هەرزەکاریی یارومیل، بەشێکە لە دوودڵییە قووڵەکانی، دامەزرێنەر و دروستکەری کۆی کاراکتەریی دوایشێتی. ئەو شاعیرێکی بە بەهرەیە، بەلام ئەو لە سەرەتاوە جۆرە شیعرێک دەنوسێت «وەک عەشیقە سوریالییەکەی دایکی دەڵێت» لەگەڵ ئەم سەردەمەدا ناگونجێت، کە سەردەمی قارەمانانی جیدیی و ڕۆژگاری هونەری ستالینییە. یارومیل هەر لە سەرەتاوە ئەو گومانە ئۆرفیۆسییە دەژی کە ئەوانی تر تەنیا فێڵی لێبکەن، وەک منداڵێک وەریبگرن، هەتا لە دانیشتنێکدا کە دەیچوێنن بە رامبۆی شاعیر لە بری ئەوەی بە لێکچواندنەکە شاد بێت و دڵی خۆشبێت، لەوە دوودڵ دەبێت کە ڕامبۆ لە هەژدە ساڵیشدا هەر وەک سیازدە ساڵ نواندویێتی، هەر شێوەی مێردمنداڵی بووە نەوەک ڕوخساری گەنجێکی کامڵ... ئەو شوبهاندنە یارۆمیل دەخاتە خولیای ئەوەی بۆی گرنگ بێت وەک گەورە، وەک خودێکی کامڵ قەبووڵبکرێت. کە نیگارکێشە سوریالییەکە دەڵێت «یارومیل، نە منداڵە و نە پیاو»... ئەوە تووشی بارودۆخێکی دەروونی وەهای دەکات، ئامادەبێت دەستبەرداری هەموو شیعر و شاعیرییەتێک بێت، لە پێناوی گەورەبووندا.

بۆیە ئاماژەم بەم بەشە لە کتێبەکە کرد، چونکە تەواوی ڕۆمانەکە لەدەوری هەوڵی یارومیل بۆ گەورە بوون دەسوڕێتەوە، یاخود لە ڕاستیدا بۆ بەهێزبوون.

**بەڵام چۆن شاعیری لاواز، بەهێز دەبێت؟**

یارۆمیل، وەک ئۆرفیۆس، وەک پۆشکین، وەک کۆرنیامێنتال لەو باوەڕەدا نییە کە شیعر بەتەنیا هێزێکی بداتێ، بتوانێت بێدوودڵی و ترس بژی. شاعیرییەت بۆ ئەو دیارییەکی ئامادە نییە، بەڵکو بەهرەیەکە پێویستی بە سەلماندن هەیە، دەبێت دەزگا و ئۆرگانە ڕەسمییەکانی دەوڵەتی نوێی کۆمۆنیستی ڕازیبکات کە شاعیرە... شاعیران لە سەردەمی مۆدێرندا وەک ئۆرفیۆس لە خۆوە ناتوانن گۆرانی بڵێن و کەس ڕێگایان لێ نەگرێت... وەک پۆشکین ناتوانن بە شیعر، تاج و تەختی تزاران بهێننە لەرزە و سزاکەش قەبووڵبکەن. یارومیل لە سەردەمێکی سەختتردا دەژی، لە سەردەمێکدا گەر بە زاراوە فرۆیدییەکە «باوک»، یاخود دروستتر بە زاراوە لاکانییەکە «ئەویدی گەورە» دان بە شاعیرییەتیدا نەنێت، ناتوانێت هەستبکات کە بووە بە شاعیر. ئۆرفیۆس کە دادەبەزێت بۆ هادەس، بە هێزی گەورەی شاعیر و هونەرمەندانەوە تێکەڵی مەیدانی جەنگ دەبێت، بەڵام یارۆمیل کاری وای پێناکرێت، لەسەردەمی مۆدێرندا، لە ڕۆژگاری میدیا و چاپ و وەزارەتەکانی کولتوور و ئەکادیمیاکانی هونەر و بنکەکانی چاپ و پەخشدا، شاعیر ناتوانێت لە خۆیەوە شیعربێژی بکات و دەمدرێژیبکات و خۆی بە خۆی بڵێت هونەرمەند یان شاعیر. شوناسی هونەرمەندبوون شتێکە ئێستا شاعیر خۆی نایبەخشێتە خۆی، ئەو وەک کۆرنیامێنتال ناتوانێت خۆی وەک شاعیرێکی گەورە بناسێنێت... دەبێت ئەوانی دی نازناوی شاعیری بدەنێ، ئەوانی دیش تەنیا دایکی و عەشیقە سورپالییەکەی ئەو نین، بەڵکو حیزب و دەزگاکانی دەوڵەت و چەندەها هێز و ئۆرگانی ترن.

سەفەری یارۆمیل بۆ گەورەبوون، بۆ دۆزینەوەی خۆی، دەکرێت وەک سەفەرێکی ڕەمزی بۆ هەندێک لە هەوڵی شاعیران بۆ دەربازبوون لە لاوازیی تەماشابیکەین. یارومیل وەچەیەکی ئۆرفیۆسە، بەڵام ڕێگایەکی

پێچەوانـەی ئۆرفیـۆس دەگرێـت. ئۆرفیـۆس سـەرەتا هەسـتێکی گـەورەی بەهێـزی خـۆی هەیـە، دادەبەزێـت تـا ئۆردیـکا بهێنێتـەوە، دەتوانێـت خوداکان ڕازیبـکات ئۆردیـکای بدەنـەوە، لەسـەفەری گەڕانـەوەدا گومـان دایدەگرێـت، هەست نـاکات هونـەر لـەوە بەهێزتـر بێـت بتوانێـت مـردن ببەزێنێـت، ئـاوڕ دەداتـەوە و ئۆردیـکا دەدۆڕێنێـت. یارومیـل لەسـەرەتاوە بەجۆرێکـی دی دەجوڵێتـەوە، ئـەو لاوازە، لـە بندەسـتی دوو کاراکتـەری زۆر بەهێـزدا دەژی کـە دایکـی و نیگارکێشـە سـریالییەکەی دۆسـتێتی، هەردووکیـان بەجۆرێـک لـە جـۆرەکان کاراکتـەری داگیردەکـەن و دەیانەوێـت ئـەوەی لێدروسـتبکەن کـە دەیانەوێـت... ئـەو گەورەبـوون بـەوە دەزانێـت کـە لـە ژێـر ئـەو چەتـرە دایکانەیـە دەرچێـت، دەیەوێـت خـۆی بخاتـە ژێـر دەسـتی باوکێکـی گـەورەوە، ژێردەسـتی حیزبـەوە... بـەدوای دانپیانانـی ئـەو هێـزە گەورەیـەدا دەگەڕێـت کـە بەنـاوی شـۆڕش و جوانکردنـی دونیـاوە هـەم پەیامێکـی شـاعیریی و هـەم پەیامێکـی نێرانەشـی هەڵگرتـووە.

یارۆمیـل تەنیـا گومانـی لـە بێهێـزی خـۆی نییـە، بەڵکـو بـاوەڕی تـەواوی بـەو بێهێزییـە هەیـە و دەیەوێـت تێیپەڕێنێـت. بـۆ ئـەوەی هەسـتبکات کـە بەهێـزە، دەبێـت بەهەمـان ڕەوتـی ئۆرفیۆسـدا بـڕوات، دەبێـت ئۆردیکایـەک بدۆزێتـەوە و هەوڵبـدات بەدەسـتی بهێنێـت. بەڵام یارومیل گەنجێکی شـەرمنە، هەتـا خاڵیـش نییـە لـە ترسنۆکی، چـۆن دەتوانێـت ئۆردیکایـەک بدۆزێتەوە؟. یارومیـل لـە هەوڵەکانیـدا بـۆ گەورەبـوون و دەربازبـوون لـە دایکـی «ڕەمـزی لاوازیـی»، حـەز لـە کیژێـک دەکات، کێشمەکێشـێکی دەروونـی قـووڵ دەژی تـا بتوانێـت لێـی نزیکببێتـەوە و خۆشەویسـتی خـۆی بـۆ دەرببڕێـت، بـەڵام ڕۆژێـک لـە کردەیەکـی هەرزەکارانـە و بوێرانەشـدا گوڵێـک دەگرێـت بەدەسـتییەوە و دەچێتـە بـەر ماڵـی کچـە و چاوەڕوانیـدەکات بێتـەدەرێ... چاوەڕوانییەکـەی بێهۆدەیـە، لـە جیاتـی ئـەو کیـژەی ئـەم عاشـقی بـووە، کیژێکـی دی دەبینێـت کـە هاوڕێـی کیـژی پێشـووە و پێیدەڵێـت ئـەو خانمـەی

ئـەم بەدوایـدا دەگەڕێـت کۆچیکـردوە و چیتـر لـەم شـارە نـاژی. بـەڵام کیـژە نوێیەکـە سەرسـامی و شـەیداییەک نیشـانی یارۆمیـل دەدات و عاشـقی دەبێـت. یارۆمیـل هەوڵـدەدات ئـەم کچـە بـکات بـە کەرەسـتەیەکی گـەورەی دەربازبـوون لـە دایکـی، بـە ئامرازێـک بـۆ دۆزینـەوەی خـود و هەسـتکردن بـە گەورەبـوون و بەهێزبوونـی خـۆی. لێـرەدا یارومیـل لـە هـەر یـەک لـە پۆشـکین و کۆرنیامێنتـال جیادەبێتـەوە، ئـەوان سـەرەتا هەستدەکەن کـە زۆر بـە هێـزن و دواتـر ژن وادەکات هەسـت بەبێهێـزی بکـەن، ژن وادەکات پۆشـکین بـڕوات بـۆ «دووجەنگـی» و ژن وادەکات کۆرنیامێنتـال شـێتانە بگاتـە بەردەسـتی بکوژانـی. هەتـا بـۆ خـودی ئۆرفیۆسـیش تەفسـیرێک هەیـە کـە دەڵێـت ئـەوە خەتـای ئۆردیـکا بـووە کـە ئۆرفیۆسـی ناچارکـردوە ئاوڕبداتـەوە، ئەوەنـدە لـە ڕێـگا پێیگووتـووە «منـت خۆشـدەوێت؟ منـت خۆشـدەوێت؟ گـەر منـت خۆشـدەوێت ئاوڕبـدەرەوە؟ بـۆ ئاوڕنادەیتـەوە». ئـەوە ئۆرفیۆسـی ناچارکردوە ئاوڕبداتـەوە و بـەو جـۆرە بەدبەختیکـردوە.

پێدەچێـت یارۆمیـل لـە یارییەکـە تێگەیشـتبێت، لـەوە حاڵیبووبێـت کـە ژنـان مایـەی بەدبەختـی شـاعیرە ئۆرفیۆسـییەکانی پێـش ئـەون و بیەوێـت بـەوردی و بەوریایـی لـەو خاڵـەدا ژیاننامـەی ئۆرفیـۆس دووبارەنەکاتـەوە. یارومیـل بـۆ ئـەوەی هەست بەهێزبـکات، هـەر خـۆی لـە حیـزب و لـە ڕۆحـە دروشمسـاز و شۆڕشـگێڕانەکەی نزیـک ناکاتـەوە، بەڵکـو دەسـت لەگـەڵ دەزگا ئەمنییەکانیشـدا تێکەڵـدەکات. یارۆمیـل سـەرەتا دەیەوێـت هێـزی خـۆی لەگـەڵ ئـەو کیـژەی هاوڕێیـدا تاقیبکاتـەوە، دەخوازێـت تـەواو داگیرییبـکات، بیـکات بـە کۆیلـەی خـۆی، لـە بـەر چـاوان بیشـارێتەوە، هەتـا جارێـک لـە سـەر ئـەوە دەیکاتـە جەنـگ و جـەدەل لەگەڵیـدا، کـە چـۆن جەسـتەی خـۆی پیشـانی دکتۆرێکـی پیـاو داوە... سـەرەتا یارۆمیـل هێـزی خـۆی لـەوەدا تاقیدەکاتـەوە کـە ئۆردیکاکـەی خـۆی بەتـەواوی مۆنۆپۆلبـکات و نەهێڵێـت بەشـی کەسـی پێـوە بێـت. بـەڵام دواتـر تێـدەگات کـە هێـزی هـەرە گـەورە لـە

داگیرکردنی ئۆردیکادا نییە، بەڵکو لەدەستبەرداربووندایە لێی... یارومیل لە کردارێکی ناجومێرانەدا، هەر یەک لە کیژەکەی هاوڕێی و برای ئەو کیژە بە درۆ تاوانبارەکات کە دەیانەوێت لە سنوور بپەڕنەوە و لای پۆلیسی کۆمۆنیستی بەگرتیان دەدات.

ئەمجارە یارومیل بە دەستی خۆی ئۆردیکا فڕێدەداتە بنی دۆزەخەوە و ئاوڕیشی لێ ناداتەوە سەیربکات چۆن دەکەوێتە بنی هادەس.

یارومێل ئەو ئۆرفیۆسەیە کە لەسەرەتاوە دەزانێت لاوازە و بۆ ئەوە ناگەڕێت هێزی خۆی تاقیبکاتەوە، بەڵکو بۆ وەدەستهێنانی هێز دەگەڕێت، کە دەچێت بەدوای ئۆردیکادا بۆئەوە ناچێت ڕزگارییبکات، بەڵکو بۆ ئەوە دەچێت بەهێزی خۆی بسەلمێنێت و بڵێت هێزی من لە توانای دەستبەرداربووندایە لە ئۆردیکا نەوەک لە وەدەستهێنانەوەیدا. ئەگەر تا دەگەینە سەر یارۆمیل ژنان خیانەتیان لە شاعیران کردبێت، لەگەڵ یارۆمیلدا ئەو شێوە شاعیرە دێتە پێشێ کە هەوڵدەدات نێرایەتی و هێز و گەورەیی خۆی بەوە بسەلمێنێت کە دەتوانێت خیانەت لە ژنان بکات.

ئەم یارییە ئاسان بۆ یارومیل تەواو نابێت، ئەوەی ئۆرفیۆس دەستبخاتە دەستی جانەوەرەکانی هادەسەوە، هەموو شاعیرییەت و جوانییەکی تێدا دەکوژێت، لێرەوەیە ڕستە ترسناکەکەی کۆندێرا دێتە سەرێ، ئەو ڕستەیەی من لەوەوبەر چەندینجار بەکارمهێناوە و پێدەچێت زۆرجاری دیش بەکارییبهێنمەوە «لەو دەمەدا شاعیر لەگەڵ جەلاددا حوکمیاندەکرد». یارومیل نمونەی زۆر لە شاعیرانی سەدەی بیستە کە دەستیانخستە دەستی جەلاد و لەگەڵ ئەودا حوکمیانکرد.

یارۆمیل دەچێتە پاڵ جەلاد بۆ ئەوەی لاوازیی ئەبەدی شاعیران جێبهێڵێت، بەڵام ئەوە ئازار و تراژیدیاکەی سووک ناکات، یارۆمیل دەبێتە کەسێکی تەنهای قێزەون، ئەمجارە ڕقی خەڵک لە یارۆمیل هۆکەی ئەوە نییە کە شاعیرە، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە ئەو شاعیری بە ڕێگای خیانەتدا

لە شیعر بردوە، دۆستایەتی جەلادی هەڵبژاردوە و چۆتە ژێر سێبەری دەسەڵات... شاعیران بۆیان نییە لەسەر حیسابی جوانی، بەهێزبن. ئەوە وادەکات یارۆمیل هەوڵی خۆکوژی بدات، بەڵام بۆی ناچێتە سەر... یارۆمیل نابێت وەک شاعیران مەرگێکی ئازاد و مانادار بمرێت، لەبەرئەوە زیندوو دەمێنێتەوە و پاشماوەیەکی کەم لەوە بە هەوکردنی سی دەمرێت و جیهان بەجێدەهێڵێت.

یارۆمیل نمونەی تراژیدیی ئەو شاعیرە ئۆرفیۆسییەیە کە دەیەوێت لە لاوازی ئۆرفیۆسیانەی خۆی دەرچێت و ئەوەش بەرەو خیانەت لە شیعر و گەورەیی و داهێنانی دەبات.

## حەلاج

تراژیدیای ئۆرفیۆس لە سێ وێستگەی سەرەکیدا کۆدەبێتەوە ١. عەشقێکی بێسنوور و هەوڵ بۆ گەیشتنێکی ناکۆتا بە یار. ٢. هەوڵدانی بۆ هەڵگرتنی سنووری نێوان ژیان و مردن. ٣. بەکارهێنانی کەرەستەیەکی لاوازی ئینسانی بۆ ئەو دوو فەرمانە سەختە کە هونەرە. گەر لە ئەزموونی حەلاجیش بروانین هەمان ڕیز بەندی دەبینینەوە. ١. عەشقێکی بێسنوور بۆ خودا و هەوڵێکی گەورە بۆ یەکبوون لەگەڵ خالیقدا. ٢. هەڵگرتنی سنوور و بەربەستەکانی نێوان خالیق و مەخلوق. ٣. بەکارهێنانی کەرەستەیەکی لاوازی ئینسانی بۆ تەعبیر لەو خواستە کە شیعرە.

چیرۆکی مەنسوری حەلاج لەوە بەناوبانگترە پێویستی بە گێڕانەوەی من بێت، ئەو یەکێکە لە هەرە گەورەترین کاراکتەرەکانی مێژووی تەسەوف، زیادەرەویش نییە گەر بڵێین زیندووترین و بەکاریگەرترین کاراکتەری مێژووی ئیسلامە، تاکە کاراکتەری ئەو مێژووەشە کە ژیانی و مردنی چ لە خۆرهەڵات و چ لە خۆرئاوا، هەم لەسەردەمی خۆی و هەم

لە ئێستاشدا جێگای خوێندنەوە و تەفسیر و ڕامانە.

ئەزموونی حەلاج ئەزموونێکی ئۆرفیۆسییە، بەلأم بە دیوە هەرە سەختەکەیدا. ئەو ئەرکەکەی زۆر لە ئەرکی ئۆرفیۆس سەختترە. لەبەرئەوەی وەک مەحبوبە، کەسێکی ئەستەمی هەڵبژاردوە کە «زاتی ئیلاهییە»، وەک نیازیش ئامانجێکی ئەستەمتری خستۆتە پێشچاوی خۆی، کە هەڵگرتنی سنووری نێوان خۆی و ئەو زاتەیە، ئامانجی تێکەڵبوونێکی ڕەهایە، توانەوەیە لە نووری مەعشوقدا. جگە لەوە شێوەی کوشتنی حەلاج، کوشتنێکی تەواو ئۆرفیۆسییە، ڕاستە تا ئێستا شێوەی لە خاچدان و هەڵواسین و پارچەپارچەکردنی مەسیحمان بیر دەهێنێتەوە، بەس گەر وردتر بڕوانین بڕی لێکچوونەکانی نێوان حەلاج و ئۆرفیۆس دەیانجار لە لێکچوونەکانی نێوان حەلاج و مەسیح گەورەترە. حەلاج وەک ئۆرفیۆس هونەرمەندە، عاشقە، پڕ گومانە، واتە کۆی سیفەتە سەرەکییەکانی هێندەی دەچێتەوە سەر ئۆرفیۆس ناچێتەوە سەر مەسیح... هەتا مردنەکەشی وەک مردنەکەی ئۆرفیۆس و پۆشکین و کۆرنیامێنتال لە خودکوژی دەچێت پتر لەوەی لە کوشتنی ئاسایی بچێت. ئەو وەک مەسیح نییە لەسەر خاچ بڵێت «خودایە... خودایە... بۆ بەجێتهێشتم»، ئەو وەک ئۆرفیۆسە کە سەرەکەی بە کوژراویش هەر گۆرانی دەڵێت. لێرەدا مەبەستمە بڕێک زیاتر دژی ئەو تیورەیە بوەستمەوە کە هەندێک لە باسکارە خۆرئاواییەکان سەبارەت بە ڕیشە مەسیحییەکانی حەلاج دەیوروژێنن و پێیانوایە حەلاج لە ناخیدا مەسیحی بووە نەوەک موسڵمان، لەوانە تەفسیرە ناسراوەکانی «ئۆگست میوللەر» لەسەر جەوهەری نەسرانی ئەزموونی حەلاج. ئەوەی من تێیبگەم، تراژیدیای حەلاج هێندەی درێژکراوەی تراژیدیای شاعیرانە لەسەر زەوی، درێژکراوەی تراژیدیای پێغەمبەران نییە، هێندەی ئەزموونی هونەرمەندێکە کە بەدوای ئەستەم و نەکردەدا دەگەڕێت، ئەزموونی دیندارێک نییە کە تەنیا خودای

خۆشــدەوێت. هەڵبــەت بەرابــەر هەوڵەکانــی بــە نەســرانیکردنی حــەلاج، هەوڵــی بــە براهمانــی کردنیشــی دراوە، بــە چەشــنێک هەندێــک وادەبینــن لــە ئەزموونــی ڕۆحــی حەلاجــدا هەمــوو جەوهــەری ســوفییەتی ئاســیایی بەرجەســتەبووە... لێــرەدا ناچمــە نــاو کێشــەی جەوهەریــی تەســەوف لای حــەلاج، کــە کێشــەیەکی سـوفی و فیکـری زۆر ئاڵـۆزە، پابەنـدی تێگەیشـتنی مەزهــەب و دیانەتــە جیاوازەکانــە لــە مەســەلەی «یەکبــوون ـ توحیــد» و مەســەلەی «جەوهــەری خالیــس» لای ســۆفی و فەیلەســوفە دێرینــەکان، هێنــدەم دەوێــت ئــەوە ڕوونبکەمــەوە کــە حــەلاج قوربانــی وەزیفەیەکــی ئەســتەمە، وەک چــۆن ئۆرفیــۆس بــە گــژ نەکــردە و نەشــیاودا دەچێــت «مردوویــەک لــە مــردن بگێڕێتــەوە»، حەلاجیــش بــە گــژ کارێکــی لــەوی ئــەو ئەســتەمتردا دەچێتــەوە «جیــاوازی نێــوان خــۆی و خــودا هەڵبگرێــت»... کەرەســتەی هــەر دووکیشــیان بــۆ جێبەجێکردنــی ئــەم وەزیفــە نەکردەیــە یــەک شــتە، «هونــەر». یەکێــک لــە خاڵــە زۆر گرنــگ و هاوبەشــەکانی نێــوان ئۆرفیــۆس و حــەلاج دەگەڕێتــەوە بــۆ خواســتی هەردووکیــان بــۆ ئاشــکراکردن و دەرخســتنی تواناکانــی خۆیــان. ســەیر نییــە کــە یەکێــک لــە هــەرە ســۆفیە هاوچەرخەکانــی حــەلاج، ئەبوبەکــری شــبلی عەیبــی گــەورەی حــەلاج و کوشــتنەکەی دەگێڕێتــەوە بــۆ ئــەو خۆئاشــکراکردنە. دەڵێــت «کنــت انــا و الحسـین بـن منـ×ـور شـیئا واحـدا، الا انـه ا×هـر و کتمـت». حـەلاج وەک لـە چیرۆکــە جیاوازەکانیــدا دەردەکەوێــت کەســێکی زۆر بــە دەرەوە بــووە، وەک چــۆن ئۆرفیــۆس مۆســیقای خــۆی بــۆ هەمــوو دونیــا بــە ئاشــکرا لێــدەدات، حەلاجیش هەمانشـێوە نهێنییـە ڕۆحییەکانـی خـۆی بـە ئاشـکرا بەیاندەکرد، بــاوەڕی وابــوو کــە بــەو بەلاغەتــە گەورەیــەی خــۆی دەتوانێــت بگاتــە هەمــوو شــتێک، گەرچــی دڵنیابــوو تەنیایــە، گەرچــی دەیگــووت «الا×وفــي وحدانــي الــذات لایقبلــە احــد و لا یقبــل احــدا». لەگــەڵ ئەوەشــدا بێتــرس خــۆی ئاشــکرادەکات. پرســیارەکە ئەوەیــە حــەلاج بــۆ وەکو شــبلی نەکــردوە؟ ئەویش

سوفییەکی گەورە بوو وەک ئەو، لادانەکانیشی لە لادانی حەلاج کەمتر نەبوون، بەڵام حەلاج بۆ وایدەکرد، بۆ زۆر دەجوڵا، بۆ دونیا دەگەڕا، بۆ هەر جارەی بە بەرگێکەوە و بە ئایدیایەکەوە دەردەکەوت؟ ئاخۆ ئەمجۆرە وروژاندن و ناحەزژەنییەی بۆ دەکرد؟. وەڵامەکە هەمان ئەو وەڵامەیە کە لای ئەپۆلۆنێر بینیمان. حەلاج بۆ مردن دەگەڕا، مردنێکی شاعیرانەی گەورە.

لێرەدا ڕستەیەکی تری شبلی دەربارەی حەلاج بە بەڵگە وەردەگرم، کە دەڵێت «من و مەنسور یەک شت بووین، من شێتێتییەکەم ڕزگاریکردم و ئەو عەقڵی لە ناوی برد». گەر بەپێی ئەو قسەیە بێت، خۆئاشکراکردنی حەلاج، گوێنەدانی، کارێکی عاقڵانە بووە، بێدەنگی شبلیش کارێکی شێتانە... حەلاج خۆی ویستویێتی بکوژرێت، بەپێی خۆی بەرەو مردن ڕۆیشتووە، یاخود دروستتر بڵێین، بەجۆرێک لە جۆرەکان خۆی نەخشەی بۆ کێشاوە.

لە شانۆگەرییەکەی سەلاح عەبدولسەبوردا «مەرگەساتی حەلاج» دیمەنێکی سەرنجڕاکێش هەیە، کە ئاشکرا ئەوە دەردەخات کە حەلاج خۆی مەرگی هەڵبژاردوە. لە شانۆگەرییەکەدا، واعیز و هاوڕێکانی لە بەردەم حەلاجی لە خاچدراودا لە گروهێک خەڵکانی سۆفی دەپرسن: «ئێوە کێن؟». لەوەڵامدا دەڵێن «ئێمە بکوژانین، ئەوانەین حەزمان لە وشەکانی کرد، لێیگەڕاین بمرێت تا وشەکانی بمێنێتەوە». دواتر بە ڕوونی دەڵێن حەلاج پێیگووتووین «ئەوەی بمکوژێت، خواستی من جێبەجێدەکات» یان دەڵێت «ئەوەی بمکوژێت دەچێتە بەهەشت، چونکە بە شمشێری خۆی بازنەکە دادەخات». هەڵبەت تەفسیری سەلاح عەبدولسەبور تا ئەندازەیەک ڕۆحییەتی گۆڕینی حەلاجی تێدایە بۆ سەمبولێکی هاوچەرخ، بۆ هێمایەک لە هێماکانی یاخیبوون، بەڵام ئەم خواستی مردنەی کە ئەو ئاماژەی پێدەکات، بەشێکە لە ئەزموونی بنەڕەتی حەلاج خۆشی،

واتە بەدەر لە هەرجۆرە ڕەمزاندنێکی هاوچەرخانەش بۆی، ئەم ڕەگەزە پێکهاتێکی بنەڕەتی ژیان و مردنی حەلاجە، وەک خۆی دەڵێت «اقتلوني يا ثقاتي — ان في قتلي حياتي».

گەر تەماشابکەین حەلاج بە شێوەیەکی کورتتر بەڵام سەختتر بە ئەزموونی ئۆرفیۆسدا دەڕوات، ئۆرفیۆس دەچێت بۆ هادەس، دەگەڕێتەوە و دەکوژرێت، تا دووبارە بکەوێتەوە بنی هادەس و بەو جۆرە لەگەڵ ئۆردیکادا یەکبگرێتەوە. بەڵام حەلاج دەیەوێت بگات بە مەعشوقە، بەڵام ناتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان خۆی و مەعشوقەدا، ناتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان خودی خۆی و زاتی ئیلاهیدا. ئەو نایەوێت ئۆردیکا بهێنێتەوە، بەڵکو ئەرکێکی ئەستەمتری داناوە، ئەرکێک کە لە ڕۆحی هەموو عاشقێکی ڕاستەقینەدایە، توانەوەی تەواو لە مەحبوبەدا، دەستهەڵگرتنی ناکۆتا لە خود، جیانەکردنەوەی خۆی لە مەعشوق، پێداگرتن لەسەر یەکبوون و یەک جەوهەریی عاشق و مەعشوق. ئۆرفیۆس سۆفی نییە، نیازێکی بەوە نییە ئەو مەودا جەستەییەی دەکەوێتە نێوان خۆی و مەعشوقەوە بیسڕێتەوە، ئەو ئۆردیکا وەک جەستەیەک بەرابەر جەستەی خۆی دەبینێت، خواستی بۆ ئۆردیکا، خواستە بۆ بوونە مادییەکەی، بەڵام حەلاج لەسەفەری خۆیدا، لە دابەزینی خۆیدا بۆ هادەس، نیازێکی نەکردەی هەیە، دەیەوێت دەستبەرداری جەستەی خۆی بێت، دەستبەرداری منی خۆی بێت و لە زاتی مەعشوقەدا کە لێرەدا «زاتی ئیلاهییە» بتوێتەوە. خۆی دەڵێت « بيني و بينك اني ينازعني — فارفع بلا×فك انيي من البين». دەبێت «من - انا» ی حەلاج لە بەیندا هەڵگیرێت، چونکە ئەو منە بووە بە ڕێگر لە ڕێگای گەیشتنی تەواوەتی حەلاجی عاشق بە مەعشوقی خۆی. ئەو هەر لە بنەڕەتدا ناتوانێت لە نێوان خۆی و خودا دا جیاکاری بکات. هەتا دەڵێن حەلاج لەسەر ئەوە کوژراوە، کە کەسێک لێیدەپرسێت جوبەکەت

چی لە ژێردایە، ئەویش دەڵێت «مافي جبتي الا اللە». حەلاج خۆی و خودای بۆ جیانەکراوەتەوە، تاکە ڕێگریش کە لە نێوان خۆی و خودادا بینیوێتی ژیانی خۆی بووە. ئەوە کێشەی حەلاجە، ئەو ئۆرفیۆسێکە کە دەچێت بۆ لای مەحبوبە نایەوێت لەگەڵ خۆی بیهێنێتەوە بۆ دونیا، بەڵکو دەیەوێت لەگەڵیدا بمرێت و لە جاویدان و ناکۆتادا بتوێنەوە و یەکبگرن. سەفەرەکەی حەلاج تەواو وەک ئەوە وایە ئۆرفیۆس داوا لە ئۆردیکا یان لە خودایانی هادەس بکات بیکوژن، تا ڕۆحی بە جۆرێکی ئەبەدی بە ڕۆحی مەعشوقە بگات. واتە حەلاج دەزانێت کە هێنانەوەی ئۆردیکا بۆ دونیا هیچ مانایەکی نییە، سوودی چییە کە جارێک دولبەر لە مەرگ ڕزگاربکەیت، بۆئەوەی دووبارە بێتەوە سەر هەمان زەوی و ناو هەمان دونیا و ناو هەمان قەفەز. سوودی چییە کە یەککگرتن لەگەڵ مەحبوبەدا یەککگرتنێکی موتڵەق نەبێت. لێرەوە حەلاج دەزانێت تا ئەو لە ژیاندا بێت، تا ئەو لە پێستی خۆیدا بێت، تا ئەو نیشتەجێی قەفەزی جەستەی خۆی بێت، گەیشتن بە یار ئەستەمە. ئیدی گەڕان بۆ مەرگ دەبێت بە جەوهەری سەفەرە ئۆرفیۆسییەکە. لێرەدا ئیشی شیعریش هەمان ئیشە کە لای ئۆرفیۆس دەیبینین، مەستکردنی ئەوانی دی و تورەکردنیان... شیعر لە ئەزموونی حەلاجدا هەم کەرەستەی گەیشتنە بە خواست و هەم کەرەستەی گەیشتنە بە مردن. لێرەدا جەوهەری گومانە ئۆرفێۆسییەکەش زیندوە، شیعر بەتەنیا حەلاج ناگەێنێتەوە بە خودا، بەڵکو شیعر تەنیا لە پاڵ مردندا دەتوانێت ئەو کارە بکات، شیعر بەبێ مردن، ناتوانێت عاشق بگەێنێتە خۆشەویستی خۆی. هەڵەی گەورەی ئۆرفیۆس ئەوەیە کە نەدەبوو لە دونیای مەرگ بگەڕێتەوە، چونکە تەنیا لە ساتی مردندا ڕۆحی عاشق و مەعشوق بە یەک دەگەن. لە ئەزموونی حەلاجیشەوە جارێکی تر تێدەگەین گومان لە هێزی هونەر ئامادەیە... خودا تەنیا بە شیعر، بە هەڵچوونە دەرونییەکان، بە لادانە

سۆفیستییەکان، بە مەستکردنی ئەوانی تر، بە وشە و موعجیزە دەرگای خۆی ناکاتەوە... شیعر تەنیا دوژمنان دروستدەکات، دوژمنانێک کە دەبێت هەبن تا شاعیر بگاتە بڵندیی تەواوی خۆی، دوژمنانێک پێویستن تا ئۆرفیۆس و پۆشکین و حەلاج و کۆرنیامێنتال بکوژرێن. حەلاجیش وەک ئۆرفیۆس پێماندەڵێت، بەڵێ هونەر بە ئەندازە عەشق کوشندەیە. هونەر هیچ کات بەشی ئەوە بەهێز نییە موعجیزەی وەها دروستبکات، سنووری نێوان ژیان و مردن، سنووری نێوان خالیق و مەخلوق، سنووری نێوان حەقیقەت و خەیاڵ، سنووری نێوان خۆشەویستی و کینە هەڵبگرێت. هونەر لای هەموو وەچەکانی ئۆرفیۆس، هێندەی کەرەستەیەکی گرنگی گەیشتنە بە مردن، ئەوەندە کەرەستەی گەیشتن نییە بە مەحاڵ... ئەوەش تراژیدیای گەورەی هەموو ڕۆحێکی ئۆرفیۆسییە... کە بۆ مەحاڵ دەگەڕێت و مردن دەچنێتەوە.

# کێشەی مۆدێرنە وترادسیۆن
# لەلای ئۆرهان پامۆك

لێرەدا لاڵەکان قسەدەکەن و مردووەکان دەژین
نوسراوی سەر کتێبخانەیەک لە بۆدابست

شاعیر تەنیا مەخلوقی ڕاستەقینەی دونیایە،
هەتا باشترین فەیلەسوف لە بەردەمیدا لە کاریکاتێر دەچێت
فردریش ڤۆن شیللەر

گەر سەرنجێکی مێژووی ئەدەبیاتی خۆرهەڵات بدەین، بەرچاوترین شتێک لە سەرەتاوە سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت، ئەو ڕاستییەیە کە لە هەرێمی ئێمەدا، ئەدەبیاتی تورکی بەراورد بە ئەدەبیاتی دیکەی ناوچەکە هەر دەم شانسێکی گەورەتری بۆ بەجیهانیبوون لە پێشدەمدابووە. بە درێژایی سەدەی بیست نوسەرە تورکەکان ئاسانتر بوونەتە ڕوخساری گەورە و ناسراو لە خۆرئاوادا. بۆ ئێمە کە کەم تا زۆر لە ئەدەبیاتی ئێرانی و عەرەبییەوە نزیکین، ئەو حاڵەتە هەردەم جێگای کەمێک سەرسامی و هەستکردن بە ناهەقی بووە. زۆر ناوی گەورە و گرنگ لە ئەدەبیاتی خۆرهەڵاتدا تا ئێستا لە دەرەوەی وڵاتانی خۆیان بە دەگمەن دەناسرێن. ناوی زۆر گەورەی وەک سوهراب و شاملۆ و گولشیری، وەک

سەلیم بەرەکات و مونیف لەگەڵ وەرگێڕانی هەندێک لە کارەکانیشیاندا هێشتا لە خۆرئاوا یان هەر نەبیستراون یاخود لە سنووری بازنەیەکی زۆر تەسکی ئەکادیمیدا دەناسرێن. بەڵام نوسەرانی تورکی وەک نازم حیکمەت، عەزیز نەسین، یەشار کەمال، محەمەد عارف، ئۆرهان پاموک زۆر خێراتر و ئاسانتر لە نوسەرانی دیکەی خۆرهەڵاتی ڕێگا دەبڕن و تێکەڵاوی خۆرئاوا دەبن و دەچنە ڕیزی ئەو نوسەرانەی کە کتێبەکانیان لەو بنکانەدا چاپدەبن کە کتێبی فرەخوێنەر چاپدەکەن. نهێنی ئەمە ڕەنگە بەشێکی لەو نزیکییەدا بێت کە گەلێک ساڵە تورکیای بە خۆرئاواوە گرێداوە. بوونی وەرگێڕی باش و ئەنستیوتی کاریگەریش هۆکارێکی گەورەن کە ئەدەبیاتی تورکی شانسی بەربڵاوی بەخۆیەوە بینیوە، جگە لەوەش تورکیا وەک وڵاتێک کە نە خۆرئاوایە و نەخۆرهەڵات، جێگایەکی سەرنجڕاکێشە کە ئاسان دەتوانێت هوش و خەیاڵی هەموو ئەو کەسانە ڕاکێشێت کە بایەخ بە پەیوەندی نێوان ئەم دوو دونیا جیاوازە دەدەن. بەڵام لەم هۆیانە گەورەتر و گرنگتر ئەوەیە کە ڕووبەرێکی بچوکی لە دیموکراسییەت لە تورکیا دەرگای بۆ جۆرێک لە ئەدەبیات کردۆتەوە کە ئەدیبانی تورک لە ڕێگایەوە ڕەخنەگرتر و ئیرۆنیتر لە بارودۆخی ناوەوەی تورکیا بڕوانن. بەشێکی گرنگی ناوبانگی نوسەرانی تورکیا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نیگا ڕەخنەییە کە لە نازم حیکمەتەوە دەست پێدەکات و لای عەزیز نەسین فۆرمێکی گاڵتەئامێزی زۆر تراژیدی وەردەگرێت و لای یەشار دەبێتە هونەری خوێندەوە و بە قارەمانکردنی پیاوە سادە و ساکار و پەراوێزییەکان و پلەیەکی باڵا لە واقعییەت بەدەستدەهێنێت. لای پامۆکیش دەبێتە جۆرێک لە خوێندنەوەی ئەرکیۆلۆژی بۆ ئەوقەیرانانەی تورکیای ئەمڕۆیان دروستکردوە. دیارە ئەم دەستنیشانکردنە بە مەبەستی کەمکردنەوە نییە لە قەدری ئەو نوسەرانە، کە بەش بەحاڵی خۆم پێکڕا بە نوسەری ئێجگار گەورەیان دەزانم، بەڵکو تێبینییەکە

دەربارەی ئەو هۆکارانەی کە وادەکەن ئەدەبی تورکی بۆ خوێنەرانی خۆرئاوایی سەرنجڕاکێشتر و شایستەتر بنوێنێت، لە کاتێکدا ڕەنگە بۆ منێکی خۆرهەڵاتی، سوهراب و فەروغ و ماغوتیش لە هەمان ئاست و بالاییدا بن. بەگشتی هەر کاتێک من کتێبێکی نوسەرانی تورکی ناودار دەخوێنمەوە، دەمەوێت دوای ئەو هۆیانە نەکەوم کە وادەکات نوسەرێکی تورک لە خۆرئاوا خوێنراوەبێت و ببێتە جێگای سەرنج، بەڵکو بۆ ئەو نوسەرە ڕاستەقینەیە دەگەڕێم کە گەر لە نێوکۆیی «سیاق» ئەو کولتووری بەراوردەش «کە ئەمڕۆ لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بەرقەرارە» دەریبهێنین، هەر گەورە بمێنێتەوە. ئێمەی خوێنەرانی خۆرهەڵاتی کە ئەدەبیاتی تورکی دەخوێنینەوە، دەبێت ئەو سەرسامییە بدۆزینەوە، کە سەرسامی خۆمانە. هەموو ئەدەبێکی گەورە بە شێوەی جۆراوجۆر خەڵک سەرسامدەکات. ئاسایییە کە دەبینین بینەرێک لە خۆرهەڵات بە تابلۆیەکی بیکاسۆ یان ماتیس سەرسام نابێت، چونکە سەر بەسەر زەمینێک و پاشخانێکی کولتورییە، بواری پێنادات لە نهێنی سەرسامبوونی خۆرئاوا بە بیکاسۆ تێبگات. کولتوورە جیاوازەکان، شێوازی جیاوازی سەرسامبوون دروستدەکەن، چونکە هەر کولتوورە و بەجیا جۆرە چاوێک بۆ خۆی دروستدەکات، فەرهەنگێک و کولتوورێکیش ئەوکات دەمرێت کە دەستبەرداری چاوی خۆی بێت و بە چاوی ئەوانی دی دونیاببینێت. هەڵبەت ئەمە بە مانای ئەوە نییە کە لە نهێنی زەوقی ئەدەبی بەگشتی تێنەگەین، یاخود وابڕوانین کە زەوق و چێژی ئەوانی دی ناتوانن زەوق و چێژی ئێمە دەوڵەمەندبکەن، یان نیگای خۆمان هەرچۆنێک بوو بە ئەلتەرناتیفێکی ڕەهاو پیرۆزی نیگای ئەوانی دی بزانین، بەڵکو بەو مانایەیە کە مرۆڤ مانای ئەو ڕوانگە و گۆشەنیگایە نەدۆڕێنێت کە خۆی لێوەی تەماشادەکات. لە ڕۆشنبیری کوردیدا «کولتووری بینین» بە مانا ئەدەبییەکەی، واتە دروستکردنی

نیگای خۆت بۆ تێكستەكان و شێوەی خۆت لە دەرەنجامگیریدا هێشتا هونەرێكی سەرەتایی و لاوازە. لەم نوسینە كورتەدا هەوڵدەدەم شتێكی زۆر بچوك لەسەر سەرسامی خۆم بە پامۆك باسبكەم، پامۆك وەك ئاركیۆلۆژیستێك كە بنكۆڵی گرفتگەلێك دەكات دونیای ئێمە لە ژێرەوە بنكۆڵكردوە... ڕاستە بڕێك لەسەرسامی ئێمە بە پامۆك دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستە سیاسییە هیومانیستییەكانی، بۆ ئازایەتی لە بەرگریكردن لە ڕاستیدا، بەڵام لەمانە بترازێت دەبێت پامۆكی نوسەر خۆی بخوێنینەوە و وەك نوسەر لە گرنگی تێبگەین. پامۆك وەك خۆرهەڵاتییەك توند ریشەكانی لە ناو ئەو ململانێ كولتوورییە قووڵەوە هاتووە كە ئەمڕۆ پێكرای كۆمەڵگاكانی ئێمە پارچەپارچەدەكات، ململانێی سەختی نێوان مۆدێرنە و ترادسیۆن، ململانێی نێوان وێنەی ئێمە و نیگای ئەو، شەڕی نێوان دوێنێ و ئێستا. پامۆك كوڕی وڵاتێك و سەرزەمینێكە كە تەواوی ئەو ململانێیانە بە شێوەیەكی توند و خوێناوی دەژی. لەم كورتە باسەدا تەنیا دەتوانم لەسەر یەك كێشەی سەرەكی لای پامۆك بوەستم، قسەكانم لە ئاست چوار ڕۆمانی سەرەكیدا ڕادەگرم، هەڵبەت دەمویست قسەگەلێكی زۆر لەسەر «كتێبی ڕەش»یش بكەم، كە لە كارە زۆر گرنگەكانی پامۆكە، بەڵام پێمباشبوو قسەكردن لەسەر ئەو ڕۆمانە هەڵگرم بۆ وتارێكی تایبەتی و لە ئێستادا خۆم لە زۆر وردەكاری گرنگی ناو ڕۆمانەكانی پامۆك بپارێزێم، تا بتوانم لە ڕۆمانەكان و تەنیا لە كێشەی ترادسیۆن و مۆدێرنە لای ئەم نوسەرە بدوێم.

«قەڵای سپی» یەكەمین ڕۆمانی پامۆك بوو من خوێندبێتمەوە، لەگەڵ تەواوكردنی كتێبەكەدا ڕستەیەكی «گێلبەرت، ك، چێستەرسن»ی ڕۆماننوس و وتارنوسی ئینگلیزیم هاتەوە یاد دەربارەی نوسەری بە ناوبانگ تشارلز دیكنز، چێستەرسن دەڵێت : «خوێنەری ئاسایی حەزدەكات بزانێت چۆن كتێبێك تەواو دەبێت، بەڵام خوێنەرانی دیكنز

حەزدەکەن کتێبەکەیان هەرگیز تەواو نەبێت». ڕۆمانەکانی پامۆک لە ڕووی هونەرییەوە هەمان وەسف هەڵدەگرن و پێکڕا هەمان سیحر و هێزی ڕاکێشانیان تێدایە. بەڵام پامۆک تەنیا تەکنیکارێکی گرنگ نییە کە مرۆڤ ئاسان جێپەنجەی نوسەرانی وەک ئەمبرتو ئیکۆ و کالفینۆ و کافکا لە ئیشەکانیدا دەدۆزێتەوە. بەڵکو بۆ ئێمە نوسەرێکە کە لەسەر تەوەرگەلێک دەنوسێت کە گرنگییەکی بێوێنەیان بۆ تێگەیشتن لە تورکیا هەیە. گرنگی پامۆک تەنیا لەو ستایل و شێوازە هونەرییە بەرزەدا نییە کە کاری شاکارنوسەکانی ئەدەبیاتی نوێمان بیردەخاتەوە، بەڵکو لەوەدایە کە پامۆک کێشەگەلێکی شارستانی و سیاسی زۆر گرنگ لەڕێگای ئەو شێوازەوە نیشاندەدات. لەو وتەیەدا کە ئۆرهان پامۆک بەبۆنەی وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵەوە خوێندییەوە، ئامارەی بە خاڵێک دا کە بۆ تێگەیشتنی کارەکانی گرنگییەکی زۆری هەیە. ئەو ڕای وایە هەر کات وشەی «نوسین» دەبیستێت، مرۆڤێکی دێتە پێشچاو کە لەسەر مێزێک دانیشتووە و بەرەو ناوەوەی خۆی دەگەڕێتەوە، نوسین دۆزینەوەی کاراکتەرێکی شاردراوەیە لە ناوماندا، وەک پامۆک دەڵێت، کاراکتەرێکی حەشاردراو کە لەڕێگای نوسینەوە دووبارە دەیهێنینەدەرێ، نوسین گەڕانەوە یان دووبارە سەرکەوتن و دەرکەوتنەوەی ناوەوەیە لە قاڵبی وشەدا. ئیشێکە بەرهەمی ئیلهام نییە، بەڵکو بەرهەمی سەبر و سەرسەختییە. بەڵام ئێستا کە ئێمە کارەکانی پامۆک دەخوێنینەوە، هەمان ئەوجۆرە گەڕانەوەیە دەبینین، هەمان ئەو پشکنینە قووڵە دەبینین، بەڵام وشەی ناوەوە لێرەدا مانایەکی قووڵتری لەو مانا خودگەرایە هەیە، کە تەنیا دەلالەت بێت بۆ گەڕانەوە بەرەو خود، تەنیا مانای ئەوەبێت مرۆڤێک هەیە و بەرەو ناوەوەی خۆی وەک تاک دەگەڕێتەوە و ئەو تاقانەیی و تاکگەرابوونەی خۆی دەپشکنێت. کارەکانی پامۆک کاری خودگەرا نین، ڕۆمانگەلێک نین کە لە نێو

نەست یان هوشیاری فەردەکاندا نوقمبن. ڕۆحی تێکستەکانی پامۆک لە تێکستی نوسەرە مێژووییەکانەوە نزیکترە وەک لە تێکستی ڕۆماننوسە ئاساییەکان. گەڕانەوەی نوسەر بۆ ناوەوەی خۆی، جیاوازییەکی نییە لە گەڕانەوەی مێژووی هەنووکەیی ئێمە بۆ ڕابوردووی خۆی. پامۆک نوسەری ئەو سەفەرەیە، سەفەرێک بەرەو نادیار، کە هاوواتای نیشتەجێبوونێکی هەمیشەییە لە تەلیسمێکدا. گومان لەوەدا نییە کە شتێکی لە ڕۆحی ڕۆمانی پۆلیسی لە زۆربەی بەرهەمەکانی پامۆکدا هەیە، لە زۆر ڕانانەکاندا، هەندێک کتێبی پامۆک وەک ڕۆمانی پشکنینی پۆلیسی پۆلێندەکرێن. بەڵام لەگەڵ ئەم ڕەهەندەشدا کە تەشویق و «کێشـێز ـ جازبییەتێک»ی گەورەی بە کارەکانی پامۆک بەخشیوە، دەبێت بڵێین کە پێکهاتی «تەلیسم و نەدۆزراوە» لای پامۆک لە مانا قووڵەکەیدا، وەک لای ئەمبرتۆ ئیکۆش دەبینین لە سنووری مانا پۆلیسییە ئاساییەکەی تێدەپەڕێت و سروشتی پەیوەندییەکی تەماوی و ئاڵۆز بە کۆی ڕابوردووەوە وەردەگرێت. تەلیسمی گەورە لای پامۆک پەیوەندی ئێستایە بە ڕابوردووەوە، ئیدی کۆی تەلیسمە بچوکەکان لای ئەو لە ژێر ئەم تەلیسمەدا کۆدەبنەوە. لە وتە تایبەتییەکەی پامۆکدا کاتی وەرگرتنی نۆبل، ئاماژەکردنی بەردەوامی پامۆک بە جانتا ڕەشەکەی باوکی، کە باوکی دەستنوسە کۆنەکانی خۆی تیا داناوەو و بۆ کوڕەکەی جێهێشتووە. ئاماژەکردنێکی مەجازییە بەو تەلیسم و مانا و وێنە سەیر و چاوەڕواننەکراوانەی هەردەم لە ڕابوردووەوە بۆمان دەمێنێتەوە.

لە ڕۆمانی «ژیانی نوێ»دا، پامۆک بەدوای ئەو تەلیسمە دەکەوێت، تەلیسمی پێکدادانی ئێستا بە ڕابوردوو. ژیانی نوێ یەکێکە لە ئیشەکانی پامۆک کە لەوانەیە بەرتەقای «بەفر» یان «ناوم سوورە» یاخود «قەڵای سپی» بەناوبانگ نەبێت، بەڵام بەبڕوای من یەکێکە لەو کارە

سـەرەکیانەی پامـۆک کـە دەروازەیەکـی گەورەمـان بـۆ تـەواوی کارەکانـی دیکـەی پێشکەشـدەکات. کتێبەکـە لـە ڕووی ڕەمزییـەوە یەکێکـە لـە دەوڵەمەنترین کتێبەکانـی ئـەم نوسـەرە . ڕۆمانەکـە حیکایەتـی سـەفەرێک و چیرۆکـی تەلیسمێکیشـە، « سـەفەر و تەلیسـم» دوو بابەتـن لـە کارەکانـی پامـۆک جیانابنـەوە، کتێبەکانـی پامـۆک وەک زۆربـەی ڕۆمانـە گرنگەکانـی دونیـا سـەفەرن بـە نـاو نهێنییەکدا. هـەر دوو ئـەم بابەتـەش لـە کتێبەکانـی پامۆکـدا تـا ڕادەیەکـی زۆر سـەمبولی سـەفەری تورکیـای نوێـن بـە دوای کاراکتـەر و مانـادا. ڕۆمانەکانـی پامـۆک بـێ هیـچ چەندوچونێـک داسـتانی سـەفەری ئـەم وڵاتـەن بـە دوای شـوناس و ڕوخسـاری ڕاستەقینەی خۆیـدا لەسـەردەمێکدا تورکیـا لـە هـەر وڵاتێکـی دیکـەی خۆرهـەڵات پتـر تووشـی قەیرانـی شـوناس و گرفتـی تێگەیشـتن لـە خـود بـووە، بەبـێ ئـەم خاڵـە ناوەنـدی و سـەنتراڵە ئەسـتەمە بزانیـن پامـۆک لـەو ساتەدا کـە حیکایـەت دەگێڕێتـەوە، باسـی چـی دەکات. ڕۆمانـی ژیانـی نـوێ بـەراورد بـە ڕۆمانەکانـی تـری پامـۆک ئاڵۆزتـر و دەسـتکردتر دەنوێنێـت، پتـر لـە کارەکانـی تـری ئـەم نوسـەرە مـرۆڤ هەسـت بـە سـوریالییەت و ناواقعییـەت دەکات، ڕۆمانەکـە خاڵـی نییـە لـەو فەنتازیـا سـادەیەی کـە لـە گۆڤـاری ڕەنـگا و ڕەنگـی منـداڵان یـان لـە هەندێـک فیلمـی هۆلیـۆوددا بەکاردێـت. خوێندنـەوەی هەندێـک بەشـی کتێبەکـە بـۆ کەسـانێک کـە ناتوانـن بزانـن پامـۆک دەیەوێت بڵێـت چی، ئاسـان نییـە. ڕۆمانەکـە حیکایەتـی قوتابییەکی کۆلیـژی ئەندازەیـە بـە نـاوی عوسـمانەوە کـە ڕۆژێـک لـە ڕۆژان کتێبێـک دەخوێنێتـەوەو سـەر لەبـەر ژیانـی دەگۆڕێـت. کتێبێکـە کتێبێکـی ئاسـایی نییـە، بەڵکو ڕوناکییەکـی بەهێـزی لێوەدەردەکەوێت کـە سـەرتاپای ژیـان و هـۆش و بیـری ئـەو کەسـانە داگیـردەکات کـە دەیخوێننـەوە. هـەر کەسـێک ئـەو کتێبـە بخوێنێتـەوە، تیشـکی هەڵقـوڵاوی نێـو لاپـەڕەکان تووشـی خولیایەکـی بەهێـز و کۆنتـرۆڵ نەکـراوی دەکات و هێزێکـی نهێنـی پاڵـی

پێوەدەنێت بۆ دونیایەکی نوێ بگەڕێت، ناونیشانی کتێبە سیحراوییەکەش هەر «ژیانی نوێ»یە. ژیانی نوێ لێرەدا مەجازێکە بۆ ئەو خولیایەی کە تورکیای نوێ لە ناوەوە داگیردەکات، سەمبولی ئەو هەستە توند و خواستە بەهێزەیە کە تورکیا بۆ مۆدێرنەکردنی خۆی هەیەتی. بەڵام مرۆڤ دەبێت بە ناو حیکایەتێکی ئاڵۆزدا بڕوات تا لە مانای ئەو کتێبی پڕ ڕۆشنابیە تێبگات، کە کاریگەرییەکی گێژکەر و هێزێکی ئەفسوناوی هەیە. بەدرێژایی ڕۆمانەکەی پامۆک ئێمە شتێک دەربارەی ناوەڕۆک و جەوهەری کتێبەکە نازانین، بەڵام تێدەگەین ئەوانەی کتێبەکە دەخوێننەوە، فریشتەیەکی ڕزگارکەر دەبینن، یاخود لە ڕاستیدا خولیای بینینی فریشتەیەکی فریادڕەس دەکەوێتە سەریان. عوسمان یەکەمین جار ئەو کتێبە بەدەست جانانەوە دەبینێت، کە کیژە قوتابییەکی کۆلیژی میعمارییە. خولیای ئەوەی بزانێت ئاخۆ کتێبەکە بە هەمانشێوە کاریگەرییەکی وەها ئەفسوناوی لەسەر ئەو هەبووە، لە جانانی نزیکدەکاتەوە کە لە پەیوەندییەکی خۆشەویستیدایە لەگەڵ «محەمەد»دا کە ئەویش یەکێکە لە خوێنەرانی ئەو کتێبە ئەفسوناوییە. جانان، عوسمان و محەمەد بە یەکدی دەناسێنێت و لەڕێگای محەمەدەوە تێدەگات کە ژیانی ئەو کەسانەی کتێبەکە دەخوێننەوە لە مەترسیدایە، بەڵام عوسمان وەها شەیدای دونیای کتێبەکە و وەها عاشقی جانانیش بووە گوێ بە هیچ نادات و لە هیچ مەترسییەک سڵناکاتەوە. هێند نابات عوسمان، بەچاوی خۆی دەبینێت کەسێکی نەناسراو لە نزیک تاشقشڵە تەقە لە محەمەد دەکات. لەدوای ئەو ڕووداوەوە هەر یەک لە موحەمەد و جانان بەشێوەیەکی نادیار و تەلیسماوی وندەبن و کەس جێگا و شوێنیان پێنازانێت، ئیدی هەتا ئاشکرا نییە محەمەد بە کاری گوللەکان کوژراوە یاخود نا. دوای ئەو ڕوداوە عوسمان بەدوای جانان و بەدوای ئەو جیهانەش کە لە کتێبەکەدا هەیە، گەشتێکی دوور و درێژ

دەستپێدەکات، گەشتێک پێدەچێت ئەوانەی کتێبەکە دەخوێننەوە و کاریان تێدەکات پێکرا مەحکومیبن. گەشتێک بە ئۆتۆبیسە نەفەر هەڵگرەکانی نێو تورکیا، گەشتێکی ناکۆتا و بێئاراستە و بێخواست، گەشتێک کە مانگ لە دوای مانگ درێژ دەبێتەوە، عوسمان تەنیا ئیشی ئەوەیە لەم پاس دابەزێت و سوار ئەوی دی بێت. وەک ئەوەی پامۆک بەم سەفەرە نارێک و خراپ و پڕ لە ڕووداوەی عوسمان وێنەیەکی مەجازی سەفەری تورکیامان لە ناو مۆدێرنەدا بۆ بکێشێت. دوای چەند ڕوداوێکی پاس کە هەردەم خەڵکانێک تیادەمرن، لە یەکێک لە ڕوداوەکاندا عوسمان، دووبارە جانان دەدۆزێتەوە کە ئەویش لە پاسێکی دیدا هەمانشێوە لەسەفەرێکی درێژ و بێهوّدا بە دوای محەمەد و دونیای ئەو کتێبەدا دەگەڕێت. وەک جانان دەیگێڕێتەوە دەبێت محەمەد لە ڕووداوێکی ئۆتۆبیسدا سووتابێت، بەڵام ئەو لەو باوەڕەدایە محەمەد شوناسی خۆی لەگەڵ ڕێبوارێکی گەنجی دیکەدا گۆڕیبێت و خۆی کردبێت بەو مردوە تا خۆی ونبکات. لەوێوە ئیدی عوسمان دەبێتە هاوڕێی جانان و پێکەوە درێژە بەو سەفەرە بێهودە و بێئاراستەیە دەدەن، ڕۆمانەکە هێند دیمەنی سەفەر و ڕێگاوبانی تێدایە، وەرگێڕی ئەڵمانی کتێبەکانی پامۆک «ئینگرید ئیرن» لە «فرانکفۆرتە ئەلگەماینە تزایتونگ»دا بە «ڕۆد نۆڤل» ناویدەنێت، واتە ئەو ڕۆمانانەی کە زۆربەی ڕوداوەکانی لە ڕێگاوباندا ڕوودەدەن. دوای سێ مانگ هاتوچۆ و مانەوەی بەردەوام لە ڕێگاوبانانددا، عوسمان و جانان، شەوێکی باران دووبارە لە ئۆتۆبیسێکدا ڕووبەڕووی ڕووداوێکی پێکدادان دەبنەوە و لەوێدا کچێک دەبینن لەگەڵ کوڕێکدا، کوڕەکە لە ڕوداوەکەدا دەمرێت و کچەکەش لە نێوان ژیان و مەرگدا دەستی جانان دەگرێت و دەکەوێتە قسەکردن دەربارەی ئەو فریشتە نادیارەی کە بینینی لای خوێنەرانی کتێبەکە خولیا و ئامانجێکی گەورەیە. کچەکە وا قسە لەگەڵ جانان

دەکات، وەک ئەوەی ئەو فریشتەکە بێت، فریشتەیەک مرۆڤ تەنیا لە ساتی مەرگدا و لەو دیو شوشەی ئۆتۆبیسێکەوە دەیبینێت. کیژەکە بەر لە مردنی ئەو ڕاستییە دەدرکێنێت کە خۆی و کوڕە دەستگیرانەکەی لەوانە بوون کە کتێبەکە شەیدایکردون و کەوتوونەتە گەڕان بەدوای دونیای ئەودا، بەڵام پاشماوەیەک دەستگیرانەکەی هەستدەکات کە کتێبەکە تەواوی ژیانی وێرانکردوە و بڕیاردەدات بکەوێتە جەنگەوە لەگەڵیدا و دەبێت بە یەکێک لەوانەی لەگەڵ دکتۆر نارینـدا دژی کتێبەکە شەڕدەکەن. کیژەکە پەشیمانە لەوەی خیانەتی لە کتێبەکە کردوە. بەر لە مردنی ئەوە ئاشکرادەکات، کە دوژمنانی کتێبەکە و پەیڕەوانی دکتۆر نارین لە شاری گودول کۆدەبنەوەو دەبێت ئەوان هەوڵبدەن پێش لە نەیارانی کتێبەکە بگرن و بە ناوی ئەوانەوە خۆیان بکەن بەو کۆبوونەوەیەدا. ئاوها جانان و عوسمان لە ژێر ناوی «عەلی قەرە» و «ئەفسون قەرە»دا بەرەو گودول دەڕۆن و لەوێ بڕێکی گەورەی نهێنییەکان ئاشکرادەبێت. «دکتۆر نارین» پیاوێکی پیرە، کە جانان و عوسمان دەگەنە ماڵی ئەوان تێدەگەن ئەم دکتۆرە باوکی «محمەدە». دکتۆر کە پیاوێکی نیمچە شێتە، یەکێکە لە فانەتیک و کۆنزەرڤاتیڤەکانی تورکیا، پامۆک لە ڕێگای کاراکتەری دکتۆر نارینەوە وێنەیەکی واقعی ئەو پیاوە پیر و توندڕەوانەی تورکیا دەکێشێت کە دژایەتی دونیای نوێ دەکەن. دکتۆر ڕایوایە شتەکان یادەوەرییان هەیە، ئەوانیش وەک مرۆڤ ڕووداو و یادگاری تۆماردەکەن... لەیەکدی دەپرسن و ڕێدەکەون و ڕازدەگۆڕنەوە، پێکەوە ئاهەنگێکی نهێنی سازدەکەن کە ئێمە بە مۆسیقای ئەو ئاهەنگە دەڵێین : دونیا. بەڕای دکتۆر نارین دوژمنان لە پیلانێکی گەورەدا بۆئەوەی لە خشتەمان بەرن سەرەتا لە شتەکانی خۆمان دوورماندەخەنەوە، تەکنۆلۆژیای نوێ کە تەباخی گاز و کۆکاکۆلا دەهێنێت، سەرەتای سڕینەوەی یادەوەری و داگیرکردنی ژیانمانە. دکتۆر

نارین بۆئەوەی بەرگری لە شتەکان و یادەوەرییەکانی ناویان بکات تۆڕێک لە بازرگان و خەڵکی فانەتیکی وەک خۆی کۆدەکاتەوە، کە ئیشیان پاراستنی شتی کەلەپووری و کەرەستەی کۆنە، ئیدی لە فانۆس و قەفەز و عەلادینەوە تادەگاتە چەقۆ و تەپڵەکی جگەرە و باوەشێن و قەفەزی کەناری کە لە هەموو لایەکەوە کۆیدەکاتەوە و لە دوکانەکەیدا کەڵەکەیاندەکات، بێئەوەی بوار بە هیچ شتێکی نوێ بدات، ڕووبکاتە فرۆشگاکەی. کاتێک کوڕە تاقانەکەی دکتۆر لە ئەستەمبولەوە نامە بۆ باوکی دەنێرێت و پێیدەڵێت نایەوێت چیتر بیبینێت، تووشی حەسرەتێکی گەورە دەبێت، بەوەدا دکتۆر پیاوێکی زەنگین و دەستکراوەیە، سیخوڕ و هەواڵگرێکی زۆر دەخاتە دوای محەمەدی کوڕی تا لە نهێنی گۆڕان و تەلیسمی پشت چیرۆکەکەی تێبگات. نازناوی سیخوڕەکانی دکتۆر نارین هەموویان بە نێوی مارکە جۆراوجۆرەکانی سەعاتەوەن، وەک «زینات، سیکۆ، سەرکیسۆف». دکتۆر خۆی لە هەوادارانی کۆکردنەوەی سەعات و چەکە، شانازی بەوەوە دەکات کە تورکیا لە پێشی پێشەوەی وڵاتانی دونیادایە لە کڕینی سەعاتدا، شەرمی بەوەش نییە کە تورکیا چەک و سەعات بهێنێت، چونکە زەمەن و چەکداری موڵکی یەک نەتەوە نیین، بەڵکو موڵکی هەموومانن. سیخوڕەکانی نارین شەو و ڕۆژ و لە گۆشەی جیاوازەوە چاودێری محەمەد دەکەن. دکتۆر لە ڕێگای ڕاپۆرتی سیخورەکانەوە تێدەگات، کە ئەوەی کوڕەکەی و خەڵکانێکی تریشی لە خشتەبردوە، کتێبێکی نادیارە کە کاریگەرییەکی تەلیسماوی و سیحراوی جێدەهێڵێت. دکتۆر ئەمە بە بەشێک لەو پیلانە گەورەیە دەزانێت کە دژ بەو و دژ بە شارستانیەتی نەتەوەیی سازکراوە. بڕیاردەدا هەموو نوسخەکانی ئەو کتێبە بفەوتێنێت و ئەوانەش لەنێوبەرێت کە بڵاویدەکەنەوە. لە گەڕان و پشکنین و سۆراغیدا بەدوای ئەو کتێبەدا، لە ئەنجامی چاوەدێرکردنی بەردەوامی محەمەدەوە، ڕێگای دەچێتە سەر

فەرمانبەرێکی پیری هێڵی شەمەندەفەر بە ناوی «ڕفقی»ـەوە. ڕفقی فەرماندەیەکی هێڵی شەمەندەفەرە کە ساڵگەلێکی زۆری تەمەنی لە پاڵ ئیشەکەیدا لە بەڕێوەبەرایەتی هێڵی ئاسن، خەریکی نوسینی چیرۆکی منداڵان بووە، کۆنە دراوسێیەکی ماڵی عوسمان و دۆستێکی دێرینی باوکێتی، کە عوسمان لە منداڵیدا هاتوچۆیکردون. بەوەدا لەو دەمەدا گۆڤارە ئەمریکاییەکانی منداڵان کە باس لە کاوبۆ و هیندی سوور و هێڵی شەمەندەفەر دەکەن، فرۆشتیان زۆرە، ڕفقی بڕیاردەدات هەمان ئەو چیرۆکانە و بە هەمان ستایلی ئەمریکی بنوسێتەوە، بەڵام پاڵەوانێکی نەوجەوانی تورکی بۆ زیادبکات و سەرجەم سەرکێشی و بوێرییەکان بە ناوی ئەو نەوجەوانە تورکەوە لە ئەمریکا حیکایەتبکات. محەمەد ئەو ڕاستییەی دۆزیوەتەوە کە نوسەری کتێبی دونیای نوێ، هەر ئەو کەسەیە کە زنجیرە چیرۆکی منداڵانی «پرتەو و پیتەر»ی نوسیوە، چونکە محەمەدیش لە منداڵیدا وەک عوسمان شەیدای چیرۆکەکانی رفقی بووە. پامۆک لێرەشدا وێنەیەکی کاریکاتێری مۆدێرنەی تورکی دەکێشێت. مۆدێرنەیەک کە پتر لەوەی پرۆژەیەکی ڕاستەقینە بێت، لە چیرۆکی کاریکاتێری منداڵان دەچێت، مۆدێرنەیەک پتر لەسەر وەهم و خەیاڵاتی لاسایکردنەوە دروستبووە، نەوەک لەسەر نوسینی تێکستێکی نوێ. گەر دکتۆر نارین لە ڕۆمانەکەدا نوێنەری کارێکاتۆری تورکێکی دەمارگیری بیرتەسک بێت کە لە دژایەتیکردنیدا بۆ دونیای نوێ دەست لە هیچ شتێک ناپارێزێت، ئەوا ڕفقی نوێنەری مۆدێرنەیەکی شەرمن و لاساییکەرەوە و کزۆڵەیە کە ناتوانێت بەرگری لە پرۆژەی خۆی بکات. کە پیاوەکانی نارین دەزانن رفقی کارمەند لە هێڵی شەمەندەفەر نوسەری ئەو کتێبەیە دەیکوژن. نارین سیخوڕ و هەوڵگرەکانی خۆی دەخاتە دوای هەر کەسێک کە کتێبەکە بخوێنێتەوە. تەواوی دۆسییە و نهێنی ڕێکخراوەکەیشی دەخاتە ژێر دەستی عوسمان کە هەڵبەت بە

نـاوی عەلـی قـەرەوە لـە ماڵـی دکتـۆر وەک جوانێکـی خۆبەخـش خـۆی دەردەخـات کـە هاتـووە شـەڕ لەگـەڵ پیلانگێـران و دوژمنانـی کەلەپـووردا بـکات. ناریـن وەهـا خۆشـحاڵ و سەرمەسـتە بـە عوسـمان لـە فیکـری ئەوەدایـە بیکاتـە کـوڕی خـۆی. عوسـمان لـە ڕێـگای خوێندنـەوەی ڕاپۆرتـی سـیخوڕەکانی دکتـۆرەوە بـۆی دەردەکەوێـت کـە تێوەگلانـی ئـەو لـەم حیکایەتـەوە دەگەڕێتـەوە بـۆ پلانێکـی پێشـوەختی جانـان و محەمـەد کـە کەوتوونەتـە سـەر کەڵکەڵـەی ئـەوەی کتێبەکـە شـتێک لێبکـەن و بیدەن بـە یەکێـک. عوسـمان دڵنیایـە کـە محەمـەد نەمـردوە، بەڵکـو لـە ژێـر ناوێکـی دیکـەدا لـە جێگایەکـی دیکـەدا دەژی، بـەوەدا لـە ڕێـگای ڕاپۆرتەکانـی دکتـۆرەوە زانیـاری لەسـەر زۆربـەی ئەوانـە لەلایـە کـە سـەروکاریان لەگـەڵ کتێبەکەدایـە و پیاوانـی ناریـن چاوەدێریاندەکـەن، بڕیـاردەدات یەکەیەکـە بـۆ ئەوانـە بگەڕێـت کـە لـە ژێـر چاوەدێریـدان تـا محەمـەد دەدۆزێتـەوە، ڕۆژێـک جانـان بـە نەخۆشـی جێدەهێڵێـت و دووبـارە دەکەوێتـەوە سـەر هـەوای سـەفەر و شـارە و شـار کـردن و ئۆتۆبیـس گـۆڕیـن، تـا دواجـار لـە شـارێکدا محەمـەد دەدۆزێتـەوە، کـە نـاوی خـۆی گـۆڕیـوە و خۆی ناوناوە «عوسـمان».

لـەو شـارەدا محەمـەد تەنیـا ئیشـی ئەوەیـە کـە جـار دوای جـار کتێبەکـە بـە تاقـەت و سـەبرێکی زۆرەوە دەنوسـێتەوەو دەیفرۆشـێت و شـتێک بـۆ ژیـان و بژێـوی پەیـدادەکات. عوسـمانی ڕاسـتەقینە و عوسـمانی سـاختە پێکـەوە چەنـد پیاسـەیەک دەکـەن، بـەڵام لەسـەرەتاوە دەزانیـن کـە عوسـمان هاتـووە محەمـەد بکوژێـت. هـۆکاری پشـت کوشـتنەکە وادەردەکەوێـت ئەوەبێـت کـە جانـان هەمیشـە حـەزی لـە محەمـەدەو بـە هـۆی خۆشەویسـتی ئـەوەوە ئـازار زۆر دەکێشـێت. دواجـار عوسـمان، محەمـەد لـە سـینەمایەکدا دەکوژێـت و دەگەڕێتـەوە بـۆلای جانـان، بـەڵام جانـان ونـدەبێـت و نایدۆزێتـەوە. ئیـدی سـاڵان دەڕوات و عوسـمان دەگەڕێتـەوە بـۆلای دایکـی و ژن دەهێنێـت و دەبێـت بـە خـاوەن کچێـک، دەبیسـتێت کـە جانـان شـوویکردوە و

سەفەریکردوە بۆ ئەڵمانیا. کۆتایی ڕۆمانەکە، چیتر گەڕانی عوسمان نییە بەدوای دونیای نوێدا، بەڵکو گەڕانێتی بەدوای خولیای ئەو فریشتەیەی کە خوێندنەوەی کتێبەکە لەگەڵ خۆیدا ڕایدەکێشێت، ئەو فریشتەیەش بە تەنزێکی ئاشکرا ڕێگایەکی کۆمیدی بڕیوە، سەرەتا عوسمان بە هۆی کتێبەکانی ڕفقییەوە تێدەگات کە ڕیشەی ئەو فریشتەیە لای «ڕیلکە»وە هاتووە، بەڵام زوو دەگاتە ئەو بڕوایەی کە وێنەی ئەو فریشتەیە لە کاغەزی سەر جۆرە شیرینییەکی منداڵانەوە هاتووە کە نیگاری جۆرە فریشتەیەکی وەهای لەسەرە، لێرەدا شیرینی و کەرەمێلا وەک سەمبولی تازەکردنەوە سەیردەکرێت، کە منداڵانی نەوەی نوێی پێ پەروەردەدەبن. وەک ئەوەی پامۆک گاڵتە بەسەرجەمی ئەو ڕەوتەبکات کە مۆدێرنە بڕیویەتی، بەدوای سەرچاوەی ئەو فریادڕەسە خورافییەدا دەگاتە لای پەروین ئاغا ناوێکی کوێر کە خاوەنی کارخانەی کارمێلاکە بووە و منداڵان هەموو لە شیرینییە فریشتەدارەکەی ئەویان خواردوە... کۆتایی ڕۆمانەکە ئاڵۆز و تەنزئامێز و تاڵە. عوسمان دوای ئەوەی نهێنی فریشتەکەی لای ئەو خاوەن فابریکە کوێرە دەستدەکەوێت، دەزانێت ئەو فریشتەیە هیچ نییە جگە لەو فریشتە شینەی ڕۆمانەکەی هێنریش مان کە مارلین دیتریش ژنە ئەکتەری بەناوبانگی ئەڵمان ڕۆڵی تیادەبینێت. واتە لە ڕاستیدا هیچ نهێنییەک لە گۆڕێ نییە، زیندەگی نوێ و نیگای فریشتە سیحرییەکەی ئەو مانا شاردراوەو قووڵەیان نییە کە عوسمان چاوەڕانیدەکرد. ئیدی نائومێد دەگەڕێتەوە و لە ڕێگا لە ساتێکدا کە خەریکە ئۆتۆبیسەکەیان بەجۆرێکی کوشندە خۆی دەدات بە ئۆتۆبیسێکی دیکەدا عوسمان بەڕوونی ئەو فریشتەیە دەبینێت. ئەو فریشتەیە هیچ نییە جگە لە فریشتەی مەرگ، ئەو کتێبەش هیچ نییە جگە لە کتێبی مەرگ. خەونی ژیانی نوێ بەو جۆرەی کە دێتە تورکیا، بە ڕێگایەکی پوچ و بێمایە و بێناوەڕۆکدا دەڕوات و لە کۆمەڵێک

پێکدادان و بەریەککەوتنی کوشندە و پوچگەرادا تەواودەبێت.

ئاشکرا نیگای پامۆک بۆ کێشەی ترادسیۆن و مۆدێرنە، نیگایەکی تراژیدییە کە تاڕادەیەک لە پوچی مۆدێرنەی تورکی و بەربەریەتی ترادسیۆن نائومێدە.

پامۆک خۆی لە یەکێک لە چاوپێکەوتنەکانیدا دەڵێت «ئەوەی دوو کیشوەر، دوو کولتوور، دو ڕۆحی هەبێت، حەکیمتر، زیرەکتر، کامڵترە». بەڵام دوای خوێندنەوەی ڕۆمانی ژیانی نوێ، مرۆڤ دەگات ئەو بڕوایەی کە کێشەی گەورەی تورکیا ئەوەیە کە نایەوێت دوو کولتوور، دوو ڕۆح، دوو کیشوەری هەبێت، نیوەی تورکیا ئێستا بە لای بەشێکی ئەو ڕۆحە و نیوەکەی دی بەلای بەشەکەی دیکەی ئەو ڕۆحەدا دەڕوانێت. ئەوەش گرفتێکی کوشندەی بۆ ئەم وڵاتە دروستکردوە.

لە ڕۆمانی قەڵای سپیدا پامۆک یەکێک لە شاکارە گەورەکانی خۆیمان پێشکەشدەکات، گەرچی من ئێجگار سەرسامم بە ڕۆمانی «ناوم سوورە»، بەڵام وەک تێکستێکی هونەری «قەڵای سپی»م پێ کامڵتر و وەستایانەترە، لەگەڵ کورت و بچوکی ڕۆمانەکەدا دەسەڵاتی پامۆک بەسەر مەتریال و کاراکتەر و گێڕانەوەی ڕوداوەکەندا لە لوتکەدایە. لەم ڕۆمانەشدا دیسان سەنتەر و بابەتی کارەکە بە تەواوەتی لەسەر خۆرهەڵات و خۆرئاوا یان دونیای ئیسلام و دونیای مەسیحییەتە. وەک ئەوەی کۆی ڕۆمانەکە بانگەوازێکی گەورە بێت بۆ پێکەوە ژیان. ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە لە پێش زەمانی حوکمڕانی «سەدری ئەعزەم کۆپرولو» و لەسەردەمی ئەودا ڕوودەدەن. کاتێک حیکایەتخوانی چیرۆکەکە، کە گەنجێکی ئیتالییە بەکەشتی لە ڤینیسیاوە بەرەو ناپۆلی دەڕوات، چەند کەشتییەکی تورک ڕێگایان پێدەگرن و بە دیل دەکەوێتە دەست جەنگاوەرانی عوسمانی کە لەگەڵ کۆمەڵێک دیلی دیکەدا دەیبەن بۆ ئەستەمبول. کابرای ئیتالی کە لە گەلێک ڕشتەدا قاڵ و لە زۆر لکی

زانستدا شارەزایی هەیە، بۆئەوەی کاری قورسی پێنەکەن، خۆی بە پزیشک نیشاندەدات و لە چاکردنەوەی چەندین نەخۆشدا بەشداریدەکات، زۆربەی دەرمان و داروەکانیشی کاریگەری باش لەسەر نەخۆشەکان جێدەهێڵن. لە ماوەیەکی کورتدا ناوبانگی دەگاتە لای پادشا و ئەویش بۆ دەردی تەنگەنەفەسی داوای کۆمەکی لێدەکات، وا دەبێت کە دەرمانەکانی پادشا چاکدەکەنەوە. ئەوە دۆخی لە زیندان باشتر دەکات و ئومێدێکی بۆ ئازادی لا پەیدادەبێت. بۆئەوەی بتوانێت خۆی بخاتە دۆخێکەوە هەرچی زووتر بگەڕێتەوە بۆ نێو کەسوکاری خۆی، فێری تورکی دەبێت، بەڵام پادشا و نزیکانی، کە جارجار سوود لە بەهرەی دەبینن، دەیخەنە ژێر فشاری ئەوەی ببێتە موسڵمان و دەست لە مەسیحییەت بەردا، بەڵام هەوڵەکانیان بێسوود و بێئەنجام دەمێنێتەوە. پادشا کە تاڕادەیەکی زۆر لە زانیاری و توانای ئەم دیلە دڵنیایە، دەیبەخشێتە یەکێک لە پیاوە زاناکانی خۆی کە بە خواجا دەناسرێت. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە خواجا و کۆیلەکەی زۆر لە یەک دەچن، بەسەر و ڕوخسار مرۆڤ ناتوانێت لە یەکیان جیابکاتەوە، وەک دووانە وەهان. ڕۆمانەکە چیرۆکی سەیر و سەمەرەی پەیوەندی خواجایە بە کۆیلەکەیەوە، پەیوەندییەک پڕە لە کێشمەکێش و ڕەهەندی ناکۆک. بەسەرێک لە پەیوەندی مامۆستا و قوتابی دەچێت، چونکە خواجا خۆی دەیەوێت چ زانیارییەک لای کۆیلەکەی هەیە فێربیێت، بەڵام بەسەرێکی دی خواجا هەردەم دەیەوێت خۆی وەک بلیمەتێکی بێوێنە و هاوشێوە ئیتالییەکەی وەک گەمژەیەک نیشانبدات. لێرەوە پەیوەندی نێوانیان تێکەڵەیەکە لە نزیکبوونەوە و نەفرەت، یەکدی ئازاردان و لێبوردن، ڕق و بەزەیی، ڕێز و قێز. تەواو وەک پەیوەندی خۆرهەڵات بە خۆرئاواوە، کە لە زۆربەی فۆرمەکاندا لەسەر ئەوە دروستبووە، بۆیەکی بسەلمێنن کامیان لە کامیان بڵندتر و بەهێزتر و زیرەکترن. پامۆک لەڕێگای پەیوەندی خواجا

و کۆیلەکەیەوە، بڕگەیەکی گرنگ لە مێژووی خۆرئاوا و خۆرهەڵاتمان بۆ دەگێڕێتەوە. من ڕۆمانەکە وەک ڕۆمانی ڕۆبنسۆن کرۆسۆی دانیال دیفۆ دەبینم، وەک چۆن دانیال دیفۆ، لەڕێگای پەیوەندی ڕۆبنسۆن کرۆسۆ و فرایدەیەوە پەیوەندی خۆرئاوا بە دەرەوەی خۆی دەخوێنێتەوە، پامۆک لە ڕێگای ئەم ڕۆمانەوە پەیوەندی جیهانی ئیسلامی بە دەرەوەی خۆی دەخوێنێتەوە. بەڵام گرنگی تێکستەکە لەوەدایە، حیکایەتەکە لەبری ئەوەی لە زمانی پیاوی سەردەستەوە «واتە خواجا»وە بگێڕدرێتەوە، وەک لای دانیال دیفۆ دەیبینین، لە زمانی کۆیلەوە «واتە لە زمانی فرایدەیەوە» دەگێڕدرێتەوە. ئەم دەستکاریکردنە لە ڕوانگەدا، ئێجگار گرنگە بۆ ئەوەی تێبگەین تێکستەکەی پامۆک هەڵگری ئەو کینە دینی و ئەتنییە نییە کە تێکستەکەی دانیال دیفۆ هەڵگرێتی. ڕۆمانەکە دەست لەوە ناپارێزێت وێنەیەکی کاریکاتێری بۆ خواجا بکێشێت. خەیاڵاتەکانی خواجا، نمونەیەکی دیکەی تێگەیشتنی پڕ خورافەتی ئێمەی خۆرهەڵاتییە لە زانست. خواجا نمونەی ئەو زانایەیە کە نە پرسیارە ڕاستەقینەکان و نە وەڵامە ڕاستەقینەکان دەدۆزێتەوە، ژیانی لە کێشەی وەهمی و هاوکێشەی خەیاڵیدا دەباتەسەر، بەڵام پێشی وایە کە تەمەن و کاتی خۆی هەمووی تەرخانی فێربوون و زانستکردوە. خواجا هەردەمە خەریکی کێشەیەکە، بەڵام چۆنێتی تەماشاکردنی بۆ ئەو کێشانە دوورە لە مامەڵەی عەقڵانی و زانستییەوە. سەردەمانێک خواجا خەریکی فەلەکناسی دەبێت، دەکەوێتە خەیاڵاتی ئەوەی لە نێوان زەوی و مانگدا ئەستێرەیەکی تر هەیە و دەبێت بیدۆزێتەوە، وابیر لە ئەستێرەکان دەکاتەوە وەک ئەوەی مەخلوقاتی زیندووبن و بیربکەنەوە و بەوردی ئەندازە و ماتماتیک بزانن. دواتر دەکەوێتە سەر خولیای نوسینی کتێبێک لەسەر مێرولە، لە زۆربەی پرۆژەکانیدا خولیای سەرەکی ئەوەیە سەرنجی پادشا ڕابکێشێت و ئافەرینی ئەو وەربگرێت. ماوەیەک دواتر دەست لەو پرۆژانە بەردەدات

و سەروەختێک خولیای ئەوە دەکەوێتە سەرییەوە، بزانێت «گەمژەکان بۆ وا گەمژەن؟»، دواتریش دەیەوێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدۆزێتەوە کە «من بۆ منم؟». ڕۆژگارێک پێیوایە بەندەکە دەتوانێت بیر و خەیاڵاتی خەڵکی تر بخوێنێتەوە، بەڵام نایەوێت ئەو فێربکات، ماوەیەک بەردەوام بە کورسییەکەی خۆیەوە دەیبەستێتەوە و ناچاریدەکات خراپەکانی خۆی تۆماربکات، تا تێبگات «ئەو بۆ ئەوە». ئیدی وای لێدێت خواجا خۆشی دادەنیشێت و خراپەکانی خۆی دەنوسێتەوە. لەڕێگای گێڕانەوەی وردی ژیانی خۆیانەوە هەردووک بە وردی شارەزای ڕابوردووی یەک دەبن، خواجاش فێری ئیتالی دەبێت، ئیدی تەواو وەک دووانەیەکی ڕاستەقینەیان لێدێت کە هەریەکەیان دەتوانێت ئاوێنەی ئەوی دی بێت. بەپێی ئەو وێنەیەی پامۆک دەیکێشێت، مرۆڤ تێدەگات، خۆرهەڵات و خۆرئاوا دوو منداڵی دووانەن، بەڵام لە پەیوەندییەکی نەخۆشدا دەژین و فیگەرە خۆرهەڵاتییەکەش بێئەندازە نوقمی خورافاتی خۆیەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانن پێکەوە ئیشبکەن، دەتوانن هەردوولا لەسەر یەک مێز دانیشن و لەیەک فێربن، بەڵام وەک دەردەکەوێت ئەو دانیشتن و کۆبوونەوەیە پڕکێشە و گرفت و شێوازی ناعەقلانییە. خواجا لەم ڕۆمانەدا نوێنەری دین و کولتووری خۆرهەڵات نییە، بەڵکو نوێنەری تێگەیشتنی خۆرهەڵاتییە لە زانست، نوێنەری یەکەمین پەیوەندی ناعەقلانی خۆرهەڵاتە لەگەڵ ئەو دەستکەوت و خەیاڵە زانستیانەی ڕێنیسانسی ئەورووپی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت. گرفتەکە ئەوەیە کە ئەم نوێنەرە خورافییەی زانست و تازەگەری لە ناو کولتووری ئیسلامیدا شوناسی ڕاستەقینەی ئاشکرا نابێت. خواجا، بێئەوەی بووبێتە خاوەنی عەقڵییەتێکی زانستی ڕاستەقینە، هەندێکجار ڕۆڵی مونەجیمە کۆنەکان بۆ پادشا دەبینێت. دووری عەقڵی خواجا لە زانستەوە تەواو لە ڕۆژگاری تاعووندا ئاشکرادەبێت. هەرچەند کۆیلە ئیتالییەکەی دەیەوێت

خواجا تێبگەیێنێت کە تاعوون نەخۆشییەکی دەستپردە و لە مرۆڤەوە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ، بەڵام خواجا پێکەنینی بەو قسانە دێت و لای وایە گەر مرۆڤ ڕۆژی تەواوبوو لە هەرجێگایەک بێت مەرگ دێتە میوانی. کۆیلە ئیتالیەکە تێناگات، ئازایەتی بەو مانایەی خواجا باسی لێوەدەکات مانای چی، ئەو باوەڕی بەو لۆژیکە زانستییە هەیە کە تاعوون نەخۆشییەکی ترسناکە و دەشێت مرۆڤ لە یەکێکی دییەوە وەریبگیرێت و بمرێت، بەڵام خواجا بە پێلەرزۆک و ترسنۆک ناویدەنێت. لە ڕۆژگاری تاعووندا جیاوازی نێوان هەردوو ئەو ڕۆحە ئاشکرا دەردەکەوێت. بەڵام مەترسی ئەو گیانی خورافەتە ئەوکات تەواو دەردەکەوێت کە خواجا دەیەوێت چەکێکی زۆر کاریگەر و کوشندە بۆ پادشا دروستبکات، تا بتوانێت دوژمنانی ئیسلام تارومارکات. کۆتایی ڕۆمانەکە باسی ئەو چەکەیە کە خواجا و کۆیلەکەی شەش ساڵ کاری لەسەر دەکەن و دواجار دەبێتە بەشێک لە هێزی سەربازی عوسمانی و سوڵتان دەیخاتە ژێر فەرمانی ڕاستەوخۆی خۆیەوە، بەڵام ئاشکرایە کە چەکێکی بێسوودە، لە پەلامارەکاندا ڕۆڵێکی گرنگ نابینێت، دواجار لەشکرکێشی سوڵتان بۆسەر پۆلۆنییەکان، لە ئاست قەڵایەکی سپییدا تووشی نوشوستی دێت، دوای چەندین هێرش عوسمانییەکان لە ئاست قەڵاکەدا دەستەوەستان دەبن، پادشا بڕیاردەدات ئەو چەکە گەورە و تایبەتییەی خواجا بخاتە شەڕەوە، بەڵام خواجا دڵنیایە کە گەر چەکەکەی نەتوانێت شەڕ بباتەوە، لەوانەیە سوڵتان کۆیلەکەی بە مەرگ سزابدات. هەر ئەو شەوە بڕیاردەدا لەگەڵ کۆیلە ئیتالیەکەیدا جێگای خۆیان بگۆڕنەوە. چونکە تەنیا بەو ڕێگایە دەتوانێت ژیانی کۆیلەکەی ڕزگاربکات، کە بەشێک لەسەربازەکان بە کافر و جاسوس و مایەی بەدبەختی تاوانباریدەکەن. چەندین ساڵی پێکەوە ژیانی خواجا و هاوشێوەکەی، هەر دووکیانی بە جۆرێک وەکیەک لێکردوە، هەمان خەون

و هەمان خولیایان هەیە، ئەوەی خواجا بیری لێدەکاتەوە لای کۆیلەیە و ئەوەی کۆیلەش بیری لێدەکاتەوە لای خواجایە. هەر دووکیان زۆر شت لەسەر ژیانی ئەوی تر دەزانن و هەردوکیشیان بە ڕوخسار وەک یەکن. شەوی پێش پەلاماری قەڵای سپی، کۆیلە ئیتالییەکە تێدەگات خواجا دەیەوێت خۆی بکات بەو و بڕوات بۆ ئیتالیا و ژیانی ئەو بژی، دووبارە تا بەیانی هەموو شتێکی لەسەر ژیانی خۆی بۆ دووبارەدەکاتەوە، هەموو ئەو وردەکاریانەی فێردەکات کە بۆ نیشتەجێبوونەوەی لە ئیتالیا پێویستی پێیەتی، دەمەو بەیان خواجا دەڕوات و کۆیلەکەش دەبێت بە خواجا و جێگای ئەو دەگرێتەوە.

پامۆک لەم ڕۆمانەدا جگە لە دەرخستنی ئەو دیوە ناکۆک و پڕگرفتانەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا پێکەوەکۆدەکەنەوە، باس لە تێکەڵاوی و وەک یەکی و هاوشێوەی و یەک جەوهەری هەردوو دونیاکەش دەکات، خواجا دەڕوات بۆ ئیتالیا و لەوێ وەک ئەوەی ئەو لە نێو تورکاندا غەریبە بووبێت، ژیانێکی نوێ دەست پێدەکات، بەچاوی غەریبەیەک لەسەر تورکان دەنوسێت، ناوبانگ پەیدادەکات و زەنگین دەبێت. کۆیلەکەش ژیانی خواجا دەژی، ئەو خەونانەی خواجا جێبەجێدەکات... خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەکرا یەک بن، دەکرا بچنە جێگای یەک، دەکرا بەپلەیەک لەگەڵ یەکدا تەماهیبکەن و چۆنایەتی یەک هەڵگرن کە لێک جیانەکرێنەوە. لەبەر ئەم تێڕوانینە قووڵەیە، هانز پیتەر کونیش لە ڕۆژنامەی «دی تزایت»دا دەنوسێت «هیچ کەسێک نییە، وەک پامۆک، ئەگەری بوونی پێکەوەیی نێوان ئیسلام و خۆرئاوای بەرجەستەکردبێت».

لە ڕۆمانی «ناوم سووره»دا ململانێی نێوان مۆدێرنە و ترادسیۆن بەجۆرێکی تر چڕدەبێتەوە، هاتنی خۆرئاوا دەبێتە کێشەیەکی ناوەکی و قووڵی خۆرهەڵات خۆی، دەبێتە کێشەی مۆدێرنە و ترادسیۆن و لەوە دەردەچێت، کێشەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بێت. ئەم ڕۆمانە مێژوویترین

کاری پامۆکە، خوێنەری ئەم ڕۆمانە حەتمەن بەو هەموو زانیارییە سەرسام دەبێت کە پامۆک لەسەر هونەری خۆرهەڵاتی کۆن و هونەری میناتۆری ئێرانی و نەخشی چینی و مێژووی ڕێباز و قوتابخانە دێرینەکانی دونیای ئیسلام هەیەتی. توانای پامۆک لەسەر خولقاندن و سازاندنەوەی فەزای سەدەی شازدەدا بێوێنە و بلیمەتانەیە. ڕوداوەکانی ڕۆمانەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٥٩٠ ی زاینی. بەپێچەوانەی ڕۆمانەکانی تری پامۆکەوە، ئەم ڕۆمانە بە شێوازی پۆلیڤۆنی نوسراوە، تێکستێکە کە تێیدا مردوەکان و سەگ و پارە و درەخت و ئەسپیش قسەدەکەن. لە بنەڕەتدا دستۆفسکی داهێنەری ئەم شێوازە تەکنیکییەیە، دواتر فۆکنەر گەشەی پێدەدات، مارکیزیش لە پاییزی پەتریارکەکەیدا ڕوخسارێکی نوێی پێدەبەخشێت، بەڵام بەکارهێنانی پامۆک بۆ ئەم شێوازە تەکنیکییە، تایبەتمەندی خۆی هەیە، پامۆک بەجۆرێک ئەم تەکنیکە بەکاردەهێنێت کە زۆر بەشێوازی فۆکنەر نزیکە، بەڵام لە ستایلی ئەو فراوانتر و بەربڵاوتر و ئۆرگانیترە. ڕۆمانەکە بەڕای ژمارەیەکی زۆر لە ڕەخنەگران نزیکییەکی گەورەی لەگەڵ ڕۆمانی «ناوی گوڵ» ی ئەمبرتۆ ئیکۆدا هەیە. ئەگەر بزانین ناوی گوڵ لە هەندێک لە زمانە ئەورووپییەکاندا بە «ناوی گوڵی سوور» وەردەگێڕدێت، ئیدی دەزانین کە نزیکی لە ناونیشانەکانەوە دەست پێدەکات. لە ناوەڕۆکیشدا هەردوو ڕۆمانەکە چیرۆکی زنجیرەیەک کوشتنن کە بە هۆکاری دینی و لەفەزایەکی پڕ لە تابۆ و حەرامدا ئەنجامدەدرێن، لێکچوونەکان لە نێوان ئەو دوو ڕۆمانەدا بە ئەندازەیەک زۆرن کە وتارێکی تایبەتی دەوێت، هەندێک لە پاداشتی ئەو نزیکییەدا پامۆک بە «ئیکۆی تورکیا» ناودەبەن، بەڵام ئەوەی سەرنجبدات دەبینێت کە لە شێوازی قسەکردن و دونیابینی کاراکتەرەکاندا، هەناسە و ستایلی ئیتالۆ کالڤینۆش ئامادەگییەکی بێوێنەی هەیە. بەڵام لەوانەش بترازێت، من هەست بە کاریگەری و هەناسەی نوسەرێکی گەورەی وەک

«ئەمین مەعلوف»یش دەکەم، کە تاکە نوسەرێکی گەورەی خۆرهەڵاتە پێش پامۆک بەو قووڵی و چڕییە لەسەر مێژووی دێرینی ئیسلام و ناوچەکە کاریکردبێت، مرۆڤ لە خوێندنەوەی قەڵای سپی و ناوم سوورەدا نابێت سێبەری مەعلوف فەرامۆشبکات.

ڕۆمانەکە بە کوشتنی زەریفە فەندی دەست پێدەکات، کە بەر لە هەموو قسەکەرەکانی دی دێت و لە مەرگەوە قسەمان بۆدەکات. هۆکاری کوشتنەکەی زەریفە فەندی ئاشکرا نییە، بەڵام خۆی پێماندەڵێت، لە پشت مردنییەوە هێزێک وەستاوە کە دژی ئیمان و ترادسیۆن و جیهانبینیمانە، داواشدەکات ئەو بکوژە بدۆزینەوە. زەریف یەکێکە لە چوار نیگارکێش کە لە وەرشەنیگاری وەستا عوسماندا ئیشدەکەن، کەسێکە لە بواری «زێڕکاری» و ڕازاندنەوەی قەراغ و نەخشکردندا دەستوپەنجەیەکی زێڕینی هەیە. بەڵام کوشتنی ئەو تاکە تاوانی ناو ڕۆمانەکە نییە، هێند نابات «زاوا»ش کە نیگارکێشێکی شوێنباوەڕی سوڵتانە دەکوژرێت. زاوا باوکی شەکورەیە، ئەو کیژە قەشەنگەی کە قەرە لە دوازدەساڵییەوە خۆشیدەوێت. چەند ساڵێک لەوەوبەر کە قەرە دان بە خۆشەویستی خۆیدا دەنێت بۆ شەکورەی پوورزای، «زاوا» لە ماڵ دەیکاتەدەرێ و ئیدی بۆ فێربوونی نیگارکێشان دەکەوێتە سەفەرێکی درێژ بە شارە گەورە و گرنگەکانی خۆرهەڵاتدا و لەسەر دەستی نیگارکێشە گەورەکاندا نەقاشی فێردەبێت، دواتر لەسەر داوای زاوا دەگەڕێتەوە تا لە نەخشکردن و دروستکردنی کتێبێکی نهێنیدا کۆمەکی پێبکات. زاوا ساڵانێک پێشتر بە ئیشی سوڵتان ڕووی لە ڤینیسیا کردوە، لەوێ کاری هونەرمەندانی نوێی ئەورووپایی بینیوە، ئەو تابلۆیانەی بینیوە کە دەروازەی ڕینیسانسی ئەورووپین، بە شێوەیەکی سەیر کەوتۆتە ژێر کاریگەری هونەری «فەرەنگییەکانەوە». ئەم کاریگەرییە دەرەنجامێکی کوشندەی لەسەر چارەنوسی خۆی و زەریفە فەندی دەبێت. لە هونەری

ئیسلامیدا هونەرمەند بۆی نییە نە کاراکتەری تایبەتی شتەکان و نە بۆچوون و گۆشەنیگای شەخسی خۆی بخاتە ناو تابلۆوە، تاکە شتێک دەتوانێت بیکات ئەوەیە شتەکان لە گۆشەنیگای ئیلاهییەوە ببینێت، چونکە هەرجۆرە ئیجتیهادێکی تایبەتی وەک لاسایکردنەوەی خالقی لێدێت، ئەوەش کوفرێکی گەورەیە. هەڵبەت نوێکردنەوە لە هونەری ڕینیسانسی خۆرئاوایشدا تا ئەندازەیەکی زۆر لەسەر مەسەلەی «ڕوانگە» دارێژراوە، کە بوار بۆ هونەرمەند دەکاتەوە لەگۆشەنیگای خۆیەوە دونیا ببینێت. مەسەلەی ڕوانگە واتە مرۆڤ خۆی شتەکان وەها بخولقێنێتەوە وەک ئەوەی چاوی خۆی دەیانبینێت، ئەوەش بە تەفسیری ئیسلامی خۆخستنە جێگای خالیقە. بەڵام زاوا کە لەسەفەری ئەوروپا دەگەڕێتەوە و هەوای لاسیکردنەوەی ئەوروپییەکان پەڕیوەتە سەرییەوە، دەیەوێت شتێکی نوێ بهێنێتە ناو سەرای پادشایانی عوسمانییەوە، شتێک ئەو ترادسیۆنە دووبارە نەکاتەوە کە مامۆستایانی گەورەی هونەری ئیسلامی و وەستا گەورەکانی هیرات و تەورێز پەیڕەویانکردوە. پادشا تەواو دەچێتە ژێر کاریگەری زاواوە و دەکەوێتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کتێبێکی ڕەنگاوڕەنگی قەشەنگ کە هونەری بەرزی خۆرهەڵات نیشان ئەوروپاییەکان بدات پێشکەش بە یەکێکە لە دۆقە گەورەکانی ئیتالیا بکات، بڕیارە لە ناوەڕاستی کتێبەکەدا، وێنەیەکی چێوەزێڕی سوڵتان خۆی بەشێواز و ستایلی فەرەنگییەکان کتێبەکەی ڕازاندبێتەوە، سوڵتان بۆ ئەم کارە لە بری وەستا عوسمان، زاوا دەکاتە سەرپشکی پرۆژەکە، کە هەڵبەت ئیرەیی و وەڕزییەکی زۆر لای وەستا عوسمان و لە نێو شاگردەکاندا دروستدەکات. بەڵام هەمووش دەزانن کە زەریف لە دروستکردنی ئەو کتێبەدا کە زۆر نهێنی و تایبەتییە کۆمەک بە زاوادەکات. زاوا و زەریف پرۆژەکە وەها دەخەنە قاڵبێکی نهێنیی و تەلیسماوییە، فزوڵی زۆربەی شاگرد و وەستاکانی

نەخشخانەکەی عوسمان دادەگیرسێنێت. دوای کوشتنی «زەریف» و«زاوا» ئیدی ئاشکرایە کوشتنەکە هۆیەکی تایبەتی لە پشتە و سوڵتان کە زۆر نیگەرانە و هەستدەکات پیلانێک دژ بە کتێبەکەی لە گۆڕێیە، هەر یەک لە عوسمان و قەرە دەگرێت و مۆڵەتی سێ ڕۆژیان دەداتێ پیاکوژەکە بگرن. تێوەگلانی قەرە لە مەسەلەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ بابەتی سەنتراڵ و سەرەکی ڕۆمانەکە کە عەشقی هەمیشەیی قەرەیە بۆ شەکورە. لەو چەند ساڵەدا کە قەرە ئاوارە دەبێت و بۆ فێربوون دەبێتە وێڵگەردی شار و قوتابخانە دوورەکان، شەکورە شوویکردوە بە جەنگاوەرێک و دوو کوڕی بووە، بەڵام مێردەکەی چوار ساڵە بێ سەر و شوێنە و لە مەیدانی جەنگ نەگەڕاوەتەوە، لەو نێوەندەشدا حەسەنی برای مێردەکەی شێتانە عاشقی شەکورە بووە و دەستی لێبەرنادات و دەیەوێت لە ماڵی خەزووری بمێنێتەوە و ڕێگا خۆشدەکات بۆئەوەی ڕۆژێک بیخوازێت. شەکورە لەبەر فشاری بێوچانی حەسەن دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی واتە بۆ لای «زاوا»، بەڵام شەکورە هەمیشە دوودڵە و نازانێت لە نێوان قەرە و حەسەندا کامیان هەڵبژێرێت. لە نێو ئەو هەموو دودڵی و پیلان و پرسیارانەدا، ڕۆژێک شەکورە دوای کورتە ژوانێک لەگەڵ قەرەدا دەگەڕێتەوە و دەبینێت باوکی کوژراوە، بۆئەوەی مردنی باوکی نەبێتە ڕێگر لە نێوان ئەو و قەرەدا، قەرە ناچاردەکات لای قازی و بە پارە و بە ڕێگای پێچاپێچ بێوەژنبوونی شەکورە بە شەرعی بناسێت و ڕایبگەیێنێت کە بەهۆی مردنی مێردەکەیەوە، شەکورە شوویدێت و مێردکردنی حەڵاڵە. بەوجۆرە و بەشەرعی و بە نوسراوی قازی شەکورە و قەرە دەبنە ژن و مێرد. بەڵام شەکورە بەقەرە دەڵێت، گەر تاوانی کوشتنی باوکی ڕوونەکاتەوە و بکوژی ئەو دەستگیرنەکات، دەستی پیاناگات و پێیشاد نابێت. لەوێدا حەسەن کە ئیرەیی کوشتوێتی هەریەک لە قەرە و شەکورە بە کوشتنی زاوا و شاردنەوەی مردنەکەی

تاوانبـاردەکات، کـە دواجـار دەبێتـە مایـەی گرتنـی قـەرە. دەبێت بڵێم کـە سروشـتی پۆلیسـیانەی چیرۆکەکـە، ڕێـگا لـەوە ناگرێـت پامـۆک لـەو هێڵـە فەلسـەفی و هونەرییـە دووربکەوێتـەوە کـە ڕۆمانەکـە خاوەنێتـی. زۆر ڕۆمانـی گـەورەی دونیـا ئـەو نەفەسـە پۆلیسـییەیان تێدایـە، بـەڵام ڕۆمانـە گـەورەکان لەپـاڵ ئــەو هەناســەیەدا هێڵێکــی فیکــری و فەلســەفی یــان هەوایەکــی سـایکۆلۆژی یاخـود فەزایەکـی میتافیزیکـی و سـوریالیان هەیـە، کـە ڕۆمانـی پۆلیسـی ئاسـایی نییەتـی. لێـرەدا هەڵەیـە واتێبگەیـن پامـۆک ڕۆمانێکـی پۆلیسـی ئاسـایی نوسـیوە. بەپێچەوانـەوە، پامـۆک پێدەچێـت لێـرەدا شـتێک لـەو تێبینیانـەی سارتەر نزیکبێت، سارتەر سـەردەمانێک خوێنـەری ڕۆمانـی پۆلیسـی بـوو، لـە دیالۆگەکانیـدا لەگـەڵ سـیمۆن دی بۆڤـار دا بـاس لـەوەدەکات مـرۆڤ دەتوانێـت سـوود لـە سـتراکتوری ڕۆمانـی پۆلیسـی وەربگرێـت بـۆ ئیشـکردن لەسـەر بابەتـی تـر، پامۆکیـش وەهـا دەکات. ئـەم ڕەهەنـدە تەکنیکییـە کاتێـک تـەواو ئاشـکرادەبێت کـە قـەرە و وەسـتا عوسـمان ناچاردەبـن بـەدوای بکوژەکـەدا، بکەونـە شـیکار و خوێندنـەوەی شـێوازی نیگارکێشـانی هـەر یـەک لـە سـێ نیگارکێشـەکەی وەرشـەکەی وەسـتا عوسـمان «لەقلـەق و زەیتـون و پەپولـە»، چونکـە دواجـار لـە دەسـتی زەریفـە فەندیـدا وێنـەی ئەسـپێک کـە بـە شـێوازێکی زۆر تایبـەت کـە لـە شـێوازی نیگارکێشـە مەغۆلییـەکان دەچێـت دۆزراوەتـەوە. ئەو ئەسـپە دەبێتـە ڕێگایـەک بـۆ ئـەوەی پامـۆک بـە وردەکارییەکانی ناو هونـەری دێرینی خۆرهەڵاتـدا بمانبـات، تـا دواجـار لەسـەفەرێکی سـەیر و پڕشـیکاردا، کـە زۆرجـار حیکایەتـی شـیکردنەوە سـیمۆلۆژیەکانی «غالب»مـان لـە ڕۆمانـی «کتێبـی ڕەش» دا بیردەخاتـەوە، دەگەینـە سـەر پیاوکوژەکـە. لێرەشـدا پامـۆک وەک قوتابییەکـی بلیمەتـی ئـەو سیسـتمە سیمۆلۆژییە دەردەکەوێت کـە ئەمبرتـۆ ئیکـۆ سـەرەتا لـە «نـاوی گـوڵ» و دواتـر لـە «بەندۆڵـی فۆکـۆ»دا ئیشـی پێکـردوە، بـە چەشـنێک مـرۆڤ ئاسـان دەتوانێـت بڵێـت

کە ئەگەر «ژیانی نوێ» ڕۆمانێکی ڕەمزی چڕبێت، ئەوا «ناوم سوورە» تێکستێکی سیمەنتیکی فرە لایەنە کە بەرهەمی ئەو ڕۆحە ئەرکیۆلۆژییە قووڵەیە کە پامۆک بە مێژووی کۆن و نوێدا دەگێڕێت. لێرەدا هونەری نەخش و نیگارکێشان سەنتەری پێکدادانی مۆدێرنە و ترادسیۆنن. وەک چۆن لە خۆرئاوا شێوەکاران دەرگا لە ڕینیسانس دەکەنەوە و پێشڕەوی تازەگەرین، پامۆک بەم ڕۆمانەی لە خۆرهەڵاتیش بۆ وەها تێزەیەک پێکوڵکاریدەکات. ئەو وادەبینێت کە شکاندنی تابۆ و حەرامەکانی ناو دونیای ڕەسم سەرەتای ئەو پێکدادان و بەریەککەوتنەی نێوان ترادسیۆن و نوێکارییە لە دونیای ئیسلامدا. فانەتیکبوون لە هونەردا، ئاوێنەیەکی سروشتی فاناتیکبوونە لە دیندا، هەموو کرانەوەیەکی هونەری شکاندنی ڕوانگەیەکی موقەدەس و هەرەسی جۆرێک لە جیهانبینییە. پامۆک لەم ڕۆمانەدا چەندە باس لە دڵڕەقی فاناتیکییەت دەکات، هێندەش لە فیتنە و سیحری مۆدێرنە ڕادەمێنێت، شوێنی سەرسامی نییە کە بزانین بکوژی زەریفە فەندی و زاوا، تەنیا لە بەر هۆکاری دینی تاوانەکان ئەنجام نادات، بەڵکو پیاوکوژەکە کەسێکە شێت و شەیدای ئەوەیە لە نزیکەوە مۆدێلی فەرەنگییەکان ببینێت، کە زاوا دەکوژێت و هەندێک لە لاپەڕەکانی کتێبەکەی دەدزێت بۆئەوەیە دەست لە سیحری ئەو شێوازە بدات کە زاوا لە فەرەنگییەکانەوە فێربووە. پامۆک لە «ژیانی نوێ»دا مۆدێرنەمان وەک ڕووناکییەکی سیحری بۆ باسدەکات کە مرۆڤەکان دەخاتە سەر هەوا و هەوەسی گەڕان بۆ جیهانێکی نوێ، کە هەڵبەت هەواو هەوەسێکی ناعەقڵانییە. لێرەشدا مۆدێرنەمان هەر وەک هێزێک پیشاندەدات، کە وەها بکێش و سیحراوییە خەڵکان دەخاتە سەر کەڵکەڵەی کوشتن. ئەوەی لە ڕۆمانەکەدا لای من بلیمەتانە دەردەکەوێت، ئەو ڕۆحە پراگماتیزمییەیە کە زۆربەی کاراکتەرەکان هەیانە، هەتا کاراکتەری قەرەش کە جوانترین و لە خۆبوردووترین کاراکتەری ناو

تێکستەکەیە لەو گیانە پراگماتییە بەدوور نییە. پامۆک لێرەشدا بەو فەزا و وێناکردنە جارێکی دی ڕۆحی مۆدێرنەمان بەر لە هاتن و سەر هەڵدانی مۆدێرنە خۆی بۆ دەخوێنێتەوە.

لە ڕۆمانی بەفردا پامۆک تەواوی ئەو ململانێیە کە لە ڕۆمانەکانی دیکەیدا سروشتێکی ڕەمزی هەیە، وەک جۆرە واقعێکی کۆمەڵایەتی تاڵ و پڕ لە غەم و خاڵی لە فەنتازیا نیشاندەداتەوە. لە سێ ڕۆمانەکەی دیکەدا ململانێی ترادسیۆن و مۆدێرنە، ململانێیەکی ڕەمزییە کە لە سەر ئاستی زانست «وەک لە قەڵای سپیدا» یان هونەر «وەک لە ناوم سوورەدا» یان شێوەی تێگەیشتن و ڕاڤەکردن «وەک لە ژیانی نوێ و کتێبی ڕەشدا» ڕوودەدات، دەبینرێت. لە بەفردا ئەم ململانێیە دەبێتە ململانێیەکی ڕۆژانەی سیاسی و کۆمەڵایەتی. شانۆی ئەم ڕۆمانە شاری قارسە، شوێنێکی دووردەستی باکوری خۆرهەڵاتی تورکیا. لەوێدا تەواوی ئەو ڕەگەزە دژ و ناتەبایانەی تورکیای ئەمڕۆیان دروستکردوە پێکدادەدەن. جگە لە شەڕی بەردەوامی ناسیونالیستە کورد و تورکەکان، شەڕی عەلمانییەت و دین لە توندترین و تاریکترین شێوەیدا هەڵگیرساوە. پامۆک پاڵەوانی ڕۆمانەکەی ناودەنێت «کا». خودی ئەم ناونانە بە ئەندازەیەک زیرەکانە و وردەکارانەیە کە جارێکی دی وامان لێدەکات، بە توانای پامۆک سەرسامبین، بە تایبەت لە ئاست گۆڕینی شتی بچوک و سادەدا بۆ شتی مانادار و پڕدەلالەت. ناوی کا ڕاستەوخۆ وەبیرهێنانەوەی پاڵەوانەکانی کافکایە لە ڕۆمانەکانی «کۆشک» و «دادگا» دا. چوونی «کا» بۆ قارس هاوشێوەی چوونی «کا»ی کافکایە بۆ ئەو شارۆچکە بێپوەرەی پاڵەوانەکە لە پێچ و پەناکانیدا سەرگەردان دەبێت. ناوی «کا» ناوێکی کافکاییە، کاراکتەری پاڵەوانەکەش هەمانشێوە و بەجۆرێکی بێهاوتا کافکاییە. «کا»ی شاعیر ڕۆحێکی ماندووە کە گەڕانی بەدوای بەختەوەریدا لە فرانکفۆرتەوە دەیگێڕێتەوە بۆ تورکیا و لەوێ لەسەر

داوای ڕۆژنامەیەکی تورکی ڕوو لە قارس دەکات تا ڕاپۆرتێک لەسەر ئەو کچە ئیسلامیانە بنوسێت کە بەهۆی قەدەغەکردنی حیجابەوە خۆیان دەکوژن. بەڵام جگە لەوە «کا» دەخوازێت ئیپەکیش ببینێت کە شۆخە هاوڕێیەکی زەمانی زانکۆیە، کە کاتی خۆی «کا» عاشقی بووە، بەڵام ئەو شوویکردوە بە موختار کە ئێستا لە ئەندامە پایەبەرزەکانی حیزبی ڕەفاهی ئیسلامییە. کا دەزانێت ئیپەک لە موختار جیابۆتەوە، لە دوای ئومێدێکی تاریک بۆ زیندووکردنەوەی ئەو عەشقە دێرینە ڕوو لە قارس دەکات. لەگەڵ گەیشتنی پاڵەوانەکەدا بە قارس بەفرێکی وەها دەبارێت ماوەیەک قارس دەبێتە شارێکی لە دونیا دابڕاو. «کا» لەو شارەدا ڕوو بە ڕووی واقعی ڕاستەقینەی تورکیا دەبێتەوە، لەگەڵ گەیشتنیدا بە قارس دەکەوێتە گەرمەی جەنگی حیجابەوە، هەر لەو ئوتێلەدا کە ئیپەکی تیا دەبینێت دەبێت بە شاهیدی کوشتنی بەڕێوەبەرێک کە کچانی لەچکپۆشی لە پەیمانگاکەی وەدەرناوە. پامۆک لە ڕۆمانێکی درێژدا کای پاڵەوان بە نێو چەندەها گرێ و دیالۆگ و کێشەی قورسدا ڕادەکێشێت کە جەمسەرە بەرابەرەکانی جارێک فانەتیکە دینییەکانن و جارێکیش فانەتێکە عەلمانییەکانن. پامۆک جارێکی تر تێزەی سەرەکی خۆی دەربارەی ڕوخساری مۆدێرنەی تورکی دووپاتدەکاتەوە. ئەو مۆدێرنە کاریکاتێرییەی لە ڕۆمانی ژیانی نوێدا کەسایەتی «ڕفقی خەت» نوێنەرایەتی دەکات، لە قەڵای سپیدا «خواجا» و خەیاڵپڵاوە زانستییەکانی دەبێتە نیشاندەرەوەی، لە «ناوم سوورە»دا، پارە پەرستێکی وەک «زەریفە فەندی» و «زاوا» یان شیفتەدڵێکی وەک «زەیتون» سەرەتاکانی ئاشکرادەکەن. لێرەشدا کەسایەتییەکی شیزۆفرینی وەک سۆنای یان فاشییەکی وەک دەمیرکۆڵ دەبنە هەڵگری خەونەکانی. پامۆک لە کەسایەتی سۆنایدا جەوهەری مۆدێرنەی تورکیمان بۆ بەیاندەکات، وەک مۆدێرنەیەک کە لە واقعدا بوونی نییە، مۆدێرنە هیچ

نییە جگە لە شانۆگەرییەکی خوێناوی. بەڕێکەوت نییە بەشێکی گرنگی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە لەسەر شانۆ ڕوودەدەن. سۆنا کاراکتەرێکە ناتوانێت لە نێوان ژیان و شانۆدا جیاوازیبکات، هەتا مردنی ڕاستەقینەی خۆی دەباتەسەر شانۆ و بە زیندوویی پەخشیدەکات. پامۆک لەڕێگای سۆنایەوە پێماندەڵێت «مۆدێرنەی تورکی لە نمایشێک زیاتر نییە کە تێکەڵاو بە ژیان نەبووە» بۆئەوەی تێکەڵاویش بێت دەبێت خەڵکێک هەبن لە شانۆکەوە گوللەی ڕاستەقینە بتەقێننە خەڵک. دیمەنی ئەو ڕەشەکوژی و قەسابخانەیەی لە کاتی نمایشی شانۆی «سەرپۆش یان نیشتیمان» دا ڕوودەدات، یەکێکە لە سەرەکیترین دیمەنەکانی ڕۆمانەکە. ئەو دیمەنە بە واتای دڵڕەقی دەوڵەت و دەسەڵات نییە بەتەنها، وەک لە ژمارەیەکی زۆر ڕانان و خوێندنەوەدا بۆ ڕۆمانەکە، نوسەرانی ئەڵەمان ڕاڤەیدەکەن. ئەو دیمەنە و دوا دیمەنیش کە تێیدا بڕیاردەبێت «قەدیفە» لەچک فڕێبدات، هەر دووکیان نیشانەی ئەوەن کە مۆدێرنیستەکانی تورکیا ناتوانن شانۆ و ژیان، وەهەم و ڕاستی لەیەکتر جیابکەنەوە. ئەو شانۆگەرییەی مۆدرنیزمی تورکی لە فۆرمە فاشی و ئەتاتورکییەکەیدا پیادەیانکردوە، هەرگیز دانەبەزیوەتە ناو ژیانی ڕاستەقینە. ئەوەی تورکیا حیجابی فڕێدابێت هەمیشە شانۆگەرییەکی بێتام و خوێناوی بووە کە پێشتر تێکستەکەی نوسراوە و بەزۆر ئەکتەرەکانی ڕاپێچی نمایشەکە کراون، وەک ئەو تێکستانەی کە لە ڕۆژنامەی شاری سەرحەد دا پێشوەخت دەنوسرێن و دواتر دەبنە ڕاست. بەلام بەو دیویشدا فانەتیکەکانی سەلەفییەت لەگەڵ ئیمانی کوێرانە و توندڕەوییە خوێنینەکەیاندا، جگە لە دونیایەکی سەتحی و ڕیاکار هیچی دییان نییە. ئەو شانۆنامە خوێناوییەی عەلمانییەکانی تورکیا سەپاندوویانە، دیوی ئەودیوی ڕۆحانییەتێکی پاکی دینی نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەودیویشی هەر ڕیاکاری و هوقەبازییە. شینە کە وەک

تیرۆریستێکی بە ناوبانگ ناوی ڕۆیشتووە و یەکێکە لە ڕەمزەکانی جیهاد، دەست لەوە ناپارێزێت کە لەیەککاتدا لەگەڵ دوو خوشکدا پەیوەندی سێکسی ببەستێت، ئیپەک درۆدەکات کە دەڵێت گەر باوکم لە ماڵ بێت لەگەڵ هیچ پیاوێکدا ناخەوم، قەدیفە سەرتۆپی کچانی حیجاب بەسەر پەیوەندی حەرام و ئیرەیی جنسی بۆ خوشکەکەی هەیە، فازیل لەگەڵ کوشتنی برادەرەکەیدا تەماح لە دەستگیرانەکەی دەکات. هەتا «کا» کە دەیەوێت ڕۆحی خۆی بپارێزێت، بەردەوام لە ڕێگای شیعرەوە ئەو دوورییە ئەفسانەییە لە نێوان خۆی و شتەکاندا دروستدەکات، ناتوانێت نەبێت بە بەشێک لەگەمەکە. سەرەتا وادەردەکەوێت وەک ئەوەی بیەوێت تێبگات، بەڵام لە ناو یارییەکان و هێزەکاندا ونەبێت، دەبێت بە بەشێک لە یارییەکی زۆر لەو گەورەتر، هەوڵی ئەوەی ڕۆڵی ناوبژیوان ببینێت دەیکات بە بەشدارێکی ڕاستەوخۆ لە شەڕەکەدا. پامۆک لە ڕێگای ئەم ڕۆمانەوە پێماندەڵێت : مرۆڤ لە تورکیای ئەمڕۆدا ناتوانێت پاک بێت. ئا لێرەدا ڕەمزییەتی بەفر وەک ناونیشان و وەک کاراکتەرێکی سەرەکی ڕۆمانەکە دێتەپێشێ. بەدیوێکدا بەفر هێمای ئەو پاکییە ون و ئەفسانەییە کە کا بۆی دەگەڕێت، بەڵام بەدیوێکی تریشدا بەفر، کە هیچ کەلوویەکی لەوی دی ناچێت، هەر یەکە و ڕیزبەندییەکی کریستاڵی تایبەتی هەیە، هێمایە بۆ فەردانییەت. کا دەیەوێت وەک کەلووە بەفرە ناوازەکان خۆی بێت، بەڵام ئەستەمە بتوانێت خۆی بێت، هەر لایە و دەیخەنە خانەیەکەوە، مرۆڤی خۆرهەڵاتی ناتوانێت بێئەو خانەخانەکردنە بژی. وەک ئەوەی پامۆک لە چارەنوسی «کا» دا چارەنوسی خۆی و چارەنوسی هەموو نوسەرێکی خۆرهەڵاتی و هەموو کەلوو بەفرێکی ئەم دەڤەرە بنوسێتەوە. لەوەش بترازێت بەفر ئامازەیە بۆ ئەو ئابلۆقە ئاسنینەی تورکیا تیادەژی، ئەو پەرژینە ئاسنینەی کە ئەم وڵاتە لە ڕێگایەوە دەیەوێت مێژوو و حەقیقەتی خۆی لەدەرەوە بشارێتەوە. بەفر

ئەو پەردەیەیە کە دەدرێت بەسەر ئەو ململانێ خوێناوییەدا کە تورکیا تیادەژی. لەم ڕۆمانەدا پامۆک بە گشتی باس لەوە دەکات کە سیاسەت چەند مرۆڤ بەدبەختدەکات، هێندەش پیشەی خەڵکانی بەدبەختە. خۆی لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت «بەدبەختی هۆیەکی گونجاوە بۆ ئەوەی لە ڕووی سیاسییەوە ئەکتیف بیت، سیاسەتکردن بە تورەیی و بوغزەوە، زۆربەی جار «نەک هەردەم» ئیشی خەڵکانی ناشادە. ناشادی هێزیان دەداتێ. من هەردەم سیاسەتم لە تورکیا بەوجۆرە بینیوە». «کا» لە فرانکفۆرتەوە دەگەڕێتەوەو بۆ بەختەوەری دەگەڕێت، بەلام دەبینێت کە خەڵکانی ناشاد چۆن لە ڕێگای سیاسەتەوە هێندەی تر بەدبەخت و ناشادبوون، لێرەوە سەفەرەکەی ئەویش هەر لە نەهامەتی و گوناهدا کۆتاییدێت. پاڵەوانە فانەتیکەکانی پامۆک هەموو دەیانەوێت ببن بە ئەفسانە، شینەی ئیسلامی و سۆنای سکولار و هونەر دۆست هەردووکیان دەیانەوێت ببن بە ئەفسانە و لەو نێوەندەدا ژیانی ئاسایی و بەختەوەری هەموو ئەوانی دەوروبەریان وێراندەکەن، بەفر بە دیوێکی تردا گەڕانەوەیە بۆ سادەگی و دەستبەرداربوون لە خواستی بوون بە قارەمان و ئەفسانەبوون.

پامۆک دەڵێت «بەبڕوای من، ئەدەب بەنرخترین شتێکە مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە خۆی دروستیکردبێت». لەوەشدا تا ئەندازەیەکی زۆر ڕاستی پێکاوە. شاعیرییەتی پامۆک زۆر قووڵتر و وردتر لە هێزی شیکار و تێڕوانینی فەیلەسوفان و بیریارانی خۆرهەلات دەڕوات، ئەو دەرگایانەی پامۆک دەیانخاتەسەر پشت، دەرگاگەلێکن بە کلیلی ئەدەب نەبێت هیچ کلیلێکی دیکەی دونیا نایانکاتەوە. ئەدەبی پامۆک بەڕوویەکدا دەروازەیەکی گرنگە بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ و بەڕوویەکی تریشدا دەروازەیەکی گرنگە بۆ تێگەیشتن لە خۆرهەلات.

دونیا نوسەری گەورەی زۆر تێدایە، بەڵام بۆ ئێمەی کورد و خۆرهەڵاتی خوێندنەوەی پامۆک نرخێکی بێهاوتای هەیە، نە لەبەرئەوەی پامۆک ئەو دەرگایەمان بۆ دەکاتەوە کە لە ڕێگایەوە باشتر دەتوانین تورکیا ببینین، بەڵکو لە بەرئەوەی ئەو دەرگایەشمان بۆ دەکاتەوە کە دەتوانین باشتر خۆمان ببینین. پامۆک نوسەرێکی تورک نییە، بەڵکو وێنەگرێکی وردی ڕۆحی خۆرهەڵاتە... هەموو خۆرهەڵات.

## سەرچاوەکان

سوودم لەم چاپانەی ڕۆمانەکانی پامۆک وەرگرتووە:

PAMUK, ORHAN: Das neue Leben. Fischer Verlag, Frankfurt 2000

PAMUK, ORHAN: Die weiße Festung. Suhrkamp Verlag, Frankfurt 1995

PAMUK, ORHAN: Rot ist mein Name. Fischer Verlag, Frankfurt 2004

PAMUK, ORHAN: Schnee. Carl Hanser Verlag, München 2005

هەروەهـا لـە ئەدەبیاتـی تـردا، سـوودم لـەو وتـار و چاوپێکەتنانـەش بینیـوە:

ژمـارە ٥ سـاڵی ٢٠٠١ ڕۆژنامـەی دی تزایـت، وتارێکـی «Hans-Peter Kunisch» بـە ناونیشـانی:

Die Morde der Maler und die schöne Seküre. Der türkische Schriftsteller Orhan Pamuk erzählt von der Auseinandersetzung zwischen Orient und Okziden

وتارێکـی «Ingo Bierschwale» لـە ژمـارەی ١٢ ی ئۆکتۆبـەر ٢٠٠٦ ی گۆڤـاری شـتێرن بـە ناونیشـانی :

Orhan Pamuk. Autor zwischen Orient und Okzident

وتارێکی ڕۆژنامەی «NZZ»، ژمارەی ڕۆژی ٢٤ ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥ بە ناونیشانی :

Der weite Blick über den Bosporus

Eine Begegnung mit dem türkischen Autor Orhan Pamuk

چاوپێکەوتنی Jörg Lau لەگەڵ پامۆک لە ژمارەی ١٦ی ساڵی ٢٠٠٥ ی ڕۆژنامەی دی تزایت بە ناونیشانی:

Achte auf die Details des Lebens

وتارێکی وەرگێڕی کارەکانی پامۆک« Ingrid Iren» لە «فرانکفۆرتەر ئەلگەماینە تزایتونگ FAZ» ژمارەی ٣ ی نۆڤەمبەری ١٩٩٨ بە ناونیشانی:

Wenn einer hielte und führte mich zum Ararat

وتارێکی «Dilek Zaptcioglu» لە ڕۆژنامەی « تاگس تزایتونگ TAZ» ژمارەی ١٨.١١.٢٠٠٦ بە ناونیشانی :

Der Reichtum eines Untergehers

هەروەها دەقی وتەکەی پامۆک لە کاتی وەرگرتنی نۆبڵدا، بەو شێوەیەی کە لە NOBELSTIFTUNG وە لە ٧ی دیسەمبەری ٢٠٠٦ دا بڵاوکرایەوە و بە ناونیشانی جانتاکەی باوکمەوە Der Koffer meines Vaters بوو.

بۆ بۆچوونەکانی سارتەریش دەربارەی ڕۆمانی پۆلیسی بڕوانە لاپەڕە ٢٢ ی ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە :

Simone de Beauvoir. Aus Gesprächen mit Jean - Paul Sartre. Rowohlt. Hamburg. 1996

# لە نەفرەتەوە بۆ بێباکی

## «دەربارەی ماناکانی ڕەتکردنەوە لە هونەردا»

یەکێـک لـەو شـتانەی لـە بینینـی شـانۆگەریدا سـەرنجم ڕادەکێشـێت چەپڵـەی کۆتاییـە. هەرجارێـک بچـم بۆ بینینـی شـانۆگەرییەک زۆر چاوەڕێـی ئـەو چەپڵەیـە دەکـەم، زۆر سـەرنج ڕاکێشـە، عاجباتییەکەشـی لەوەدایـە کـە بـەردەوام دووبارەدەبێتـەوە، قـەت نەچـووم بـۆ شـانۆگەرییەک خەڵـک لـە کۆتاییـدا چەپڵـە لـێ نـەدەن، هـەر وەختێـک بچـم بـۆ هـەر شـانۆگەرییەک لـە دڵـەوە تەمەنادەکـەم تووشـی ڕووداوێکـی شـانۆیی ببـم، شـۆکێکی کولتـووری، هوشـیارییەکی جیـاواز و خەڵـک چەپڵـە لـێ نـەدەن. لـە دەمێکـەوە کـە بەیاننامـەی فوتوریسـتەکانم خوێندۆتـەوە تـا ئەمـڕۆ، حەزمکـردوە جارێـک شـانۆگەرییەک ببینـم وەک نمایشـەکانی مارینێتـی و فوتوریسـتەکان بـە پێڵاو هاویشـتن، دەنگەدەنـگ و هـاوار هـاوار تـەواو بێـت. لەگەڵ ئەوەشـدا ئەوە زۆر بـە دەگمـەن ڕوودەدات، مـن تـا ئێسـتا نەمبینیـوە، هاوڕێکانیشـم نەیانبینیـوە. واهەسـتدەکەم ماوەیەکـی درێـژە توانـای مرۆڤـەکان لەسـەر ڕەتکردنـەوە بەرەو لاوازی ڕۆیشـتووە، یاخـود قاڵبێکـی زۆر دیاریکـراوی وەرگرتـووە... مرۆڤـی مۆدێرن، بوونەوەرێکە توانای شـۆک و سەرسـامی و ڕەخنە و تووڕەیی کزبووە. ئـەوەی مـن لەبەرابـەر ئـەو چەپڵەیـەدا نیگەرانـدەکات، خـودی چەپڵەکـە نییـە، هەمـوو هونەرمەندێکـی ڕەسـەن شایسـتەی ئـەو چەپڵەیەیـە، بـەڵام

ئەوەی جێگای نیگەرانییە مردوویی و بێبایەخی و ساردی چەپڵەکەیە... چەپڵەیەکە هەموو کەس ئەمڕۆ وەریدەگرێت، تەعبیر لە هیچ شتێک ناکات، دوور و نزیک تەعبیر نییە لە هەستێک یان هەڵسەنگاندنێکی تایبەتی، بۆتە بەشێک لە شانۆگەرییەکە. ساتی چەپڵە ئەو ساتەیە کە تێیدا سەنگی تەمسیلکردن لە ئەکتەرەکانەوە دەگوازرێتەوە بۆ بینەران، تا ئەو ساتەی کە چەپڵەی کۆتایی دەست پێدەکات، نمایش بەدەستی ئەکتەرەکانەوەیە، لەو ساتەدا کە ئێمەی بینەران هەڵدەستین و چەپڵە لێدەدەین ئێمە دەبین بە نمایشکار، بە ئەکتەر، بەڵام ئەکتەرێک کە هەمیشە یەک ڕۆڵمان هەیە، یەک چاوەڕوانیمان لێدەکردێت. ئەو چەپڵانە لە بەرامبەر هەموو کارێکی ئەدەبی و هونەریی، لە باشترینەوە تا خراپترین، بەردەوام دووبارەدەبێتەوە و بۆتە مردووترین بەشی نمایشەکان، لەبەر ئەوەی چاوەڕوانکراوترین بەشێتی، ئەو بەشەیەتی کە هەمیشە دووبارەدەبێتەوە، ڕوونادات بەبێ ئەو چەپڵەیە بێینەدەرێ. ئەوانەشی کە ئەمڕۆ چەپڵە لێنادەن، وریا و زیرەکەکان نین، بەڵکو زۆربەیان ئەوانەن کە بەر لە نمایشەکە بڕیاریانداوە چەپڵە لێ نەدەن، بەشی هەر زۆری ئەوانەی چەپڵە لێدەدەن یان لێی نادەن پێش بینینی نمایشەکە بڕیاریانداوە کە چی دەکەن. لێرەوە ئەو چەپڵانە نیشانەی هیچ نین، بەڵگە نین لەسەر زەوق یان تێگەیشتن یان چێژ، بەڵکو ئەو ڕیتوال «×قس»ـە ڕۆتینییەیە کە ئەمڕۆ بە کولتووری هونەرییەوە گرێدراوە. ئەو چەپڵانە هێندەی تەعبیرن لەوەی کە لە هۆڵەکەدا بینەرانێک هەن، خەڵکانێک هەبوون کە تەماشایاندەکرد، تەعبیر نین لەوەی لە هۆڵەکەدا نمایشێک هەبووە.

نەفرەت و ڕەتکردنەوە بەشێکی گرنگی مێژووی هونەرن، گرنگی ئەم دوو دیاردەیە ناگەڕێتەوە بۆ بایەخی هونەرییان، لە ڕێگای ئەوانەوە ناتوانین کاری باش و خراپ بناسینەوە، بە پێچەوانەوە، ڕەتکردنەوە

کەم و زۆر پەیوەندی بە چاک و خراپی کاری هونەرییەوە نییە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ کاراکتەری گشتی سەردەمێک. قەبووڵ و ڕەتکردنەوە پەیوەندییەکی جەوهەرییان بە خودی کاری هونەریی و ئەدەبییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندییان بە ڕۆحی ئەو سەردەمەوە هەیە کە کاری هونەریی و ئەدەبی تێدا ئەنجامدەدرێت.

ڕەتکردنەوە گرنگە بۆئەوەی بزانین لە چ سەردەمێکدا دەژین، بۆ ئەوەی بزانین خوێنەران و بینەران بەراستی تێکست یان نمایش یان تابلۆکەی ئێمەیان بینیوە یان بیستوە. وەک چۆن قەبووڵ نیشانەی بەشێکە لە ڕۆح و ڕۆشنبیریی سەردەم، ڕەتکردنەوەش نیشانەی دیوێکی تری ڕۆحی سەردەمە، بەڵگەیە لەسەر جۆرە تێڕوانین و جیهانبینییەکی تایبەتی... ئەو سەردەمەی کە تەنیا چەپڵە لێدەدات، یاخود هەموو شتەکان بەجۆرێکی کاڵوکرچ ڕەتدەکاتەوە، یاخود قەبووڵ و ڕەتکردنەوەکانی تەنیا بە پێوەری سیاسییانەیە، سەردەمێکی مردووە، سەردەمێکە ڕێگا و چاوی خۆی نەدۆزیوەتەوە بۆ نزیکبوونەوە لە هونەر. ڕەتکردنەوە هەمیشە گرنگە، هەندێجار بۆ ئەوەی لە زیرەکی سەردەمێک تێبگەین، هەندێجاریش بۆئەوەی لە گەمژەیی سەردەمێک تێبگەین. ڕەتکردنەوە، هاوار، قیران بە ڕووی داهێنەردا کارێکی باش نییە، بەڵام گرنگە بۆئەوەی لە ڕۆحی بەدی سەردەمەکان تێبگەین. هەموو سەردەمێک ڕۆحێکی بەدی هەیە کە ئەگەر بیشارێتەوە، واتە نیازێکی لەوە بەدتریشی لە ژێرسەردایە، شتێکی لەبابەت بێباکی، زەیف، ڕیاکاریی.

ئەمڕۆ لە مێژە پێمانخستۆتە سەردەمی بێباکییەوە دەرهەق بە هونەر... سەردەمی ئەمڕۆ کەمتر دەیەوێت لە ڕێگای ڕەتکردنەوەوە هونەر بکوژێت، بە پێچەوانەوە بە فەرامۆشی یان بێباکی یان لە ڕێگای قەبووڵی ڕیاکارانەوە دەیکوژێت.

پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ هونەر و ئەدەبی نوێ کەمتر دونیا تووشی

شـۆکدەکەن، کەمتـر وەک جـاران شـتێک دەهێنـن ڕای گشـتی و زەوقـی خەڵـک نەیگرێـت، یاخـود لـە ڕاسـتیدا ئێمـە لەسـەردەمێکدا دەژیـن هیـچ شتێکی سـەیر نەمـاوە، مـرۆڤ لـەوە دەرچووە بـە هیـچ سەرسام بێت، هیچ شـتێک نەمـاوە وەهـا بیوروژێنێـت بیخاتـە هـاوار هـاوار. تەنیـا خەڵکانێـک کـە ئەمـڕۆ زۆر تووشـی شـۆک دەبـن و دەکەونـە سـەنگەری ڕەتکردنـەوەی توندەوە دینـدارە ئسـوڵییەکانن، تەنیـا ئەوانـن کـە کاری ئەدەبی و هونەریـی تورەیانـدەکات. بـەڵام ڕەتکردنـەوەی ئـەوان شـتێکمان لەسـەر جێگا و شـوێن و تێگەیشـتنی هونـەر بـە گشـتی بـۆ ڕوونناکاتـەوە. ئـەوان لـە قووڵاییـدا هـەر هونـەر ڕەتناکەنـەوە، بەڵکـو هەمـوو ژیانـی مۆدێـرن ڕەتدەکەنـەوە.

لێـرەدا سـێ نمونـە لەسـەر قەبـووڵ نەکـردن و مانـا سـەرەتاییەکانی دەهێنمـەوە.

## ١

سـاڵی ١٨٨٧ پـاول گـۆگان لەگـەڵ شـارلز لاڤالـی هاوڕێیـدا بەسـوار کەشتییەک بـەرەو پەنەمـا بەڕێکەوتـن. گۆگان ئـەوکات کۆنـە فەرمانبەرێکـی بانـک بـوو کـە وازی لـە هەمـوو شـتێک هێنابـوو بـۆ نیگارکێشـان، ئـەو دەم کـە بـەرەو پەنەمـا و دواتـر بـەرەو مارتینیـک بـەڕێ کـەوت، گۆگان بـەدوای سـەرزەمینێکی تـردا دەگـەڕا، دوای گەلێـک دوودڵـی و پشـکنین، ئـەو سـەر زەمینـە خەیاڵییـەی لـە تاهیتـی دۆزییـەوە. گـۆگان بـۆ نیگارکێشـان تەنیـا وازی لـە بانـک نەهێنـا، بەڵکـو وازی لـە کـۆی شـێوازی ژیانـی خۆرئاواییـش هێنـا، شـێوەی بینیـن و چـاوی ئەورووپیانـەی خۆشـی خسـتە لاوە و کەوتـە گـەڕان بـەدوای جـۆرە بینینێکـی تـردا. لە کۆمەڵێک سـەفەر و گەشتی جیاواز جیـاوازدا گـۆگان بـووە کـوڕی کاریبیـک، لەوێـوە ڕەنگێکـی تـری بەخشـی بـە شـتەکان و بـە چاوێکـی تـرەوە هاتـەوە بـۆ پاریـس. ڕاسـتە گـۆگان لـە سـەرەتاوە لای گروپێکـی بچـوک نوسـەران و هونەرمەنـدان قەبووڵکـرا، بـەڵام

لای عەوامی جەماوەریی هونەر، لای ئەکادیمیستەکان، لای هەموو ئەوانەی بۆچوونێکی چەقبەستوویان لەسەر نیگارکێشان هەبوو، بەجۆرێکی بەربلاو ڕەتکرایەوە. درەختی شین، سەگی زەرد، مرۆڤی سەوز شتگەلێک نەبوون لەو سەردەمەدا چاوی خەڵک پێی ڕاهاتبێت. ڕەنگەکانی گۆگان ئەو ڕەنگە واقیعییانە نەبوون کە چاوی ئەورووپی جیهانی پێدەبینی، فۆرمی مرۆڤەکان لای ئەو بەرەو ئەبستراکتبوون دەجولاند، فیگەرەکان بە جۆرێکی بەرچاو بەرەو سادەبوونەوە دەچوون، ئەمڕۆ دەگووترێت ئەو ڕۆحەی دواتر ماتیس نیگاری پێکێشاوە، ڕیشەکانی تەواو لە گۆگانەوە هاتووە، لای گۆگان وردەکاریی کلاسیکی تەواو لە ژێر فڵچەکەیدا دەمرێت و جۆرە ڕەنگرێژییەکی نوێ و گەمەیەکی تازەی ڕوناکی و تاریکی، تیشک و سێبەر لەدایکدەبێت. گەرچی گۆگان عاشقی سروشت و ژیانی ئازادی دوور لە شارستانییەت بوو، بەڵام لە تابلۆکانی ئەودا هەموو شتەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەو لە هونەردا دوژمنێکی سەرسەختی ناتورالیزم بووە... کە گۆگان لەساڵی ١٩٩٣ دا لە پێشانگایەکی گەورەدا تابلۆکانی خۆی پیشاندا، مایەی پێکەنین و لاقرتێ و گاڵتەجاڕی بوو... خودی ئەو قەبووڵ نەکردنە، ئەو جۆرە ڕەتکردنەوەیە، نیشانەی زەوقێکی گشتی و جۆرە تێگەیشتنێکی مردوبوو بۆ هونەر، هەر شتێک لە پێودانە کلاسیکییەکان دەرچوویایە بەر نەفرەتی عەوام و ئەکادیمیستییەکان دەکەوت «ئەکادیمیسیتییەکان زۆربەی کات نوێنەری تێگەیشتن و زەوقی عەوامن لە دونیای هونەر و ئەدەبیاتدا». ئەم نەفرەت و ڕەتکارییە گرنگ بوو بۆئەوەی بزانین گۆگان بۆ جیاوازە، بۆ شتێکی کردوە پێشتر نەکراوە، چۆن وەزیفە و مانای فۆرم و ڕەنگی لە هونەری نیگارکێشان و شێوەکاردا بە گشتی گۆڕی. ڕەتکردنەوەی گۆگان نیشانەی ئەوەبوو لەسەردەم و کولتوورێکدا دەژی دەتوانێت جیاوازی لە نێوان ڕۆحی عەوام و خەیاڵی داهێنەردا بکات... جیاوازییەک کە ئێستا بە هۆی

چەندەها کاریگەرەوە وردە وردە بەرەو مردن و نەمان دەڕوات. ئەوجۆرە ڕەتکردنەوەیەی گۆگان، زیاتر خزمەت بە بینین و تێگەیشتن لە هونەر دەکات، شتێکی زۆرترمان دەربارەی سۆسۆلۆگیای هونەر پێدەڵێت، زۆرجار لەو چەپڵە هەمیشەییە باشترە کە بە مردوویی لێدەدرێت و لێدەدرێت و بێوچان لێدەدرێت... چەپڵەیەک کە نیشانەی مردنی خوێنەر و بینەرە، نەوەک نیشانەی تێگەیشتن و خۆشەویستی بێت بۆ هونەر.

## ٢

کەم کەس دەزانن کە ستاندالی ڕۆماننوس، خاوەنی ڕۆمانی «سوور و ڕەش» «داهێنەری قارەمانێکی وەک ژۆلیان سوریل کە لە یادەوری ئەدەبی مرۆڤایەتیدا تا ئەمڕۆ ماوەتەوە»، کتێبێکی لەسەر ڕۆسینی مۆسیقار هەیە، کە هەر بە ناوی ڕۆسینییەوە بڵاوکراوەتەوە. ئەو دەم تاکە کەسێک لە ئەوروپادا لە ڕۆسینی ناودارتر بووبێت، ناپلیۆن بۆناپارت بوو. ئەوەی لێرەدا بۆ من گرنگە بەشێکی کتێبەکەیە کە باس لە دزەکردنی کاریگەریی مۆزارت دەکات بۆ سەر مۆسیقای ئیتالی. مۆزارت وەک ئەمڕۆ ئێمە تێیدەگەین بە ئاسانی بە هەموو دونیادا بڵاونەبۆتەوە. وەک ستاندال دەڵێت «مۆزارت لەو هونەرمەندە گەورانەبوو کە تەنیا ئەوەی بەلاوە گرنگ بوو، بە دڵی خۆی و کەسانی هاوشێوەی خۆی بێت»، دواکەوتنی ئارەزوو و خواستی عەوام لە هونەردا ترسناکە، لە مۆسیقادا لە بەشەکانی تر ترسناکتریشە. ستاندال دەربارەی حاڵی مۆزارت لە ئیتالیای ئەو دەمدا دەنوسێت «لە کاتی ژەنینی کارەکانیدا، خۆی بە شەخسی لەوێ نەبوو تا لەبەردەم قودرەتدارانەدا دەملوسی بکات، لەوێ نەبوو تا پارە بداتە ڕۆژنامەنوسان لەسەری بنوسن و ناوی بخەنە نێو ناوانەوە، لەبەرئەوە تا نەمرد ناوبانگی لە ئەوروپا زۆر پەرەی نەسەند. دوژمنەکانی لە هەموو شوێنێک بوون، ئەوانەی بەپێی دەنگی

ئـەم گۆرانیبێــژ یــان ئەویتــر مۆســیقای خۆیــان دادەنــا، ئەوانــەی دوێتــی بێنرخیـان بـۆ عەشیقەی ئـەم ئەمیـر یـان ئەویتـر دەنوسـی. ئەوانـە هەمـوو پشـت و پەنـا و کۆمەکێکیـان دەسـتدەکەوت. بـەڵام ئەمـڕۆ دەبێـت مۆسـیقای مایـەر ـ کـە مۆزیسـێنێکی نـاوداری ئـەو دەمـی ئیتالیـا بـوو ـ یـان ئـاوازی ئـەم کۆمپۆنیسـت یاخـود ئەویدیـان بەرابـەر ئۆپرایەکـی مـۆزارت چـی بێـت و چ نرخێکـی هەبێـت؟ کەچـی لەدەوروبـەری سـاڵی ١٨٠٠ لـە ئیتالیـا دۆخەکـە تـەواو پێچەوانەبـوو، مـۆزارت وەک بەربەرییەکـی ڕۆمانتیـک سـەیردەکرا، کـە خـۆی بـۆ ئـەوە دەڕەنجێنێـت، جـێ پێیـەک لـە دونیـای هونـەرە جوانەکانـدا بکاتــەوە ...».

سروشـتی مۆسـیقای مـۆزارت شـتێکی دیکەبـوو، وەک سـتاندال دەڵێـت «مۆسـیقایەک نەبـوو، بـە بیسـتن و گوێگرتنـی سـادە فێرببیـت» ... مۆسـیقایەکی ئاڵۆزتـر و پـڕ ئۆتەتـر و قورسـتر بـوو، تەپـۆ و تەمەڵـەکان، ئەوانـەی نەیاندەتوانـی تێیبگـەن و بیژەنـن « ناویاندەنـا بەربەرییـەت. هێنـدی نەمابـوو ئـەم قسـانەش کاری خۆیـان بکـەن و کاریگاتـە ئـەوەی تـەواو دەسـت لـە مـۆزارت هەڵگـرن».

لای ئێمـە ئەمـڕۆ سـەیرە نـاوی مـۆزارت و بەربەرییـەت بخرێنـە پـاڵ یـەک... بـەڵام بـۆ سـەردەمێک کـە مـۆزارت خـۆی لـە ژیانـدا بـوو و داهێنانـی دەکـرد ئاسـایی بـوو. لـەو سـەردەمەدا گەورەبوونـی نـاوی هونەرمەنـدە بچوکـەکان و ڕەتکردنـەوەی مـۆزارت بـە شـێک بـوون لـە ڕۆحـی سـەردەم. ڕەتکردنـەوەی مـۆزارت گرنـگ بـوو، تـا دوای مردنـی لـە چـاو ئـەو سـەدان کۆمپۆنیسـتە ناودارەی ئـەو دەمـی ئەوروپـادا بلیمەتییەکـەی زیاتـر و زیاتـر دەربکەوێـت. ئـەو ڕەتکردنەوەیـە گرنگـە بۆئـەوەی سـەردەمەکانی مێـژووی هونـەر و قۆناغەکانـی گەشـەی ئـارەزووی مۆسـیقی مـرۆڤ تێبگەیـن... دۆخێـک کـە لـەم سـەردەمەدا ئاسـان نییـە و لـە ژێـر مەترسـی گەورەشـدایە.

## ٣

گالیمار یەکێکە لە ناودارترین بنکەکانی چاپ و پەخش لە ئەورووپادا. سەرەتاکانی دامەزراندنی ئەم بنکەیە تا ئەمڕۆ هاوشانی هەڵە و ئابڕوچوونێکی ئەدەبیی گەورە یە. لەساڵی ١٩١٢ دا مارسیل پرۆست، بەرگی یەکەمی ڕۆمانی «گەڕان بەدوای کاتە بزربووەکان» دا دەنێرێت بۆ گالیمار... دەستنوسەکەی لەلایەن چاودێران و بەرپرسانی بنکەکەوە ڕەتدەکرێتەوە و قەبووڵ ناکرێت. گالیمار تەنیا بنکەی بڵاوکردنەوەی فەرەنسی نییە کە ئەم شاکارە ڕەتدەکاتەوە، کتێبەکە لەلایەن هەموو بنکەکانی چاپ و پەخشەوە ڕەتدەکرێتەوە و پرۆست بە ناچاری لەسەر ئەرکی خۆی چاپیدەکات. یەکێک لە ناشیرەکان لەسەر دەستنوسەکە ئەم ڕستانە دەنوسێت. «من تێناگەم، چۆن کەسێک پێویستی بە سی لاپەڕە هەیە، تا ئەوەمان بۆ وەسفبکات، بەر لەخەوتن چۆن لە ناو جێگادا ئەمدەیوە و دیو دەکات». هەڵبەت دوای چوار ساڵ لەو هەڵەیە گالیمار فریاکەوت و پرۆستی خستە ناو لیستی نوسەرانی خۆیەوە و ساڵی ١٩١٩ خەڵاتی گۆنکۆری پێ وەرگرت.

گەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو سەردەمە و سەرنجی شێوازەکانی نوسین پێش مارسیل پرۆست بدەین، تێدەگەین بۆچی سەختبووە، پرۆست قەبووڵبکرێت. ئەوەی بەراوردی شێوازەکانی نوسین لای بەلزاک، فیکتۆر هۆگۆ، ستاندال، ئەمیل زۆلا لەگەڵ پرۆستدا بکات، جیاوازییە گەورەکە دەبینێت. ئەو زمانەی نوسەرانی پێش پرۆست وەسفی جیهانی دەرەوەی پێدەکەن، واقیعی پێدەناسێنن، کاراکتەرەکانی پێ نیگاردەکەن، زمانێکە تەواو جیاواز لە زمانی پرۆست. کە زمانێکە لە یادەوەریدا ئیشدەکات، لە سەر پاشماوەی کاریگەرییە جێماوەکانی سەر دەرون، لەسەر ئەو سەرنجانەی شتەکان لە یادگاردا جێیدەهێڵن. زمانی پرۆست زمانی

وەسفکردن و گێڕانەوەی شتە واقیعییەکان نییە. بەڵکو زمانی وەسفکردنی ئەو کاریگەرییانەیە کە شتەکان لەسەر هەست، ئیدراک، هوشیاریی مرۆڤ جێیدەهێڵن. جیاوازی نێوان پرۆست و فیکتۆر هۆگۆ لە ڕۆماندا، وەک جیاوازی نێوان مایکل ئەنجیلۆ و کلۆد مۆنێیە وەهایە لە نیگار کێشاندا. پرۆست دەیویست بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەوەی «ئیمپرێشینیستەکان ـ ئینتیاعییەکان» لە شێوەکاردا کردیان لە ڕۆماندا بیکات... ئەم بازە لەوە گەورەتر بوو بێ ڕەتکردنەوەی گەورە بڕوات. ڕەتکردنەوەی پرۆست نیشانەی ئەو دابڕانە کتوپڕ و قووڵەیە کە لە ناکاو دەکەوێتە نێوان دوو سەردەمەوە. واتە لە بنەڕەتدا ڕەتکردنەوەی زەوقێکی بنج بەستوە بۆ فۆرمێکی نوێ، ناحاڵیبوونی جۆرێکە لە هونەر لە جۆرەکانی دی... ئەم هەستە لە هەموو سەردەمێکدا هەیە، بەڵام من وادەبینم کە ڕۆژگاری ئێمە قووڵتر و تاریکتر دەیشارێتەوە، ناوی تری لێدەنێت و بەجۆری دیکە ئاشکرایدەکات.

ڕەتکردنەوە هەمیشە کاریگەرییەکی نەگەتیڤی لە سەر ڕۆحییەت و ژیانی داهێنەران هەیە، بەڵام بەشێکی گرنگی هەموو مێژوویەکی ڕاستەقینەی هونەرە. بەبێ تێگەیشتن لە دیالەکتیکی قەبووڵ و ڕەتکردنەوە، ئەستەمە هیچ شتێک لەسەر سۆسیۆلۆگیای هونەر و ئەدەبیات تێبگەین. ڕەتکردنەوە کارێکی ئازایانە نییە، بەڵام نیشانەی ئەوەیە کە سەردەمێک ڕۆحێکی دیاریکراو زاڵە بەسەریدا، مۆراڵێکی تایبەتی دەبیات بەڕێوە. ئەوەی لە ڕەتکردنەوەدا گرنگە ئەوەیە ڕێگامان دەدات ئاسانتر و خێراتر و ڕوونتر بچینەوە سەر ڕۆحی سەردەمەکان، سەر ئارەزوویان، سەر ئەو بڕوا و قەناعەتانەی لەسەری کرکەوتوون. سەردەمی ئەمڕۆی ئێمە خۆی وا پیشاندەدات، کە هەموو شتێک قەبووڵدەکات، ئامێز بۆ هەموو جیاوازییەک دەکاتەوە، لە پشت ئەو قەبووڵە درۆزنەشەوە، ژەهرێکی کوشندەتر لە ژەهری سەردەمانی

پێشوو هەیە کە من ناوی دەنێم ژەهری بێباکی... ژەهری دەروەست نەبوونی ئەم ڕۆژگارە بۆ ئەو شتانەی داهێنەران دەیشکێنن.

# کارلۆس رویس زافۆن و گەمەی فریشتە

گومـان لـەوەدا نییـە کـە زافـۆن ئێسـتا یەکێکـە لـە نـاوە گرنگەکانـی ئەدەبیـات و بـازاڕی ڕۆمانـی ئەوروپـی. کتێبـی پێشـووی «سـێبەری بـا» یەکێک بـوو لـە کتێبـە پڕفرۆشـەکانی ئەوروپـا کـە لـە پتـر لـە ٢٠ وڵاتـدا لـە سـەرووی لیسـتی پڕفرۆشـترین کتێبـەوە بـوو. ڕۆمانـی یەکەمـی زافـۆن بـە ناونیشـانی «میـری تـەم» ئـەو سـەرەتایە بـوو کـە زافۆنـی بـە خوێنەرانـی ئیسپانی ناسـاند، بـەڵام ناوبانگـی جیهانـی زافـۆن لەگـەڵ ڕۆمانـی «سـێبەری بـا» دا دەسـتی پێکـرد. بـەش بەحاڵـی خـۆم تەنیـا ڕۆمانـی سـێبەری بـا و دوا ڕۆمانـی «گەمــەی فریشــتە» م خوێندۆتــەوە، کــە دوو گرنگتریــن کاری زافۆنـن. دیـارە زافـۆن جگـە لـە میـری تـەم هەندێک ڕۆمانـی دیکەی نوسـیوە، وەک ڕۆمانـی «کۆشـکی نیوەشـەو» و «پاسـەوانی تاریـک»، کـە تەنیـا دوای بڵاوبونـەوەی سـێبەری بـا و گەمـەی فریشـتە وەگێڕدرانـە سـەر زمانەکانـی دی. دەتوانیـن زافـۆن لـە ڕیـزی نوسـەرانی شـار پۆلێنبکەیـن، واتـە ئـەو نوسـەرانەی کە مێژوو و جوگرافیای شـار و یادەوەری تاریکی نیشـتەجێکانی، پاڵەوانـی سـەرەکی ڕۆمانەکانـن. بەرشـلۆنە لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـت و سـاڵانی پێـش و دوای جەنگـی ناوخـۆی ئیسـپانیدا شـانۆی هـەردوو ڕۆمانـە گەورەکـەی زافۆنـە. لێـرەدا مەبەسـتم پێشکەشکردنی ناسـینێکی سـەرەتایی کتێبـی گەمـەی فریشـتەیە بـە خوێنـەران کـە لەساڵی ٢٠٠٨ دا بـە ئیسـپانی بڵاوکرایـەوە و هـەر هەمـان ساڵیش وەرگێڕانـە ئەڵمانییەکەی کەوتـە بازاڕەوە.

بەبڕوای من گەمەی فریشتە تائەمڕۆ هەمان سەرکەوتن و ستایشی ڕۆمانی سێبەری بای بەدەست نەهێناوە، لەبەر ئەوەی ئەم ڕۆمانەی دوایی زافۆن جگە لەوەی گەڕانەوەیەک بوو بۆ هەمان فەزای پێشوو، کۆمەڵێک گرفتی تەکنیکی گەورەشی تێدایە کە بۆ من وەک خوێنەری ڕۆمان، دەشێت کوشندە بکەونەوە. ئەوەی لە هەردوو ڕۆمانەکەدا بەلامەوە زۆر جوانە، هەڵبژاردنی زافۆنە بۆ کتێب وەک کەرەستەیەکی سیحراوی و پڕ نهێنی بۆ بیناکردنی هەردوو چیرۆکەکە. ئەو ڕستەیەی کە دەڵێت « کتێبەکان ڕۆحیان هەیە» پێکهێن و داڕێژەرەی هەردوو تێکستەکەن، بە چەشنێک دەتوانین بڵێین کە هەردوو ڕۆمانەکە لە دەوری کتێب و کتێب نوسین و چیرۆکی کتێب دەسوڕێنەوە، پاڵەوانەکانیشی لە هەردوو ڕۆمانەکەدا نوسەر و عاشقی ئەدەبیاتن. زافۆن لە هەردوو ڕۆمانەکەدا هەوڵی خولقاندنی جیهانێکی پڕ نهێنی دەدات کە شانۆی ڕوداوەکانی کوچە و کۆشک و شەقامەکانی بەرشلۆنەیە، کە خەڵکانێک تێیدا بەسەردەبەن وەک زافۆن دەڵێت تەنیا لە چاوەڕوانی تاریکیدا دەژین. ڕۆمانی «گەمەی فریشتە» چیرۆکی نوسەرێکی گەنجە، بە ناوی داڤید مارتینەوە، کوڕێک کە لە منداڵییەوە حەزی لە خوێندنەوەیە و باوکیشی بە پێچەوانەوە پیاوێکی زۆر سادەی تێکشکاوە و دوژمنی کتێبیشە. باوکی داڤید لە ڕوداوێکدا بە هەڵە تیادەچێت، کاتێک بکوژانی لەگەڵ پیدرۆ فیدالدا لێیاندەگۆڕێت، کە ڕۆژنامەنوس و دانەری کۆمەڵێک ڕۆمانی پۆلیسییە. دوای کوژرانی باوکی، فیدال کە بەرابەر داڤیدی مێردمندال هەست بە گوناه دەکات و لە ڕۆژنامەیەکی بچوکدا کارێکی بۆ دەدۆزێتەوە، ڕۆمانەکە لەو جێگایەوە دەست پێدەکات کە داڤید دەچێتە لای دۆن بازیلیۆ مۆراگاسی سەرنوسەر تا بۆ یەکەمجار خۆی وەک نوسەر بناسێنێت. دۆن بازیلیۆ ئەو چانسە دەبەخشێتە داڤید کە چیرۆکێکی بخوێنێتەوە و گەر بەباشی زانی و سێبەری توانا و بەهرەی تێدا بینی،

بڵاویبکاتــەوە. داڤیــد چیرۆکێــک بــە ناونیشــانی شــاری نەفرەتلێکــراوان دەنوسـێت و ئـەو چیرۆکـە دەرگای جیهانێکـی تاریـک و پڕنهێنـی لێدەکاتـەوە، شـاری نەفرەتلێکراوان لـە ناونیشـانی چیرۆکێکەوە دەگۆڕێـت بـۆ سـەفەرێکی دووروودرێــژ بــە نــاو شــارێکی پــڕ نەفــرەت و نهێنــی و تاریکیــدا، بــە نــاو ڕابوردوویەکـی تاریـک و ئێسـتایەکی نادیـار و داهاتوویەکـی ڕەشـدا کـە زاڤـۆن وەک هێمـا بـۆ فـەزای بـەر لەسـەر هەڵدانـی جەنگـە خوێناوییەکانـی ئەورووپـا نیگاریــدەکات. دوای بڵاوبوونــەوەی چیرۆکەکــەی، تێکســتکە ســەرنجی ژمارەیـەک لـە خوێنـەران ڕادەکێشـێت و دوای ماوەیـەک داڤیـد داوەتێکـی بـۆ دێـت، بـۆ جێگایەکـی نهێنـی، شـوێنێک کـە لـە ڕابـوردوودا سـووتاوە و وەک چۆڵەوانــی و وێرانــە لــە دەرەوە دەردەکەوێــت. لەوێــدا «داڤیــد» بــە «کلـۆویێ» یەکێـک لـە پاڵەوانـە ژنەکانـی نـاو چیرۆکێـک لـە چیرۆکەکانـی خـۆی دەگات و لـە ژوورێکـدا کـە هەمـان سـیفەت و شـێوازی ژووری نـاو چیرۆکەکــەی خــۆی هەیــە، لەگــەڵ ئــەو خانمــەدا دەخەوێــت. دوای ئــەو سێکســکردنە لەگــەڵ کلۆوێــدا، داڤیــد لــەو ژوورەدا خــەوی لێدەکەوێــت و کاتێــک بەئاگادێتــەوە، نامەیــەک دەدۆزێتــەوە لــە «ئەندریــاس کۆرێلــی» یـەوە هاتـووە، کـە بەپێـی ئەدرێسـی سـەرنامەکە دەبێـت خاوەنـی بنکەیەکـی بڵاوکردنـەوە بێـت لـە پاریـس. کۆرێلـی کـە پێدەچێـت ڕێکخـەری ئـەو شـەوە پـڕ نهێنییـەی پێشـووش بێـت، بـۆ داڤیـد دەنوسـێت کـە «ژیان لـە چاوەڕوانی گـەورە دروسـتبووە، هـەر کات تـۆ ویسـتت چاوەڕوانییەکانـت بکەیتـە ڕاسـت، پەیوەندیـم پێوەبکـە، مـن چاوەڕوانتدەکـەم». چاوەڕوانـی گـەورە یاخـود هیـوای گـەورە ئـەوە ناونیشـانی ئـەو ڕۆمانـە ناسـراوەی دیکنزیشـە، کـە داڤیـد لـە منداڵییـەوە حـەزی لێیەتـی. ئەندریـاس کۆرێلـی کێیـە؟. ئەمـە پرسـیارێکە تـا کۆتایـی بـە نادیـاری دەمێنێتـەوە، ئایـا کۆرێلـی تارماییـە یـان مرۆڤێکـی ڕاسـتەقینە، سـیحربازە یـان کەسـێکی پـڕ توانـا و قودرەتـی خەیاڵییـە، ڕۆمانەکـە بـە ڕوونـی وەڵامـی ئـەم پرسـیارە ناداتـەوە، شـەیتانە و لەبەرگـی

مرۆڤێکدا بەرجەستەبووە یاخود خودی خودا خۆیەتی؟ گەر بگەڕێینەوە بۆ سێبەر و نیگاری ئەو فریشتەیەی کۆرێلی نامەکانی خۆی پێ نیشانەدەکات، دەتوانین بڵێین کۆرێلی لای زافۆن ڕەمزێکە بۆ ئەو تارماییە ڕەشە، ئەو ڕۆحە فەنتازی و خەیاڵاوییەی لەسەرەتاکانی سەدەی بیستدا باڵی بەسەر جیهاندا کێشاوە، ڕۆحێک کەدەست لە هەموو شتێک وەردەدات و دەیەوێت مرۆڤەکان پڕبکات لە سۆزی هەڵە و عاتیفەی بەجۆش بۆ شتگەلێک کە تەنیا بە دەستکرد و لە ڕێگای خەیاڵەوە لەسەری مرۆڤەکاندا چێنراون. کۆرێلی یەکێکە لەو شەیتانە زۆرانەی مۆدێرنەی ئەورووپی کە لە بەرگی فریشتەدا خۆی وێنادەکات، پەیامبەری ئەو دینە تازانەن کە بێڕەحمی و ئامانجپەرستی و کرێنی ویژدانیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە.بەڵام زافۆن دواجار کۆرێلیمان وەک کاراکتەری ناو ڕۆمانێک پێشکەشدەکات، ماهییەتی بە نادیاری و شوناسی ڕاستەقینەی هەمیشە لە تەمدا دەمێنێتەوە. هەتا لە کۆتایشدا، لەدوا دیمەنی ڕۆمانەکەدا کە زافۆن وەک مەخلوقێک وێنایدەکات کە لە دەرەوەی کات و بە هەمیشەیی دەژی، تەواو سروشتی ڕاستەقینەی کۆرێلی ڕووناکاتەوە، بەڵام هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە کۆرێلی هەڵگری ڕەهەندێکی ئەو جیهانبینییە سەیر و خواستە شەیتانیانەیە کە لەسەرەتاکانی سەدەی پێشوودا جیهانیان پڕکردوە. کۆرێلی بڕوایەکی گەورەی بە تواناکانی داڤید هەیە، بەڵام لە هەمانکاتدا خواستێکی سەیریشی هەیە، لە خولیای ئەوەدایە پەیمانێکی گەورە و نهێنی لەگەڵ داڤیددا مۆربکات. مرۆڤ ناتوانێت لێرەدا لێکچوونێکی گەورە لە نێوان فاوەست و ئەم ڕۆمانەدا فەرامۆشبکات، داڤید دەبێت توانا و بەهرە و ئیمانی خۆی بە کۆرێلی بفرۆشێت، بەرابەریشی پارە و تێربوونی ئارەزوو و حەزەکانی وەربگرێت. ئەندریاس کۆرێلیێ بەرلەوەی داوای وەها پەیمانێک لە داڤید بکات، داڤید لە ناکاو تووشی نەخۆشییەکی نادیاردەبێت و پزیشکەکان ماوەیەکی

کەمی بۆ ژیان دەدەنێ. کۆرێلی لەو کاتەدا کە داڤید تەواو نائومێدە و دەستی لە ژیان شتووە دەردەکەوێتەوە و ئەو پێشنیارەی دەخاتە بەر دەست گەر لەگەڵیدا بچێتە پەیمانەوە، نەوەک ژیانی پێدەبەخشێتەوە، بەڵکو زەنگین و شادومانیشی دەکات. خواستی کۆرێلی ئەوەیە کە داڤید دینێکی نوێی بۆ دروستبکات، دینێک وا لە مرۆڤەکان بکات خۆیانی بۆ بدەن بە کوشت و حەماسەتێکی وەهایان بخاتە بەر بتوانن هەموو بەربەستێکی بۆ ببڕن و هەموو کۆسپێکی بۆ بشکێنن، وەک کۆرێلی دەڵێت مەبەستی ئەوەیە شتێک بە تینووەکان ببەخشێت بیخۆنەوە . داڤید سەرەتا ڕایوایە کۆرێلی بە هەڵەدا چووە، چونکە لە ڕاستیدا داڤید هیچ شتێک لە دین نازانێت، بەڵام کۆرێلی وادەبینێت کە دین لە جەوهەریدا حیکایەتە، ئەوەشی کە دەبێت دین دابمەزرێنێت، دەبێت چیرۆکنوس یان حیکایەتخوان بێت نەوەک تیۆلۆگ. کۆرێلی وادەبینێت ئەوەی بایەخ بە دین دەبەخشێت فۆرمە نەوەک ناوەڕۆک، ناوەڕۆک هەمیشە یەک شتە و دووبارەدەبێتەوە، هێز و کاریگەرییش هەردەم لە فۆرمدایە، کۆرێلی داوای تێکستێک دەکات ڕۆح لە خەو هەستێنێت، سۆز و عاتیفەی مرۆڤەکان بخرۆشێنێت، بەڕای ئەو مرۆڤەکان لە ڕێگای عەقڵەوە، بەبێ کۆمەکی هونەر و خولقاندنی شتێکی دەستکرد ناتوانن بگەنە ئیمان. داڤید دەبێت بەهرەی خۆی بەڕێگایەکدا بەرێت کە نایەوێت، بەرابەر بەوەش ژیان و پارە وەدستدەخات. داڤید کە لە نزیکبوونەوەی مردن دەترسێت، هیچ ڕێگایەک شک نابات ئەوە نەبێت پێشنیارەکەی ئەم پیاوە تاریک و نەناسراو و تارمایی ئاسایە قەبووڵبکات. لەو نێوەدا داڤید دەگوازێتەوە بۆ ماڵێک کە بە خانووی بورجەکە ناسراوە و لە مێژە چۆڵە و کەس ناوێرێت بچێتە ناوی، چونکە وەک ماڵێکی ترسناک و نەفرەت لێکراو تەماشادەکرێت، جگە لەوەی هەستێکی عاتیفی تاریکیشی بەرابەر کریستینا هەیە کە کیژێکی گەنجە و لای پێدرۆ فیدال کاردەکات.

دوای ڕێکەوتنی داڤید لەگەڵ کۆرێلیدا، هەستدەکات هەموو ئەو کەسانەی کە بەجۆرێک لە جۆرەکان دەشێت لەبەردەم داڤید بوەستن یاخود دەتوانن زانیارییەکی گرنگی بدەنێ دەکوژرێن. خودی ئەم بیرۆکەیە دەکرا بیرۆکەیەکی جوان بێت گەر زافۆن زیادە ڕەوی تێدانەکردایە، بەجۆرێک زۆرجار کوشتنەکان بێ هۆ و بێ بەهانە و ناماقوڵ و زیاد لە پێویست دەکەونەوە، ئەم دووبارەبوونەوانەی وێنەی کوشتن، لە هەندێک جێگادا ڕۆمانەکەی لە تێکستێکی جیدییەوە گۆڕیوە بۆ ڕۆمانێک کە پێدەچێت بۆ سیناریۆسازانی هۆلیۆد نوسرابێت. لەو نێوەندەدا پیدرۆ فیدال سەرقاڵی ڕۆمانێکە کە هەرگیز ناتوانێت تەواویبکات، کریستینا کە وەک کۆمەککار و سکرتێری فیدال کاردەکات، ڕۆژێک لە دەرگای ماڵی داڤید مارتین دەدات و داوای ئەوەی لێدەکات کە کۆمەکیبکات، کریستینا و داڤید ڕێدەکەون پێکەوە تێکستەکەی فیدال بنوسنەوە و بەجۆرێک چاکیبکەن ببێت بە ڕۆمانێکی ڕاستەقینە، لە هەمان کاتیشدا داڤید سەرقاڵی نوسینی ڕۆمانێکی تازەیە بۆ خۆی کە بەپێی ئەو داواکاریانە دەینوسێت کە بنکەی پەخش و بڵاوکردنەوەکە داوایدەکات. کریستینا و داڤید لەو ماوەیەدا زۆر لە یەکدی نزیکدەبنەوە، بێئەوەی ڕاشکاوانە خۆشەویستی ڕابگەێنن، پەیوەندییەکی بەهێز و نهێنی لە نێوانیاندا دروستدەبێت. کە ڕۆمانەکەی فیدال و داڤید مارتین پێکەوە بڵاودەکرێنەوە، کتێبەکەی فیدال «کە هەر داڤید نوسیویەتی» سەرکەوتنێکی گەورە بەدەستدەهێنێت و کتێبەکەی داڤید خۆی، کە بە ناوی «هەنگاوەکانی ئاسمان»ـە دەکەوێتە بەر تانەوتوانجێکی زۆر. لەم خاڵەدا ڕۆمانی گەمەی فریشتەکانی زافۆن پردێکی گەورە لەگەڵ ڕۆمانی سێبەری بادا دروستدەکاتەوە کاتێک دووبارە داڤید وەک دانیال «پاڵەوانی سەرەکی سێبەری با» ڕێی دەکەوێتە شوێنێکی سەیر و سەرنجڕاکێش کە بە «گۆڕستانی کتێبە لەیادکراوەکان» ناودەبرێت، زافۆن خۆی لە

چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت بیرۆکەی ئەم گۆڕستانەی لە دیتنی کتێبخانەیەکی تاریکەوە بۆ هاتووە کە پڕە لە کتێبی دێرین و میوانانی کتێبخانە لەبەر ڕۆشنایی لایت و چرای دەستیدا دەبێت بۆ کتێب بگەڕێن. گۆڕستانی کتێبە لەیادکراوەکان شوێنێکە کە نوسخەی ئەو کتێبە کۆن و لە یادچووانەی تێدا هەڵگیراوە کە نەماون یاخود لە بیرچوونەتەوە یان بەهەر هۆیەکەوە بێت قەدەغەکراون و لە خوێنەر شاردراونەتەوە، هەموو ئەو کتێبانە کە نوێنەری یادەوەرییە ڕەمزی و تاریکەکەی بەرشلۆنەن، لەوێدا بۆ هەتاهەتایە پارێزراون. تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم خەڵک بە گۆڕستانی کتێبە لەیادکراوەکان دەزانن، هەر کەسێکیش کە دەچێتە ئەوێ، یەکەمین ڕستە کە دەیبیستێت ئەوەیە، «ئەوەی لێرەدا دەیبینێت، نابێت هەرگیز بیگێڕیتەوە» یە. پاسەوانێکی پیر کە ناوی ئیسحاقە کتێبخانەکە دەپارێزێت، هەر کەسێک کە دەچێتە ئەو جێگایە دەتوانێت لە کتێبخانەکەدا بگەڕێت و کتێبێک هەڵبژێرێت و بیباتەدەرێ، بەڵام دەبێت بە گیان و دڵ ئەو کتێبە بپارێزێت، لە سێبەری بادا تەواوی ڕۆمانەکە لەدەوری ئەو هەوڵە دەسوڕێتەوە کە کەسێکی نەناسراو، پیاوێک بە دەموچاوێکەوە لە دەمامکی چەرمین بۆ لەناوبردنی کتێبێک دەیدات بە ناوی سێبەری باوە. لە گەمەی فریشتەدا داڤید، بە یارمەتی سەمبەرە کە خاوەن کتێبخانەیەکی پیرە دەچێتە گۆڕستانی کتێبە لەیادکراوەکان، دواتر لەوێ دانەیەک لە ڕۆمانەکەی خۆی «هەنگاوەکانی ئاسمان» دەشارێتەوە و دەستنوسێک دەهێنێتە دەرێ، بە ناونیشانی لوکس ئیتێرنا کە ناوی نوسەرەکەی تەنیا بە «د.م» دەستنیشانکراوە، هەمان پیتە سەرەتاییەکانی ناوی داڤید مارتین خۆی. کتێبەکە بە پێنج زمانی جیاواز نوسراوە، ئیسپانی، لاتینی، ئەڵمانی، فەرەنسی، عیبری. داڤید بە هۆی هەندێک سیفەت و خەوشی چاپەوە سەرنجی ئەوەدەدات کە دەستنوسەکە بە هەمان ئەو ماشێنی چاپە چاپکراوە کە لەماڵەکەی خۆیدا هەیە و

پێدەچێت لە سەر هەمان مێزیش تایپکرابێت. دوای ماوەیەک لەوە داڤید ئەوە دەدۆزێتەوە کە چەندین ساڵ لەوەوبەر، بەر لەوەی ئەم ماڵە چۆڵبکرێت و کەس ڕووی تێنەکات، کەسێکی دی، یاخود نوسەرێکی دی بە ناوی دیگۆ مالاسکاوە لەم ماڵەدا ژیاوە، پیاوێک کە لە ناکاو ژنەکەی و ئیشەکەشی جێهێشتووە و لەم خانووەدا خەریکی نوسینی تێکستێکێک بووە بۆ خاوەن بنکەیەکی چاپ و پەخشی نەناسراو. لێرەوە هەستدەکەین کە داڤید و دیگۆ مالاسکا دیلی ناو هەمان بازنەن، هەردووکیان بەدەوری هەمان خاڵی نادیاردا سوڕاونەتەوە، مالاسکا دواتر لە ڕوداوێکی نادیاردا تیادەچێت، بەڵام دۆزینەوەی چیرۆکی مالاسکا و چارەنوسی دەبێتە خولیای داڤید. داڤید ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر هەستدەکات کەوتۆتە ناو دونیایەکی ئاڵۆز و پڕ تەلیسم و گرێوە کە تێگەیشتن لە چیرۆکەکانی گەلێک ئەستەم دەردەکەون. لەو ماوەیەدا پێدرۆ فیدال، کریستینا دەخوازێت و ئەویش ڕەزامەندی خۆی نیشاندەدات شووی پێبکات، بەڵام کریستینا گەلێک لە شووەکەی بەدبەختە و دڵی لای داڤیدە. زافۆن لێرەدا چیرۆکی عەشقێکی تەقلیدیمان پێشکەشدەکات کە ناگاتە ئەو خۆشەویستییە گەورەیەی لە ڕۆمانی سێبەری بادا خوێندمانەوە، لە سێبەری بادا چیرۆکی خۆشەویستی و بەخیلی و ئیرەیی لەسەرەتاوە تاکۆتایی بزوێنی هەموو ڕوداوەکانە، بەڵام لێرەدا عەشقی کریستینا و داڤید، جگە لە هەندێک دیمەنی کورت گەلێک زیاد و بەزۆردانراو دەردەکەوێت. گەلێک شت لە چیرۆکی کریستینادا بە تاریکی دەمێنێتەوە. بۆ شوو بە فیدال دەکات، بۆ لەدەستی هەڵدێت، بۆ ئەو ڕۆژەی بڕیارە لەگەڵ داڤیددا هەڵبێن و شارەکە جێبهێڵن وندەبێت، بۆ شێت دەبێت و دواتریش خودکوژی دەکات؟. زافۆن لە پشت چیرۆکی کریستیناوە دەستی کۆرێلی ئاشکرادەکات، بەڵام هەموو خوێنەرێکی ئاسایش هەستدەکات کە چیرۆکەکە بەجۆرێکی لۆژیکی و قەناعەتساز دانەڕێژراوە. ڕۆمانەکە لە

کۆتاییدا ڕیتمە قووڵەکەی سەرەتای ونەدەکات و دەکەوێتە ناو بازنەیەک کوشتن و ڕەودونان و ڕاکردنەوە کە لە فلیمێکی خراپی نزیکدەکاتەوە. لە کۆتاییدا دوای سەفەرێکی درێژ و پڕ خوێن داڤید ئەوە دەدۆزێتەوە کە دیگۆ مالاسکا نەمردوە و لە ژێر ناوی ڕیکاردۆ سەلڤادۆر «کە کۆمەککارێکی خۆی بووە و مالاسکا کوشتویێتی» دەژی. ڕۆمانەکە بەوە کۆتاییدێت کە داڤید بەرشلۆنە جێدەهێڵێت و پازدە ساڵ ئاوارە لە جێگای جیاجیادا دەژی و لە ژێر شوناسێکی نەناسراو و نامۆدا درێژە بە وێڵگەردی و سەرگەردانی خۆی دەدات تا دواتر دەگەڕێتەوە. ڕۆمانەکە تا ئەندازەیەک لە کۆتاییدا وەک نمونەی ئەو ڕۆمانانەی لێدێت کە بڕێکی زۆر تەلیسم و نهێنی و ئاڵۆزی کەڵەکەدەکەن بێئەوەی بەتەواوی بۆیان چارەسەربکرێت، پێموایە زافۆن لەم ڕووەوە نزیکییەکی لەگەڵ مۆراکامیدا هەیە، ئەویش زۆرجار بڕێکی زۆر ئاڵۆزی لە پێناوی دروستکردنی فەزایەکی سەرنجراکێش و بە مەبەستی خوێنەرکێشی دروستدەکات کە دواتر ناکرێت بەجۆرێکی لۆژیکی چارەسەربکرێن. بەڵام دەبێت بڵێم لای من مۆراکامی لەزەت و سیحرێکی زیاتر دەخاتە ناو تەمتومان و تەلیسمبازی ڕۆمانەکانەوە. زافۆن لە کتێبی سێبەری بادا شاکارنوسە، بەڵام لە گەمەی فریشتەدا ئەو هەناسەیە خاودەبێتەوە. بابەتی ڕۆمانەکە لای من گەلێک قەشەنگە، زمانی زافۆن گەلێک ئاسک و ڕۆشنە، توانای گێڕانەوەی تابڵێی گەورەیە، زافۆن گەلێک ئاسان و هێمن بە زمانێکی شاعیریانە دەنوسێت کە خاڵییە لە زۆر لە خۆکردن. هەوڵی بۆ تێکەڵاوکردنی نیگایەکی مێژوویی و سیاسی بە گرێچنییەکی پۆلیسی لە هەندێک وێستگەدا زۆر سەرکەوتووانەیە، بەڵام بە گشتی ئەوەی زیان لەو گرێچنییە دەدات زیادەڕەویکردنێتی لە دیمەنی کوشتن و خوێنڕێژیدا، گرێچنی ڕۆمانی سێبەری با گەلێک مەحکەم و لۆژیکی و بەهێز بوو، توندوتیژی لە ڕۆمانەکەدا بە بەهانە و لۆژیکی بوو، لە گەمەی فریشتەدا

هەمان چنینی قوولّ بۆ پەیوەندیی «کۆرێلی» و «مالاسکا» و «مارتین» نادۆزینەوە. هەولّی زافۆن بۆ دروستکردنی دونیایەک کە تێیدا زیندوەکان مردوون و مردووەکان زیندوون، ناگاتە ئەو ئاستە قوولّ و کتوپڕ و چاوەڕوانشکێنەی کە لە فلیمە ناوادارەکەی «بروٚس ویلس» «هەستی شەشەم» دا بینیمان. هاتوچۆ لە نێوان ژیان و مردندا قورسترین بابەتێکە ڕۆماننوس پەلاماریبدات، چونکە جگە لە گرفتی گرێچنی، گرفتی لۆژیک و قەناعەت پێهێنان و داڕشتنی درامی و فەلسەفی قوولّی دەوێت. لە سێبەری بادا گەڕانەوەی «کەراکاس» لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا زۆر چنراو و جوانە، بەلاّم لێرەدا لە ناکاو کەسایەتی ڕیکاردۆ سەلڤادۆر و دیگۆ مالاسکا خۆیان ئالّوگۆڕدەکەن، بێئەوەی ڕەگەزی سەرسامی و چنینی مەنتیقی لە گۆڕێ بێت، ئەوە لاوازییەکی گەورەی بەخشیوە بە کۆتایی ڕۆمانەکە. لە دواجاردا هیوادارم ڕۆژێک خوێنەرانی کوردیش سێبەری با و گەمەی فریشتە بە وەرگێڕانێکی جوان بخوێننەوە، چونکە دواجار زافۆن نوسەرێکە شایستەی خوێندنەوەیە.

# شەونمەکەی بەرمۆدا

## «دەربارەی ئەفسونی دووریی»

دووریی یەکێکە لە سەیرترین و سیحراویترین ئەو شتانەی کە لە هەموو سات و سەردەمێکدا مرۆڤ دەبزوێنێت. مرۆڤ بوونەوەرێکە کە داناسەکنێت، لە جێگایەکدا ئۆقرە ناگرێت. رەنگە زۆر لە خوێنەران رستە دێرینەکەی بلیز باسکالیان بیستبێت کە دەڵێت « هەموو بەدبەختییەکانی دونیا لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە کە مرۆڤ ناتوانێت لە ژوورەکەی خۆیدا بمێنێتەوە». دیارە لە نێوان گەڕۆکی مرۆڤ و عاشق بوونیدا بە دووریی جیاوازی هەیە. گەڕۆکی زۆر گرێدراوی خواستی مرۆڤە بۆ بیبینین، بەڵام عەشقی دووریی بزوێنەری خەیاڵە، دەگاتە ئەو جێگایانەی کە بە چاو نایگەێنین، بە بینین پێیناگەین، دووریی ڕاستەقینە لە خەون و مەحاڵەوە نزیکترەوە تا واقیع. لە گەڕان و گەڕۆکیدا مرۆڤ تەنیا لەسەر زەمین و لە ناو ئەو چوارچێوەیەی زەماندا دەمێنێتەوە کە تیا دیلە، بەڵام عەشقی دووری خواستێکی تری لە پشتە، خواستی شکاندنی سنوورەکانی زەمین و زەمان، خواستی ژیانێکی تر، ئارەزووی گەیشتن بەوەی کە تا ئێستا نەبینراوە. واتە کێشەی گەورەی مرۆڤ تەنیا ئەوە نییە کە لە ژوورەکەی خۆیدا نامێنێتەوە، بەڵکو ئەوەشە کە نایەوێت لەسات و سەردەمی خۆشیدا بمێنێتەوە. ئەدەبیات بەوردی

ململانێی نێوان ئەم دوو پۆڵەی دەرخستووە. «ئێستا و لێرە» یان «لە دەرەوەی ئێستا و لە دەرەوەی ئێرە». «لەم سنوورەدا» یان «دوور لەم سنوورە». من بەپێی ئەزموونی ژیانی خۆم، هەمیشە دوو جۆر لە مرۆڤم بینیوە و دوو جۆر لە خەڵکم جیاکردۆتەوە، ئەو مرۆڤانەی کە هەمیشە «لەم سنوورەدا... لە ئێستا و لێرەدا» دەژین، لەگەڵ ئەوانەدا کە دەیانەوێت«لە دەرەوەی ئەم سنوورە و دوور لە ئێستا و ئێرە» بژین. ئەم دوو جۆر مرۆڤە لە زۆر شتی بنەڕەتیدا جیاوازن، هەتا وا هەستدەکەم هەندێک جار جیاوازیان دەگاتە جیاوازیی نێوان شەیتان و فریشتە. من خۆم هەمیشە بە جۆرێکی سەرپەڕانە لە جۆری دووەم بووم، هەر کات بیرم لە «ئێستا و ئێرە» کردبێتەوە، بۆئەوە بووە لە ئێستا و لێرە نەبم. بەڵام بەشی هەرە زۆری مرۆڤەکان عەشقی دووریی لە خۆیاندا دەکوژن، یان لە ڕاستیدا کولتوورێک و چوارچێوەیەکی بینین هەیە دەیکوژێت. چونکە گەر ئەو عەشقە گەورە بێت، گەر شێوەیەکی زۆر سەرپەڕانە وەربگرێت، ئەو توانایە لە مرۆڤدا دەکوژێت، ئاسان سوود لە ئێستا و لە ئێرە وەربگرێت. هەڵبەت هەموو مرۆڤێک ساتی پراگماتیانەی خۆی هەیە کە دەبێت لە ئێستا و لێرەدا کاربکات و بڕیاربدات، بەڵام هەندێک مرۆڤی تر هەن کە «ڕەهەندی عەشقی دووریی» ـان لە ناودا مردوە، هەمیشە لە دووی چنینەوەی بەرهەمی ئەو ئەگەرانەن کە ئێستا و ئێرە پێشکەشیاندەکات. «خاتوو ماکبەس» یەکێکە لە عاشقە ترسناکەکانی «ئێستا و ئێرە» لە ئەدەبیاتدا. ئەو لە شانۆگەرییەکەی شکسپیردا بە گوێی ماکبەسدا دەخوێنێت «خۆت لە ساتە دوورەکاندا وێڵ مەکە، سوود لەم چرکەساتە وەربگرە، ئەمە کاتی تۆیە». خاتوو ماکبەس لەوانەیە کە دەزانێت چۆن بە دڕندانەترین شێوە سوود لە ئێستا و ئێرە وەربگرێت. بەبڕوای من شتێک لە ڕۆحی دڕندەی خاتوو ماکبەس لە زۆربەی سیاسییەکان، بازرگانەکان، ڕۆشنبیرە پراگماتییەکاندا هەیە.

«ئەوە بگرە و بەریمەدە کە ئێستا و ئێرە پێشکەشتدەکات، زۆرترین سوودی لێ ببینە، بۆ دوور مەڕۆ، هەرچییەکت دەوێت لێرەدایە» ئەم لۆژیکە لۆژیکی ئەوانەیە کە تەنیا و تەنیا لە هەناوی ئێرە و ئەمڕۆدا دەژین. لە نوسەرانی دیکەدا فریدریش شیللەر زۆر لەسەر گرنگی و ئەفسونی «ئەم چرکەساتە» قسەیکردوە. لە شانۆگەریی دۆن کارلۆسدا و لەسەر زمانی «مارکیز فۆن پۆسا» وە دەڵێت «مرۆڤ دەبێت ئەو چرکەساتە بەکاربهێنێت، کە تەنیا یەکجار دەردەکەوێت». لە تێکست و شانۆگەرییەکانی شیللەردا گرنگی ئێستا و ئێرە زۆر دووبارە دەبێتەوە. لە ویلهیلم تلدا تێکستێکی هاوشێوەی دیکەش دەبینین، کاتێک رودێنتز بە بێرتا دەڵێت «یان ئێستا یان هەرگیز. دەبێت ئەم چرکەساتە بە نرخە بەکاربهێنم«. لای شیللەر مرۆڤ دەتوانێت چەندین نمونە بهێنێتەوە کە تێیدا پەلاماردانی ئێستا و ئەم شانسە و ئەم ئەگەرەی هەنوکە هاتووە بخوێنێتەوە. بەڵام برێکی زۆر لە فەیلەسوفان، لە شاعیران، لە سیاسییە خەیاڵدارەکان... هەمیشە بۆ جێگایەکی تر دەڕوانن، عاشقی گەڕانن بۆ زەمانێکی تر. ژیان لەلایەن وەک ڕامبۆ دەڵێت «هەمیشە لە شوێنێکی ترە» و هەمیشە لە ساتێکی دیکەدایە. واتە ئەوەی بۆی دەگەڕێن لە ئێستا و ئێرەدا نییە، کەسانێکن سیحری دووری دەیانبزوێنێت، ئەفسونی جێگاکانی تر و سەردەمەکانی تر دەیانخاتە سەر خولیای کار... عەشقی دووریی تەنیا مرۆڤ ناخاتە سەر ڕێگای خەیاڵات، بەڵکو هاندەرێکی گەورەی کارکردنیشە.

لە ساڵی ٢٠٠١ دا فەیلەسوفی ئەڵمانی پێتەر سلۆتەردایک چەند موحازەرەیەکی دەربارەی فەنتازیا و واقیع لە نامیلکەیەکی بچوکدا بڵاوکردەوە، کتێبەکە بە ناونیشانی «شەونمەکەی بەرمۆدا ــ دەربارەی هەندێک لە سیستمەکانی خەیاڵ» ــە. لەوێدا سلۆتەردایک باس لە گرنگی دووریی دەکات وەک بزوێنێکی گرنگ، وەک هێزێکی ڕۆمانسی. بەپێی ئەو

لەسەردەمی گریکی و لە دێرینندا جۆرە سیستمێکی فەنتازیی زاڵبووە کە تێیدا «میتامۆرفۆس ـ وەرگەڕانی توخم یان گۆڕانی چۆنایەتی» بزوێنی فەنتازیاکان بووە، وەک لە گۆڕینی سادە و ئاسانی توخم و ڕەنگ و فۆرمی ئینسان و ئاژەڵاندا دەیبینین، کاتێک دەبینین مرۆڤ ئاسان دەبێت بە درەخت یان باڵندە یاخود ئەژدیها و دەشبێتەوە بە مرۆڤ. بەڵام دواتر لەگەڵ گەشتەکانی کۆلۆمبسدا، وێنەی «شوێن» لە خەیاڵی ئەورووپیدا گۆڕانکارییەکی ڕادیکالی بەسەردا دێت، بۆ یەکەمجار مرۆڤ ئەوە تاقیدەکاتەوە کە لە دەریای گەورەبدات و توانای سەفەری درێژی بۆ دروستدەبێت. لەوێوە ئەفسونی دووری دەبێتە یەکێک لە هەرە ئەفسونە گەورەکان، مرۆڤی ئازا چیتر ئەو مرۆڤە نییە کە هەڵی بەردەمی خۆی دەقۆزێتەوە و پەلاماری ئەگەرەکانی ئێستا دەدات، بەڵکو ئەو کەسەیە کە دەڕوات، کە دەرمانی دوور دەدۆزێتەوە، کە لەسەر زەمینە نەناسراوەکانەوە شتە عاجباتییەکان دەهێنێتەوە.

لەگەڵ داگیرکردنی ئەورووپادا بۆ وڵاتانی دەرەوەی خۆی، «دووریی» بەهایەکی باڵا وەردەگرێت. سلۆتەردایک لەو کتێبەیدا زۆر دەگەڕێتەوە بۆ شکسپیر، لە ڕێگای شکسپیرەوە ڕوونتر دەبینین کە لە سەرەتاکانی جیهانی تازەدا مرۆڤەکان دوور و نزیکییان چۆن نرخاندوە. لە بازرگانی ڤینیسیادا سەروکارمان لەگەڵ دوو بازرگاندایە «ئەنتۆنیۆ» و «شایلۆک». یەکێکیان نوێنەری سەردەمە تازەکانە، بازرگانێکە دەوێرێت هەموو سامانی خۆی بداتە دەست دەریا، بوێرە، سەرکەشە، بەڵام ئەویدیان «شایلۆک» نوێنەری ئێستا و ئێرەیە، نوێنەری قۆزتنەوەی هەل و فورسەتدزییە. شایلۆک بوونەوەرێکی هەلدزە کە ناوێرێت لە سنوورەکانی ئێستا و ئێرە دەرچێت و تەنیا لەوێدا یارییە جەهەنەمییەکانی خۆی دەکات، بەڵام ئەنتۆنیۆی بەرزەفڕ، چاونەترس، دڵنەلەرز شتێکی دیکەیە... لە بازرگانی ڤینیسیادا بەر ململانێی توندی ئەو دوو ڕۆحە دەکەوین کە لە ساتی

شکسپیردا سەرەتای جوڵە و دەرکەوتنی بووە. لەوێوە عەشقی دووری، وەک هێزێکی ڕۆمانسی، وەک خواستی مرۆڤە ئازاکان دەردەکەوێت.

سلۆتەردایک لە ئۆتێلۆوە نمونەیەکی جوان و پەرەگرافێکی زۆر درێژیش وەردەگرێت. لەوێدا ئۆتێلۆ ئەوە باسدەکات، چۆن و لەبەرچی دێزدەمونە عاشقی بووە، ئۆتێلۆ ژیانێکی پڕ سەفەری بووە، پڕ گەشت و جەنجاڵی، پڕ سەرکێشی، خاکی جیاوازی بڕیوە و لە ئاوی جیاوازی داوە، بە سەرزەمینی عاجباتی و جێگای سەیردا تێپەڕیوە، بۆنی ئێستا و ئێرەی لێ نایەت، بەڵکو بۆنی سەرزەمینێکی تر و جێگایەکی دیکەی لێبەرزدەبێتەوە. ئەوەی وا لە دێزدەمونە دەکات عاشقی ئۆتێلۆ بێت، ئەو بۆنە دوورەیە، بۆنی ئازایەتی و سەرکێشی و دەریا. ئۆتێلۆ خۆی بە ڕوونی دەڵێت ئەوەی وای لە دێزدەمونە کرد منی خۆشبوێت ئەو مەترسیانەیە کە من پیا تێپەڕیووم، ئەوەشی وای لە من کرد خۆشمبوێت، کاریگەری چیرۆکەکانم بوو لەسەر ئەو.

بە کورتی ئەفسوونی دووریی وادەکات هەم ئۆتێلۆ و هەم ئەنتۆنیۆ دوو کاراکتەری جوان و ڕۆمانسی بن. هەردووکیان ئامادەن بۆ ئەو ڕۆحە تازەیەی دووری دەپەرستێت و پێویستی بەوەیە لە دەریا بدات و لەسەر زەمینە دوورەکانەوە شتێکی نوێ بهێنێتەوە، شتگەلێکی تر تاقیبکاتەوە کە لە ئێستا و ئێرەدا نین. لەو سەردەمانەدا شتی دوور وەک دەرمان و کەرەستەی سیحری لێدێت. ئارەزووی دووریی وادەکات، هەر شتێک لە دوورەوە بێت فاکتەری کەرەستەی ئەفسوناوی وەربگرێت. لە شانۆگەریی «گەرداو» ـی شکسپیردا لە گفتوگۆیەکی نێوان «پرۆسپێرۆ» و «ئاریل» دا ڕاگوزەر بەر گوزارەی «شەونمی بەرمۆدا» دەکەوین. تێدەگەین کە پرۆسپێرۆی سیحرباز، جارێک ئارێلی ناردوە تا شەونمی بەرمۆدای بۆکۆبکاتەوە، ئەو شلە ئەفسووناوییەی کە ئەو لە سیحرەکانیدا بەکاریدەهێنێت. سلۆتەردایک بە هەق دەپرسێت: بەلام بۆ شەونمی

بەرمۆدا؟ ئەمجۆرە شەونمە بۆ لە خەیاڵی ئەو دەمدا بەنرخ بووە، بۆ لە زێڕ بەنرختر و لە سەرمایە کاریگەرتر بووە؟ بۆ شەونمی «بیت لحم» نەبێت کە جێگایەکی پیرۆز بووە؟ بۆ شەونمی ڕۆما نەبێت؟ ئەی چی شەونمی بەرمۆدا لە شەونمی ئۆکسفۆرد جیادەکاتەوە؟.

وەک سلۆتەردایک دەڵێت شەونمی بەرمۆدا، ئەو شلەیەیە کە سەرکێشی و خەون لە یەک یەکەدا کۆدەکاتەوە. مرۆڤ ناکرێت شلەی سیحراوی لە حەوشی ماڵەکەی خۆیدا کۆبکاتەوە، دەبێت لە جێگایەکی دوورەوە بێت، دەبێت لەسەرزەمینێکی عاسییەوە، لە خاکێکی ترسناکەوە بگاتە دەستی. ئەو کاتیش بەرمۆدا بۆ دەریاوانان ترسناکترین جێگابووە. شەونمی بەرمۆدا هەم ئاماژەیە بۆ ئەفسوونی دووریی، بۆ خەونی جێهێشتنی جیهانی کۆن، بۆ پەڕینەوە بەرەو دونیایەکی تر، بۆ سەرکەوتن بەسەر ئازاری ئێستا و ئێرەدا. «دەبێت لێرەدا ئاماژە بەوەبکەم، کە سەیری دوو وەرگێڕانی عەرەبی گەرداوی شکسپیرم کرد، لە هەر دوو وەرگێڕانەکەدا ئەو گفتوگۆیەی نێوان ئارێل و پرۆسپێرۆ بە هەڵە کراوەتە عەرەبی، چونکە هیچ یەک لە دوو وەرگێڕەکە لە دەلالەتی گوزارەی شەونمی بەرمۆدا لای شکسپیر تێنەگەیشتوون»

بە کورتی «شەونمەکەی بەرمۆدا» ئەو شتەیە کە لە دوور بۆی دەگەڕێین بۆ ئەوەی کۆمەکمان پێبکات لێرەدا نەخنکێین، لە شوێن و لە زەماندا بجوڵێین، ئەو هێزە سیحراوییەی ژیانە کە لە ئێستا و ئێرەدا دەستمان ناکەوێت و دەبێت لە جێگای تر و سەردەمی تردا بۆی بگەڕێین.

لەوەوبەر من لە وتارێکی زۆر درێژدا لەسەر کۆچ و لە وتارێکی کورتتردا بە ناونیشانی «گەر نەتەوێت غەریبێک بیت وەک نالی»، ڕەخنەی توندم لە پەیوەندی نێوان مرۆڤی کورد و شوێن گرت. پەیوەندی مرۆڤی کورد بە دوورییەوە هەمیشە لەسەر ترس بونیادنراوە، مێژووی

ئێمە پتر خاتوو ماکبەس و شایلۆکەکان دروستیانکردوە، نەوەک کەسانی وەک ئۆتێلۆ و ئەنتۆنیۆ و ئارێل... کەسانی هەلدز و فرسەتخواز، نەوەک رۆحی بڵندگەرا و خەوبین و کارکەر بە دینەمۆی فەنتازیا و ئومێدی نەترسانە. ئەم رۆحی عەشقە دوورییە لە حیکایەتە فۆلکلۆری و لاوک و بەندەکاندا زۆرتر زیندووبووە تا ئەمڕۆ، برێکی زۆر لە رۆمانسییەتی قارەمان لە چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەفەرە دوورانەی پاڵەوان لەسەر زەمینی تردا دەیانکات و لەوێوە گوڵی سیحراوی و دەرمانی کاریگەر و هەتوانی تیمارکەر دەهێنێتەوە. بەڵام لەگەڵ هاتنی مۆدێرنە و زاڵبوونی عەقڵییەتی ناسیونالیستیدا عەشقی دووریی دەمرێت و قەتیسبوون لە ژووری خۆماندا دەبێتە تەنیا شوێنی ژیان، بەجۆرێک کورد لەوسەری زەمینیش هەمیشە هەر لە ژوورەکەی خۆیدایە و لەبری ئەوەی بۆ «شەونمەکەی بەرمۆدا» بگەڕێت، «فرمێسکی حەسرەت» بۆ ماڵەوە دەڕێژێت. ئەوەتا دەبینین کە نالی و حاجی قادری کۆییش لە دوورەوە تەنیا و تەنیا وەسفی نیشتیمان دەکەن، سەیرە کە دەبینین نالی لە چامەکەیدا بە دێرێک باسی ئەو دونیایە ناکات کە بۆی چووە و تەنیا باسی ئەو دونیایە دەکات کە لێی رۆیشتووە. لای حاجیش هەر هەمان ئاواز دەبیستین، شێرکۆش لە مەنفای دوورودرێژیدا هەمان نەغمەی هەیە... لێرەدا هەقمانە بپرسین: دونیاکانی تر لە کوێن؟. چی وایکردوە رەهەندی عاشقبوون بە دووریی لە کولتووری کوردیدا تەواو ونببێت... شوێنەکانی تر و جیهانەکانی تر و رەهەندەکانی دیکەی شوێن و کات چوون بۆ کوێ و بۆ مردون؟ بۆ کەسمان نییە کە شەونمەکەی بەرمۆدامان بۆ کۆبکاتەوە؟. وەڵامەکەم ئەوەیە: باڵادەستی گوتاری مانەوە لەم کولتوورەدا، کە گوتارێکی تەواو ناسیونالیستییە، وایکردوە مرۆڤی کورد تەنیا کورت و بێ فەنتازیا و بێخەون لە ئێستا و ئێرەدا بژی. بێئەوەی خەونی ژیانی تر و سەرزەمینی تر و سەفەری بە نێو

کاتدا هەبێت. گووتاری مانەوە، گووتاری ژیان و بەردەوامی و خۆپاراستن و مانەوەیە لە ئێستا و لێرەدا. ئەم گووتارە قووڵ بەسیستمی تێڕوانین و هەستکردن و بیرکردنەوە و ڕەفتاری مرۆڤی کورد و ڕۆشنبیرەکانیدا چۆتەخوارێ.

لای سلۆتەردایکدا بەر تێزێکی گرنگتریش دەکەوین، لای سلۆتەردایک ناسیونالیزم بەرهەمی مەنفا نییە، بەرهەمی دوورکەوتنەوە لە نیشتیمان نییە، بەڵکو ئەو ڕای وایە ناسیونالیزم خواستێک بووە بۆ بەستنەوە و جڵەوکردنی ڕۆحی سەفەر کە لە دوای دۆزینەوەی ئەمریکاوە ئەورووپییەکانی داگرت. واتە خودی ناسیونالیزم بەرهەمی دژایەتی عەشقی دووری بوو، دژایەتی خواستی پەڕینەوە بەرەو کەنارەکانی دیکە و سەفەرکردن بەرەو دونیاکانی دیکە. هەڵبەت ناسیونالیزمی کوردیی لە ڕووی مێژووییەوە ڕیشەی لەو چەشنەی نییە، بەڵام وەک هەموو ناسیونالیزمەکانی دیکە لە پێناوی بەستنەوەی مرۆڤدا بە «ئێستا و ئێرە» وە ئیشیکردوە.

# لە نێوان «هیگڵ» و «کیرکجارد» دا

یەکێک لە ڕەخنە گەورەکانی کیرکجارد لە هیگڵ ئەوەیە کە تەواوی فەلسەفەکەی پلانێکی گەورەیە، نەخشەیەکی یەکسەرەیە کە هەموو شتێک لە ناو سیستەمێکی گەردونی و داخراودا دەبینێت کە تێیدا کۆی دیاردەکان جێگای خۆیان هەیە و لە کاتی خۆیاندا و بەپێی یاسای ئیشکردنی سیستەمەکە دەردەکەون. بەپێی هیگڵ هەر شتێک شێوە و ناواخن، دەرکەوتن وناوابوونی خۆی هەیە، لە سیاقێکی دیاریکراودا دێت و بەپێی کۆمەڵێک یاسای لۆژیکی و دیالەکتیکی لە ناودەچێت.

کیرکجارد ئەم تەفسیرە سەرتاسەری و مەحکەمەی جیهانی پێ قەبووڵ ناکرێت. کیرکجارد فەیلەسوفێکە لەوانەی عەودالی دۆزینەوەی سیستەمێکی ڕێک و پێک و داخرا نییە، سیستەمێک لە نێویدا هەر شتە و لە شوێن و کاتی دیاریکراوی خۆیدا دانرابێت و دەربکەوێت، ئەو فەیلەسوفی بینینی ئەگەرەکان و ناکۆکییەکان و ترس و پێکەنینەکانە، کە پێکڕا نیشانەی نەبوونی بڕوان بە سیستەم. سیستەمی ڕێک و چنراو و مەحکەم هەمیشە مانایەکی ڕۆشن و وەزیفەیەکی دیاریکراو دەبەخشێت بە ڕەگەزەکانی ناوی... سیستەم تەنیا ئەو کاتە دەتوانێت سیستەم بێت کە بکرێت بەپێی لۆژیکی ناوەکی خۆی تەواوی شتەکان لەسەر نەخشەیەکی ئاشکرا پۆلێنبکات. سیستەمی مەحکەم بواری یاری و ئەگەرکاری زۆری تێدا نییە، نابێت ناکۆکی وەهای لە نێودا دەربکەوێت لۆژیک و مانای بخاتە

مەترسییەوە، ترس لە نەمانی مانا و ئەگەری داگەڕان بۆ کۆمیدیا دەبێت بکرێنە دەرەوە و هەموو شتێکیش لە نێو ئەودا دەبێت مەنتیقی و بەپێی ڕێسا و یاسای عەقڵانی تەفسیربکرێت.

کیرکجارد چ وەک مرۆڤ و چ وەک فەیلەسوف کاراکتەرێک نییە لەگەڵ ئەم سیستمە ناوەکییە داخراو و مەحکەمەدا هەڵبکات، چونکە کاتێک وەک مرۆڤ سەیری خۆی دەکات، وەک بوونەوەرێکی پڕ ناکۆکی خۆی دەبینێت و وەک فەیلەسوفیش گومانی لەو سیستمە مەعریفییە گشتی و سەراپاگیرانە هەیە. ئەو فەیلەسوفێکە بەدرێژایی ژیانی لەنێوان بڕیاری جیاواز جیاواز و ئەگەری دوور لەیەک و خواستی دژ بەیەکدا، دوودڵ و بێبڕیار ماوەتەوە. کیرکجارد خۆی لە جێگایەکدا دەنوسێت «من حەزم لە هیچ شتێک نییە، حەزم لەوە نییە بڕۆم، چونکە زۆر لەبەر لەشم گرانە، حەزم لێ نییە پاڵبکەوم، چونکە گەر پاڵبکەوم یان دەبێت زۆر پاڵبکەوم، کە حەزم لێی نییە یان دەبێت زوو هەستم کە حەزم لەوەشیان نییە... بە کورتی: من حەزم لەم شتەش نییە کە نوسیومە، بەڵام حەزم لەوەش نییە بیسڕمەوە». مرۆڤێک بەم هەموو ناکۆکییەوە، سەیر نییە کە دوژمنی گەورەی ئەو سیستمە ئاسنین و مەنتیقییەی هیگڵ بێت.

وێنەی فەیلەسوف لای هیگڵ کەسێکە کە هەموو شتێک بەپێی کۆمەڵێک دەرەنجامگیری سەلمێنراو دەنوسێت، بەڵام کیرکجارد گەیشتن بەم پلەیە بە مەحاڵ دەزانێت. لای هیگڵ ئیشی فەیلەسوفان دۆزینەوەی نهێنی جیهانە، لە سەرەتای دروستبوونییەوە بۆ کۆتایی... دەرککردنە بەو مانا نهێنییەی کە لە پشت هەموو شتێکەوەیە، پەردەلادانە لەسەر ئەو یاسایانەی جوڵە و گۆڕان کە جڵەوی ئەم پرۆسەیە دەکەن. بەڵام لای کیرکجارد هەوڵی دۆزینەوەی ئەم نهێنییە کارێکی بێمانا و نەکردەیە. خۆی گەلێک قەشەنگ چیرۆکێکی بچوکمان بۆ دەگێڕێتەوە دەربارەی

کەسێک کە نامەیەکی لەبەردەستدایە و باوەڕی وایە ئەو نامەیە دەتوانێت ڕۆشنکەر و مانابەخشی بوونی بێت، بەڵام ئەو شێوەنوسینەی نامەکەی پێنوسراوە کاڵ و باریکە و خەتەکەشی باش ناخوێنرێتەوە. لەبەرئەوە خاوەن نامەکە بەترس و دوودڵییەوە جار دوای جار و بە ئارەزوویەکی گەورەوە بۆ دۆزینەوەی ماناکە، نامەکە دەخوێنێتەوە، بەڵام ئەو مانایەی لە خوێندنەوەیەک دەستیدەکەوێت، جیاوازە لەو مانایەی کە لە خوێندنەوەیەکی دیدا دەستیدەکەوێت، گۆڕانی مانای وشەیەک دەشێت مانای هەموو نامەکە بگۆڕێت، لەبەرئەوە هەرگیز ناتوانێت قۆناغی گومان و دوودڵی سەرەتا تێبپەڕێنێت و بگاتە یەقین. ئیدی بەترسەوە هەر وردەبێتەوە و وردەبێتەوە، بەڵام تا زیاتر سەیری نامەکە دەکات کەمتر دەبینێت و حوکمی چاوی کزتر دەبێت، نامەکەش جار دوای جار کاڵتر و کاڵتر دەبێتەوە، کاغەزی نامەکەش تادێت کۆنتر و زەردتر و دڕاوتر دەبێت، تا ڕۆژێک دێت دەوەرێت و ئەوەی دەمێنێتەوە چاوێکی پڕ فرمێسک و بێحوکمە کە نەیتوانیوە بگاتە هیچ مانایەک.

چیرۆکەکەی کیرکجار کە لە جوانیدا شان لە شانی کورتە چیرۆکەکانی کافکا دەدات، نیشانەیەکی گرنگە بۆ ئەو تێڕوانینە کیرکجاردییە دەربارەی بوون... دەربارەی گەیشتن بەو نهێنی و مانایەی هەمووما لە پشت جیهانەوە بۆی دەگەڕێین. لای هیگڵ ئەو تێکستەی کە بوونی پێنوسراوەتەوە، تێکستێکی خوێندراوەیە، مرۆڤ دەتوانێت تەلیسمی دەستوخەتەکە بشکێنێت و بگاتە ئەو دیو وشەکان و پێکەوە ڕیزیانبکاتەوە و ماناکەیان بدۆزێتەوە. بەڵام لای کیرکجارد بە پێچەوانەوە، تێکستی وجود بە خەتێکی نەخوێندراوە نوسراوە و لە هەر ساتێک و لە هەر گۆشەیەک و لە هەر خوێندنەوەیەکدا مانایەکی هەیە، هیچ سیستمێکی گەورە و داخراویش نییە بتوانێت هەموو خوێندنەوەکان لە خۆیدا کۆبکاتەوە. هیگڵ لەم خاڵەدا سەر بەو خەتە گشتییەی

فەلسەفەی ڕۆشنگەرییە کە باوەڕی وەهایە عەقڵ دەتوانێت هەموو نهێنییەکانی جیهان بشکێنێت، کوڕی ئەو کولتوورەیە کە لەسەرەتاوە وادەبینێت کتێبی سروشت بە زمانێکی ماتماتیکی نوسراوە و دەکرێت بخوێنرێتەوە. بەڵام بۆچوونەکەی کیرکجارد نیوەی دینی و نیوەی فەلسەفییە و دوو دەرەنجامی جیاوازیشی لێدەکەوێتەوە، نیوە دینییەکەی لەو بۆچوونەوە سەرچاوەی گرتووە کە توانای ئینسان بۆ دەرککردنی نهێنی وجود سنوردارە، نیوە فەلسەفییەکەشی پەیوەندی بەوەوە هەیە کە حەقیقەتێکی گەورە یان مانایەکی گەورە لە پشت بوونەوە نییە تا بیگرین و بیدۆزینەوە. بەڵام لەسەر ڕۆشنایی ئەم جیاوازییە، خودی مانا و وەزیفەی فەلسەفەش دەکەوێتە بەر دوو ئاراستە و ژێر دوو تێگەیشتنی تەواو جیاوازەوە، یەکێکیان فەلسەفە وەک هونەری بیرکردنەوە لە جیهان تەماشادەکات، واتە بە کاری فەیلەسوفی دەزانێت ئەو شتانەمان بۆ دیاریبکات کە دەبێت دەربارەی ژیان و بوون بیزانین... هیگڵ دەکەوێتە ژێر ئەم خانەیەوە، چونکە لە جەوهەردا فەلسەفەی هیگڵ، فەلسەفەی تێڕامانە لە سیستمی پێکڕای وجود. کیرکجاردیش بە پێچەوانەوە دەکەوێتە ژێر خانەی ئەوانەوە کە وادەبینن ئیشی فەلسەفەیە پێمانبڵێت چی بکەین نە وەک ئیشی ئەوە بێت پێمانبڵێت دەبێت چی بزانین. گەیشتن بە یەقین لە ئاستی زانیندا لای کیرکجارد مەحاڵە، بەڵام مرۆڤ دەبێت لەوە ڕامبێنێت لە جیهانێکدا کە دڵنیایی تێدا نییە چی بکات. ئەو دەنوسێت «من دەمەوێت لەو ڕووەوە بەرچاوم ڕوونبێت کە چی دەکەم، نەوەک لەو ڕووەوە کە دەبێت چی بزانم». لێرەوە کیرکجارد هەم لای وجودییەکان و هەم لای پۆست مۆدێرنەکان جێگایەکی گرنگ و بەرزی هەیە. بەپێی هیگڵ و قوتابییەکانی کۆی مرۆڤایەتی دەتوانێت لە دەوری پرۆژەیەک کۆببێتەوە و پێکڕا بۆ یەک پاشەڕۆژی هاوبەش و یەک خۆری ڕزگاری بگەڕێن، بەڵام لای کیرکجارد مرۆڤ هەمیشە لە

نێوان کۆمەڵێک هەڵبژاردن و ئەگەر دایە «ئەم... یان ئەو»... لێرەوە گیرکردنی مرۆڤەکان لەیەک هەڵبژاردنی سەرتاسەردا نامومکینە.

ئەمرۆ دوای مێژوویەکی درێژ دەبینین، ئەو ڕێبازانەی دواتر لە بواری فەلسەفە و هونەردا دێنە پێشێ پتر لە ڕۆحی کیرکجاردەوە نزیکن نەوەک هیگڵ... لە ئەدەب و نیگارکێشانیشدا، گومان و ترس و پێکەنینی کیرکجارد پتر لە ڕۆحی سیستەمپەرستی هیگڵی باڵادەست و سەرکەوتووبووە، لە کاتێکدا ڕۆحی هیگڵ هێشتا لە سیاسەت و ئیدارە و ئابووریدا بەردەوام ئیشدەکات و لە خولیای دروستکردنی سیستمی گەورە و داخراودایە. دواجار پێشدەچێت ئەمە دابەشبوونێکی هەمیشەیی بێت کە هەر سەردەمە و هەر کۆمەڵگایە بەشێوەی خۆی تێیدا بژی و دووبارەبیکاتەوە.

# لە جەنگی وێنە و واقیعدا

## «سێ نموونە»

چەند ساڵێک لە مەوبەر لە یەکێک لە ناوچە سنوورییەکانی کوردستان، کچێک بە ناوی دۆعاوە کوژرا، ڕوداوەکە و پەرچەکردارەکانی دوای ئەو ڕووداوە تائێستا لە یادەوەری زۆربەماندا پارێزراون، کوشتنەکە جۆرە هیستریایەکی دەستەجەمعی تاقمێک لە تیرۆریستەکانی ئەخلاق بوو، پێش کوشتنی دۆعا تیرۆریستەکانی ئەخلاق لە کۆمەڵگای ئێمەدا سەدان و بگرە هەزاران کەسیان کوشتبوو، دوای کوشتنی دۆعا و تائەمڕۆش تیرۆریستەکانی ئەخلاق هەمان کاردەکەن، بەڵام هیچیان وەک ڕووداوی کوشتنی دۆعا توڕەیی و نارەزایی کۆمەڵایەتی دروست نەکرد.

لای من، پرسیاری ئەو کات و ئێستاشم ئەوەیە: ئاخۆ ئەو توڕەبوونە دەرهەق بە کوشتنی دۆعا، نیشانەی زیندووبوونەی ویژدانی ئێمە بوو، یاخود نیشانەیەکی تری مردنی ویژدان بوو لە کۆمەڵگای ئێمەدا.

ڕووداوی کوشتنی دۆعا ساتێکی ڕەمزی گرنگە لە پێکهاتی کولتووری کۆمەڵایەتیماندا. کوشتنەکەی دۆعا، دەکەوێتە پێش سەدان کوشتنەوە کە وەک کوشتنی دۆعا ترسناک و ناشیرینن، دەکەوێتە دوای دەیان کوشتنی دیکەشەوە... ئەوەی وایکرد کوشتنی دۆعا کاریگەر بێت، ئەو وێنانەبوو کە لە ساتی کوشتنیدا گیران، قارەمانی سەرەکی ڕووداوەکە ئەو وێنەگرەیە

کە لە ناو هیستریا و توڕەیی فانەتیکەکانی ئەخلاقدا وێنەی تاوانەکەی گرتووە. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە «ئاخۆ ئەوەی ئێمە دەجوڵێنێت خودی ڕووداوەکەیە یان وێنەکانە؟». مێژووی ئێمە پڕە لە ڕووداوی کوشتنی لەوجۆرە، کۆمەڵگای ئێمە پڕە لە تیرۆریستی گەورەی ئەخلاق، کە بە ناو کۆمەڵگا و ژیاندا دەگەڕێن، بۆسەی جۆراوجۆر بۆ نێچیرەکانیان دادەنێن، بەلەزەتێکی نەخۆشانەوە خۆیان بە مۆرالیست و ئەوانی تر وەک بێئەخلاق وێنادەکەن. تیرۆریستەکانی ئەخلاق لە هەموو جێگایەکن، لە هەموو ماڵێکدان... بەڵام هیچمان تیا دروست ناکەن، لەگەڵماندا دەژین و خۆیان بە پارێزەری ئەخلاق دەناسێنن، ئەوەی تاوانبارەکانی دی بە بەرد یان گوللە دەیکەن هەندێکیان بەقسە و نوکتە و نوسین و توانج دەیکەن، بەشێکی پێکهێن و گرنگی دونیای ئێمەن... ویژدانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەدەبیمان کێشەیەکی زۆر گەورەی لەگەڵیاندا نییە، بە پێچەوانەوە هەتا بەجۆرێکی بەربڵاو دیوە نەرم و ناسکەکەی ئەم تیرۆرە ئەخلاقییە لای هەموانەوە قەبوڵدەکرێت و دووبارەدەکرێتەوە و پشتگیری لێدەکرێت. ساتی کوشتنی دۆعا ساتێکی ڕاچڵەکانی ویژدان نەبوو، ساتێکی هوشیاربوونەوە نەبوو بەرامبەر واقیع، بەڵکو ساتێکە تێیدا وێنە و کاریگەرییەکانی لە کولتووری ئێمەدا سەربەخۆییەکی گەورە لە سەرچاوە واقیعییەکەی وەردەگرن. ئەوەی خەڵکی تورەکرد وێنەکان بوون، نەوەک ئەو تیرۆرە ئەخلاقییەی کە دوای کوشتنەکەش هەر لە جێگای خۆیەتی و بێ هیچ ڕەخنەیەکی جیدی، بێ هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی چالاکانە، لە هەموو لایەکەوە، لەلایەن زۆرینەوە، بەشێوەی جۆراوجۆر، بەزمانی جۆراوجۆر دووبارەدەکرێتەوە. واتە ئەو هەژانە ویژدانییە، ئەو هەڵچوونە عاتیفییەی کە دوای کوشتنی دۆعا هەموو لایەکی گرتەوە، قەت نەبووە هەژانێکی ویژدانی و توڕەبوونێک لە کولتووری ئەخلاقی ئێمە. دونیای وێنەکان وەک ئامارەیەکی جیا و دابڕاو بۆ تاوانێک، نەبوو بە کەرەستەی

ڕاچەنینێکی ئەخلاقی لە واقیعدا، تووڕەیی دەرهەق بە تاوانبارانی وێنەکە قەت نەبووە تووڕەیی دژ بە تاوانبارانی هاوشێوەیان لە واقیعدا. ئەوەی ئێمەی هەژاند تاوانی ناو وێنەکە بوو، نەوەک خودی تاوانەکە... هەموو تاوانێک دەبێت ببێتە بە وێنە، گەر نەبێت بە وێنە و نەچێتە سەر فۆتۆ و نەبێتە فیدیۆ و لە میدیاکان و ئینتەرنێتدا دانەبەزێت تاوان نین، ویژدانی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و ئەخلاقیمان ناجوڵێنن. ئەوەی هەژان دروستدەکات وێنەیە نەوەک واقیع... ئەوە ئەو ساتەیە کە ژمارەیەکی زۆر گرنگ لە فەیلەسوفانی هاوچەرخ ئاماژەی پێدەدەن و ئاگادارماندەکەنەوە، ساتی هەرەسهێنانی واقیع و باڵادەستبوونی وێنە. ئەو ساتەی تێیدا «دونیای وێنە» دەبێتە هێزێکی سەربەخۆ و تایبەت، دەبێتە دونیایەک تێکشکێن بۆ هەستی واقیعیمان و بەجۆرێک لە جۆرەکان ژیانی ڕاستەقینەمان لە بیردەباتەوە. لەو فەیلەسوفانەی بەچڕی کاریان لەسەر جیابوونەوەی نێوان دونیای وێنە و واقیع کردوە و ئەم جیابوونەوەیە بە سیفەتی سەرەکی سەردەمی میدیا و دیگیتال دەزانن، کەسانی وەک «ولیام فلوسەر، ژان بۆدریار، پۆل ڤیرلیۆ» ن.

گەر کوشتنی دۆعا نەبووایە بە وێنە، کاریگەری واقیعی ڕووداوەکە وەک هەزاران ڕووداوی تر تێدەپەڕی و هیچی دروست نەدەکرد... تووڕەبوونی کۆمەڵایەتی ئێمە دەرهەق بە کوشتنی دۆعا، نیشانەی هوشیاربوونەوەی ئەخلاقی ئێمە نییە، بەڵکو ساتی درزبردنێکی قووڵی ئەخلاقە... ساتێکە تاوانەکان چیتر خۆیان نامانهەژێنن، بەڵکو وێنەکانی دەمانهەژێنن، ناتوانین لەگەڵ تاوانبارانی ناو وێنەکاندا هەڵبکەین، بەڵام دەتوانین لەگەڵ تاوانبارە ڕاستەقینەکانی تردا لە واقیعدا بێ کێشە و گرفتێکی گەورە بژین. لێرەدا پەرچەکرداری ئێمە بەرامبەر ئەوەی لە وێنەدا دەیبینین جۆرە پەرچەکردارێکی جیاوازترە لەوەی لە واقیعدا دەیبینین، لێرەدا مۆرالیستەکانی وێنە لە مۆرالیستەکانی واقیع دەترازێن

و دەبنە شتێکی تر. لەساتی کوشتنی دۆعادا تاوانباران هێشتا بکوژی واقیعین، بەڵام مۆرالیستەکانی مۆرالیستی سەردەمی دیگیتالن، کۆمەڵێک مۆرالیستن پێویستیان بە دۆکۆمێنت و بەڵگەی وێنەدار هەیە بۆ ئەوەی هەستی ئەخلاقیان بجولێت، تورەبوونیشیان لە سنووری تورەبوونی ناو میدیا تێناپەڕێت... ئەو ساتە ساتی دابڕانێکی قووڵە لە نێوان وێنە و واقیعدا، ساتێکە تێیدا وێنە دەتوانێت وەک یەکەیەکی سەربەخۆ، وەک واقیعێکی دووەم، وەک شوێنێکی دابڕاو کە بە هۆیەوە مرۆڤ واقیع لە بیردەکات بێتەمەیدان... لە ڕووداوی کوشتنی دۆعادا ئەو ڕاستییە ترسناکە دەدۆزینەوە ئەوەی لە وێنەدا نەبێت لە ویژدانیشدا نییە، لێرەوە کاریگەری ئەنفالەکان لەسەر ئێمە «ژنان و پیاوانی سەردەمی باڵادەستی وێنە و میدیا» تابڵێی بچوکە، چونکە وێنەمان لەسەر ئەنفالەکان نییە. کوشتنی مرۆڤێک لە وێنەدا ئێستا زۆر کاریگەرترە لە کوشتنی میللەتێک لە واقیعدا... ئەوە دیوە ترسناکەکەی سەردەمی باڵادەستی وێنەیە کە ویژدانی واقیعی ئینسان دەمرێت و ویژدانێکی دەستکرد دروستدەبێت کە تەنیا لە ژێر کاریگەریی وێنەدا هەڵوێست وەردەگرێت، کاریگەری وێنە دەیجولێنێت نەوەک کاریگەریی تاوان. گەر تەماشابکەین تاوانێکی وەک هۆلۆکۆستیش تاوانێکە «بێ ـ وێنە»، واتە ژمارەیەکی زۆر ناچیز و کەم دۆکۆمێنتی وێنەییمان دەربارەی هۆلۆکۆست لەبەردەمدایە، بەڵام لە چەند ساڵی ڕابووردودا جووەکان لەو ڕاستییە تێگەیشتن، ئەوەی لە وێنەدا نەبێت لە ویژدانیشدا نییە، لەبەرئەوە ئێستا بێشومار فیلمی گەورە لەسەر هۆلۆکۆست دروستدەکرێت. هۆلۆکۆستیش خۆی بۆ خۆی چیتر کاریگەری دروست ناکات، بەڵکو پێویستی بەوەیە لە وێنە بنرێت... ئەوەی لە وێنە نەنرابێت، وەک ئەوەیە نەبووبێت و ڕووی نەدابێت.

***

کەدوای حەفدەی شوبات گەڕامەوە بۆ کوردستان و چوومە مەیدانی

ئازادی، شتێک لەساتی یەکەمەوە سەرسامیکردم ئەو ژمارە زۆرەی کامێرابوو کە لە مەیدانەکەدا بوو، لە مەیدانەکەدا کردەی وێنەگرتن و کردەی شۆڕش بە جۆرێکی دراماتیکی تێکەڵ بە یەک بووبوون. هەموو لەوێ کامێرایان پێ بوو، هەموو لەوێ وێنەیان دەگرت، هەموو چاوەڕوانی دیمەن و نیگارێکی ناوازەبوون. بەجۆرێک ئەو پرسیارە دروستدەبوو خەڵک لێرەن بۆ ئەوەی شۆڕش بکەن یان وێنەبگرن. ئەوانەی لەوێ بوون وێنەگربوون یان شۆڕشگێڕ یان هەردووکیان؟... ئاخۆ چۆن دەکرێت لەویادا پەیوەندی نێوان وێنە و شۆڕش بخوێنینەوە. ئەوەی ڕووداوی حەڤدەی شوبات لە ڕووداوەکانی تر جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە ڕووداوێکی وێنەییە، گەورەیی ڕووداوەکە لەسەر ویژدانی سیاسی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕووداوێکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی و لە زۆر گۆشەوە وێنەی گیراوە. پێشتر لە مێژووی ئێمەدا ڕووداوێکی تری وا گەورە نییە کە تەواو بە جۆرێکی فرەلایەنە و لە هەموو دووری و نزیکییەکانەوە و سات بەسات وێنەی گیرابێت. تاوانبارەکان دیارن، جوڵە و هاتوچۆ و ئاماژەکانیان ئاسان دەخوێنرێتەوە، قوربانییەکانیش دیارن، قوربانییەکان بە ژمارە زۆرن، بەڵام تەنیا ئەوانە کاریگەرییەکی ڕاستەقینە لەسەر ویژدانی سیاسیمان جێدەهێڵن کە وێنەگرەکان فریاکەوتوون و گرتوویانن... لەساتی یەکەمەوە ئەو هەستە دروستدەبێت کە ئەوەی کامێرا نەیگرێت، ڕووی نەداوە.. ئەوەی وێنەکەی لە ئینتەرنێتدا نەبێت، لە مێژووشدا نییە، لە ویژدانی خەڵکیشدا نییە، لە یادەوەریشدا هەڵناگیرێت. لە ساتی یەکەمەوە کردەی وێنەگرتن ڕەهەندێکی شۆڕشگێڕانە وەردەگرێت، لێرەشدا هەمان یاسای پێشوو ئیشدەکات، کە لە کوشتنی دۆعادا بینیمان، ئەوەی وێنەی نەگیرابێت نەبووە، تەنیا ئەو شتانە ڕوودەدەن و دەبن بە فاکتەری کاریگەر کە دەبن بە وێنە. ئەوە هەڵبەت بەرەو دەرەنجامێکی تراژیدیمان دەبات، گەر کامێرا نەبێت شۆڕشیش نییە، واتە

خـودی ڕووداوە واقیعییـەكان ئـەو هێـز و دینامیكییەتـە لەدەسـتدەدەن كـە خـۆ بەخـۆ ببـن بـە ڕووداوی مێژوویـی گـەورە و گرنـگ، هەمـوو ڕووداوەكان وەک ڕووداوێكـی گەمـارۆدراو و سـنووردار لـە شـوێن و كاتـدا دەمێننـەوە، هەمـوو ڕەهەندێكـی مێژوویـی و یۆنیفرسـالی وندەكـەن گـەر نەبـن بـە وێنـە. لێـرەدا مـن تێبینییەكـی تایبەتیـم لادروسـتدەبێت «ئـەوەش ناشـارمەوە كـە لـە ژێـر كاریگـەری خوێندنـەوەی فەیلەسـوفێكی وەک بۆدریـار دا ئـەوەم لادروسـتدەبێت». تـەواوی حاڵەتەكـە وادەبینـم وەک ئـەوەی ئـەو كامێـرا مێژووییـەی كـە لـە بـاڵاوە ڕووداوەكان وەک یـەک یەكـە دەگرێـت، وەک زنجیرەیەكـی نەپچـڕاو مانـا و لۆژیكیـان پێدەبەخشـێت. ئـەو كامێـرا گەورەیـە كـە لەسـەردەمانی پێشـوودا بـێ هیـچ وێنەیـەک هەسـتی مێژوویـی خولقانـدوە، شۆڕشـی دروسـتكردوە، لێـرەدا وردەبێتـەوە و دابەشـدەبێت و دەبێـت بـە ژمارەیەكـی زۆر لـە كامێـرا، وەردەگەڕێتـە سـەر بێشـومار وێنـە، لە ڕووداوێكـی مێژوویـی یەكانگیـرەوە كـە مانـای خـۆی لـە ڕەوتێـک و وێنەیەكـی پانۆرامـی گشـتییەوە وەردەگرێـت، دادەبەزێتـە سـەر كۆمەڵێـک دیمـەن، یـان وەک فۆتۆگرافەكانـی لای خۆمـان دەڵێـن دادەبەزێتـە سـەر كۆمەڵێـک «لەقتـە». لێـرەدا كێشـەكە تەنیـا ئـەوە نییـە كـە وێنـە، واقیعێكـی دووەمـی پارچەپارچەمـان بـۆ دروسـتدەكات كـە تێیـدا جەوهـەری شـتەكان و ڕووداوەكان دەكشـێنە دواوە و شـوێنێكی لاوەكـی وەردەگـرن، بەڵكـو كێشـەكە لەوەدایـە كـە شـەهادەتی وێنەگـر شـوێنی شـەهادەتی مێژوویـی دەگرێتـەوە و فۆتۆگرافـەر شـوێن بـە هەمـوو جـۆرە شـاهیدەكانی تـر لەقـدەكات. واتـە لـەو جێگایـەدا كـە كامێـرا و تەلەفزیـۆن نەمـان، شـۆڕش دەمرێـت. لـەم كولتـووره نوێیـەدا شۆڕشـگێڕ ئـەوە نییـە كـە بیردەكاتـەوە، كـە لـە پشـتەوە لەسـەر بونیـادەكان ئیشـدەكات، میتـۆدەكان نوێدەكاتـەوە، گۆشـەنیگای تـازە دەخولقێنێـت، بەڵكـو ئەوەیـە كـە لـە وێنەكانـدا دەردەكەوێـت، ئەوەیـە كـە تەلەفزیۆنـەكان وەک شۆڕشـگێڕ پێشكەشـیدەكەن. واتـە بەمانایـەک لـە

مانـاکان، کامێرامـان و فۆتۆگرافـەکان مێـژووی شـۆڕش دەنوسـنەوە، کـە حەتمەن مێژوویەکی تەریب و دووهەمە و پەیوەندییەکی وردی بە مێـژووی واقیعییـەوە نییـە. ترسناکترین دەرەنجامی ئـەم دیاردەیـەش ئەوەیە، شـۆڕش لـەوە دەکەوێـت دەسـتبردنێکی قـووڵ بێـت بـۆ سـتراکتوری واقیعـی یەکـەم، واتـە واقیعـی کۆمەڵایەتـی و مێژوویـی و دەبێـت بـە ئامادەبـوون لـە واقیعـی دووەمـدا، کـە واقیعێکـی فۆتۆگرافـی و تەلەفزیۆنـی و فیدیۆییـە. لێـرەدا کامێـرا تەنیـا توانـای دەسـتبردن بـۆ قووڵایـی واقیعـی مێژوویـی لاواز نـاکات، بەڵکـو توانـای بەرهەمهێنانـی ژمارەیـەک زۆر شۆڕشـی وەهمـی و شۆڕشـگێڕیی وەهمیـش دەسـازێنێت. بـە هـۆی ئـەم واقیعـە تازەیـەوە وەهمێکـی ترسـناک سـەرهەڵدەدات کـە بەڕاسـتی پێویسـتی بەچارەسـەر هەیـە، شـۆڕش لەواقیعـی دووهەمـدا «واقیعـی وێنەیـی» دەبێتـە ئەلتەرناتیڤـی شـۆڕش لـە واقیعـی کۆمەڵایەتـی و مێژووییـدا. مـرۆڤ شـۆڕش نـاکات بۆئـەوەی جیهـان بگۆڕێـت، بەڵکـو بۆئـەوەی خـۆی لـە وێنەکانـدا ببینێتـەوە.

***

ئـەو سیاسـییەی فەرمانـی سـووتاندنی کەناڵی تەلەفزیۆنـی نالیای دەرکرد، هـەر کەسـێک بێـت، بەجۆرێـک لەجـۆرەکان دەچێتـە نـاو مێـژووی کولتـووری کوردییـەوە. ئـەوە یەکەمیـن سیاسـی کـوردە لـە بـری ئـەوەی راسـتەوخۆ لـە ڕووداوەکان بترسـێت، لـە وێنـەی ڕووداوەکان ترسـاوە، لەبـری ئـەوەی لـە بکـەری ڕووداوەکان بترسـێت لـە وێنەکانیـان سـڵیکردۆتەوە. ئـەوە یەکەمجـارە وێنـەی شۆڕشـگێڕ لـە خـودی شۆڕشـگێڕ ترسـناکتر بێـت، شۆڕشـگێڕ خـۆی بەسـەلامەتی بسـووڕێتەوە، بـەڵام وێنەکانـی و ئـەو ئامێرانـەی وێنەکانـی پەخشـدەکەن بسـووتێنرێن. لای ئـەم سیاسـییە شـۆڕش لـە واقیعـی یەکەمـدا «لـە مەیدانـی ئـازادی»، بـە ئەنـدازەی شـۆڕش لـە واقیعـی دووەمـدا «واقیعـی میدیـا و وێنـە» گرنـگ نییـە. ئـەم سیاسـییەش لـە هەمـان بازنـەی ئـەو

كولتووره نوێیەدا دەسوڕێتەوە، لەبری ئیشكردن لەسەر واقیعی یەكەم، زەمین و زەمانێكی دووەمی دۆزیوەتەوە كە ئیشی لەسەر دەكات، كە واقیعی وێنەیی دووهەمە، پەلاماردانی میدیا دەبێتە جێگری پەلاماردانی واقیع. لەبری ئەوەی دەست بۆ كێشە سیاسی و مێژووییە ڕاستەقینەكان بەرێت، ڕاستەوخۆ دەست بۆ واقیعی دووهەم دەبات، بۆ تێكشكاندنی ئەو وێنانەی لە وێدا لەسەر ئەو بڵاودەبنەوە. ئەویش بەو كردارەی خەرەندی نێوان واقیع و وێنەكانی پلەیەك قووڵتر دەكاتەوە، بەوە ئەو دابەشبوونە زیاتر دەسەلمێنێت كە لەسەر جیابوونەوەی واقیع و وێنە یان حەقیقەت و وێنە دامەزراوە. لە هەموو ئەم دۆخانەشدا یەك پەیام بە ئێمە دەگات كە قورسایی واقیعی ڕاستەقینە تا دێت لەبەردەم هێزی وێنەدا پاشەكشە دەكات. ئەوەی مرۆڤ دەجوڵێنێت و دەیخاتە سەر ئارەزووی كردار ئەو ڕووداوانە نین كە لە واقیعدا ڕوودەدەن، بەڵكو ئەو ڕووداوانەن كە دەبن بە وێنە و وێنە دەیانڕازێنێتەوە و وێنە مانایان دەداتێ و وێنە دەیانگوازێتەوە. ئێستا بە هەر لایەكدا بڕۆین، كەم و زۆر هێزی واقیعییانەی مرۆڤ و كاریگەری ڕاستەوخۆی ژیان بەبێ تێپەڕین بە میدۆمی وێنەدا بەرەو مردن و لاوازیی دەڕوات. ئاخۆ ئەوە سەرەتای سەردەمی لە ناوچوونی شتە كۆنكرێت و مەترياليیەكانە بەرەو سەردەمی وێنە و نیگاری ڕووت، یان سەردەمی هەرەسی كولتووری نوسینە لەبەردەم كولتووری وێنەدا «وەك ولیام فلوسەر دەڵێت»؟ .

# نوسەر و بوکەشوشەکان

لە کتێبی «ڕابێلییە و جیهانەکەی»دا، کە لە نوسینی ڕەخنەگری ڕوسی میخائیل باختینە. فەسڵێک هەیە بە ناوی «ڕابێلییە و مێژووی پێکەنین». لەوێدا باختین ئاماژە بۆ کێشەیەکی گرنگی مێژووی خوێندنەوەکانی ڕابێلییە دەکات. ڕابێلییە کوڕی سەدەی شازدە بوو، هاوشان لەگەڵ سێرڤانتسدا بە باوکی هونەری ڕۆمان دادەنرێت، لەسەردەمی خۆیدا ناوبانگێکی گەورە پەیدادەکات، بەجۆرێک وەک باختین باسی لێوەدەکات، کاریگەری ڕابێلییە لە سنووری ئەدەبیات تێدەپەڕێت و دەبێتە کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆ لەسەر فەیلەسوفان و سیاسەتمەدارانی سەردەمی خۆی. هەموو ئاماژەکان ڕوو لەوەن کە کتێبەکانی ڕابێلییە لەسەدەی شازدەدا بە جۆش و خرۆش و ئارەزوویەکی زۆرەوە خوێندراونەتەوە، خوێنەرانی ئەو سەردەمە لەزەتێکی زۆریان لێبینیوە، بابەتی قسە و پێکەنینی بەردەوامیان بووە، بەڵام وەک باختین ئاماژەی پێدەکات، لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری سەدەی حەڤدە و هەژدەدا، خۆری ڕابلییە کەم و زۆر ئاوا دەبێت، لە سەدەی حەڤدە بە دواوە جۆرە خوێنەرێک سەرهەڵدەدات کە چیتر لە ڕابێلییە تێناگات، تێکستەکانی دەبنە دەقگەلێکی سەیر کە پێکەوەگرێدانی بەشەکانی و کۆکردنەوەی تەوەرەکانی بۆ خوێنەرە تازەکانی سەدەی نوێ کارێکی زەحمەتە، ئەوەی خوێنەران لە سەدەی شازدەدا وەک بەڵگەنەویست وەریاندەگرت، وەک شتێکی ڕاستەوخۆ کە

پێویستی بە ڕوونکردنەوە و تەفسیر نییە، لە سەردەمەکانی تردا تەواو دەگۆڕێت، ئەو یەکێتییە ناوەکییەی خوێنەرانی سەدەی شازدە لە نوسینی ڕابێلییەدا دەیانبینی بەسەردەچێت و ڕابێلییەیەکی تر سەرهەڵدەدات کە خوێنەر ناتوانێت پەیوەندی نێوان بەشەکان و مانای ڕستەکان و واتای پشت میتافۆرەکانی تێبگات.

لە ئەدەبی کوردیدا ئێمە دۆخێکی هاوشێوەمان هەیە، گواستنەوە لە سەدەی نۆزدە وە بۆ سەدەی بیست، وادەکات تێگەیشتن لە شاعیرێکی وەک مەحوی بۆ ئێمە کارێکی زەحمەت بێت، لەسەدەی بیستدا تەواوی ئەو بونیادە فەرهەنگییەی تێکستەکانی مەحوی لە ناویدا گەورەبووە لە بەیندەچێت، ئەو ژێرخانە مەعریفییەی پێویستە بۆ ئەوەی لە مەحوی تێبگەین بوونی نامێنێت، خەڵکانێکی دی و خوێنەرانێکی تر لەدایکدەبن، بە خەیاڵێکی تر و بە ژێر خانێکی مەعریفی جیاوازەوە، بەجۆرێک مەحوی بۆ ئێمە دەبێتە کەسێکی دوور و نامۆ، کە بەبێ کۆمەکی کەسێکی شرۆڤەکار کە شارەزای هەمان ژێرخانی مەعریفی کلاسیکی بێت، تێگەیشتنی ئەستەمە.

ئەوەی باختین دەرهەق بە ڕابێلییە دەستنیشانیدەکات، دیاردەیەکی بەرچاوی مێژووی ئەدەبە، هەرکات کە لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەگوازینەوە تێکستەکان شتێک لە مانای خۆیان دەدۆڕێنن و بڕێک لە واتاکانی سەرەتایان لە دەستدەدەن، وێنەسازیی و خەیاڵبازییەکەشیان لە سەردەمانی دواتردا ئاسان شرۆڤە ناکرێت و ناخوێنرێتەوە، بەجۆرێک خۆ بە خۆ تێگەیشتن لێیان دەبێتە کارێکی زەحمەت. بەڵام گۆڕین لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر، واناکات تەنیا لە نوسەران نەگەین، بەڵکو لە ڕاستیدا دەیانکات بە کەسێکی تر، شتێکیان دەخاتە زار کە خۆیان نەیانویستووە بیڵێن، لە جێگایەکەوە دەیانخوێنێتەوە کە جێگای ئەسڵی ئەوان نییە. ئەوەی باختین لای ڕابێلییە بەوردی دەستنیشانیدەکات،

تەنیا شێوەیەکە لە شێوەکانی تێنەگەیشتن لە تێکست. ئەوەی تێکست بە حوکمی ئاڵوگۆڕی سەردەم و کولتوور و زەمەنەکان شتێک لە مانا بنەڕەتییەکانی خۆی دەدۆڕێنێت، تەنیا بەشێکی دوورکەوتنەوەی تێکستە لە مانای خۆی. نوسەران بەدرێژایی مێژوو لەوە ترساون کە خوێنەران تێیان نەگەن. «مەسەلەی تێنەگەیشتن» مەسەلەیەک نییە تەنیا گرێدراوی چارەنوسی تێکست بێت لە ناو زەمەندا، واتە کێشەکە ئەوە نییە کاتێک لە سەدەیەکەوە هەنگاو بۆ سەدەیەکی دی دەنێین، تێکستەکان لەو کاری ئاڵوگۆڕەدا ژێرخانی خۆیان لەدەستبدەن و فەزای کولتووری خۆیان بدۆڕێنن، بەڵکو کێشەیەکی ئاڵۆزترە، کێشەکە ترسێکی قووڵ دەجۆشێنێت، کە ترسی ئەبەدیی نوسەرانە لەوانەی کە تێیان ناگەن.

گەر تەماشابکەین، کێشەکەی ڕابێلییە بەراورد بە گرفتی تێنەگەیشتن لای نوسەرانی مۆدێرن، ناچیز و بچوکە... ئەوەی تەنیا خوێنەرانی سەردەمێکی تر تێتنەگەن ئاسانترە لەو هەستەی کە خوێنەران بە گشتی، لە ئێستا و لە سبەی و لە داهاتووی دووریشدا تێتنگەن. شوپنهاوەر بە قووڵی تەعبیری لەو دۆخە تراژیدییەی نوسەر کردوە، ئەو لە وتەیەکیدا کە زۆرجار بە نمونە دەهێنرێتەوە، دۆخی خۆی و خوێنەر بە دۆخی منداڵ و بوکەشوشەکەی دەشوبهێنێت، لە کاتێکدا منداڵەکە دەزانێت بوکەشوشەکەی تێیناگات، بەڵام هەر قسەی بۆدەکات، بە بێنیگەرانی و بەمەبەست خۆی دەخەڵەتێنێت و لەسەر ئەو بڕوایە سووردەبێت کە شتێکی گەیاندووە و بوکەشوشەکە تێیدەگات.

ئەو دۆخەی شۆپنهاوەر باسیدەکات زۆر تراژیدییە، کاتێک نوسەر دەزانێت ئەوانی تر تێیناگەن، بەڵام دەبێت وابکات وەک ئەوەی ئەوانی دی تێیدەگەن، ئەوە بخاتە خەیاڵی خۆیەوە کە ئەوانی تر تێیدەگەن، بەردەوام بێت لەسەر قسەکردن وەک ئەوەی ئەوانی تر حاڵی بن و

کێشەیان لەگەڵ ئەودا نەبێت، گەر ئاماژە و نیشانەیەکی ڕوونیشی بینی پێیبڵێت کە ئەوانی دی تێیانگەن، فەرامۆشیبکات و بەردەوام بێت و هەروا تێپەڕێت وەک ئەوەی ئەوانی تر تێیدەگەن.

ئەم هەستە تراژیدییە قووڵە کە هاوشانی گەشەی ڕۆحی هەموو نوسەرێکی ڕاستەقینەیە، لە هەندێ جێگادا دەبێتە خولیای سەرەکی نوسەران، نوسەرانی جیاواز جیاواز چارەسەری جیاوازیان بۆ ئەم گرفتە هەیە، بە چەشنێک زۆرجار یاریکردن لەسەر تەوەری تێگەیشتن دەبێتە یەکێک لە خولیا گەورەکانی ئەدەب. وەک چۆن دواتر دەبێت بە خولیای هەرە سەرەکی و گەورەی فەلسەفە و ڕەخنەی ئەدەبیش، دەبێتە سەنتەری هەرە گەورەی کۆمەڵێک بزاوتی فەلسەفی، لەوانە «هێرمۆنتیک» و «لێکترازانسازی ـــ دیکۆنستراکشن»... بەڵام لێرەدا مەبەستم نییە شتێک لەسەر زانستی تێگەیشتن و فەلسەفەی تێگەیشتنی ئەدەبی باسبکەم، بەڵکو مەبەستمە شتێک لەسەر تێنەگەیشتن وەک جۆرێک لە ئازار و جۆرێک لە «هوشیاریی غەمگین» لە ئەزموونی نوسەر خۆیدا بنوسم.

هەموو دەزانین کە مالارمێ، لە پێشەنگی ئەوانەدا بوو کە «مانا» ی لە شیعردا وەک ڕەگەزێکی لاوەکی دەبینی، واتە لە جەوهەردا «تێگەیشتنی شیعری» بە شتێکی لاوەکی دەبینی، شیعر لای ئەو بۆ ئەوە نییە شتێک بگەێنێت، بۆئەوە نانوسرێت تێیبگەین... ئەو پڕۆژەیەی مالارمێ لە ئەدەبدا سەرەتاکانی دارِشت بەوە کۆتاییهات جۆرە ئەدەب و هونەرێک دروستبن کە «تێگەیشتن» لە نێویدا بابەتی سەرەکی نەبێت... گەر بوکەشوشەکە تێنەگات، بۆ خۆمان بەوەوە سەرقاڵبکەین تێیبگەێنین، بۆ یاری ئازاد و سەربەخۆی خۆمان نەکەین، بۆ خۆمان بە دروستکردنی ماناوە خەریکبکەین، بۆ جۆرە ستاتیکایەک دروست نەکەین کە لەسەر مانا و گەیاندن و تێگەیاندن دروست نەبووبێت. بەهۆی ئەمجۆرە بڕوا و تەفسیرانەوە ئەدەب و هونەر بەگشتی بەرەو جێگایەکی

تاریک و تەمومژاویی و ئاڵۆز دابەزین... تا وایلێهات لەسەدەی بیستدا گەیشتینە سەر جۆرە ئەدەبیاتێک، نوسەرانی دەیانەوێت لە ڕێگای ڕاکردنی خۆویستەوە لە مانا، خۆیان لە کێشەی تێگەیشتن بە دوور بگرن و پێچ بەدەوری گرفتەکەدا بکەنەوە.

نوسەر و شاعیری مەکسیکی ئەکتاڤیۆ پاز لە وتارێکیدا بە ناونیشانی «نیگای ئەسڵی» یەوە دیوێکی تری کێشەکەمان پیشاندەدات، پاز لای «جەیمس جۆیس» جۆرە ستراتیژێکی تری ئیشکردن لەگەڵ مانادا دەبینێتەوە، لە ڕۆمانی «ڕابوونی ڤینێگان» ـی جۆیسدا ڕووبەڕووی کێشەیەکی قووڵی تێگەیشتن دەبینەوە، ڕۆمانەکە یەکێکە لە هەرە ڕۆمانە سەختەکان بۆ تێگەیشتن، بەڵام بەبڕوای پاز کێشەی ڕۆمانەکە ئەوە نییە کە مانایەکی هەیە و ئێمە ئاسان بۆمان ناگیرێت و بۆمان نادۆزرێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە کێشەکە لە یاخیبوون لە ماناوە دروست نەبووە، لە فەقیری واتاوە نەخولقاوە، جۆیس بە پێچەوانەی دادائی و سورریالییەکانەوە لە مانای ڕوون هەڵنایەت، بەڵکو ستراتیژێکی تری هەیە، ستراتیژی زۆرکردنی مانا، بارکردنی هەموو ڕستەیەک بە بێشومار لە ئەگەری مانا، بە گۆڕینی ڕستەکان بۆ مەیدانی پێکدادانی مانا. لێرەدا وەک پاز دەڵێت «هەموو وشەیەک و هەموو ڕستەیەک چەپکێکن لە واتا». واتە کێشەی تێگەیشتن ئەو کات دروستدەبێت کە نوسەر بە زیادکردنی ئەگەرەکانی مانا خۆی لەوە دەدزێتەوە بتوانین بیرکردنەوەی بخەینە ژێر کاتاگۆرییەکی ئامادەوە، ئەمجۆرە تێکستانە لە بنەڕەتدا مانایەکی نەگۆڕیان نییە تا سەردەمێکی تر بێت و بەجۆرێکی دی تێیانبگات، بەڵکو لە بنەڕەتدا وانوسراون بۆ ئەوەی بۆ هەمیشە کراوەبن، لە هیچ ئان و زەمانێکدا شتێکی وا جێگیر نەبەخشن کە وابزانین گەر ئەو واتایەمان دەست نەکەوت، تێکستەکەمان لەدەستداوە... لێرەدا نوسەر مەبەستێکی دیاریکراوی نییە، بەڵکو تەنیا مەبەستی ئەوەیە

پێمانبڵێت هەموو مەبەستەکان مەبەستی ئەون، هەتا ئەگەر ناکۆک و دژ بە یەکیش بن، هەموو ماناکان خواستی ئەون، هەتا ئەگەر لەگەڵ یەکدا ناتەباش بن.

بەڵام لەگەڵ ئەم ڕێگایەنەشدا ڕوویەکی گەورەی کێشەکە وەک خۆی دەمێنێتەوە: نوسەران هەموو وەک مالارمێ ناتوانن پشتبکەنە مانا، وەک جۆیس ناتوانن تۆڕێکی گەورە لە مانای جیاواز بچنن، نوسەران زۆربەیان دەنوسن و تەماحیان لەوەیە یەکێک هەبێت لە ماناکەی ئەوان تێبگات، لایەنی کەم نوسەر تەماحی لەوەیە کە بوکەشوشەکە تێیبگات، تەماحی لەوەیە ڕۆحبکات بە بەری بوکەشوشەکەدا. ئەم تەماحە زۆرجار بۆ دوور دەڕوات، من بەش بەحاڵی خۆم لەو ساڵانەی دواییدا زۆر قسەم لە «خوێنەرێکی ئیدیال» کردوە، هەمیشە ئاواتم بووە خوێنەرێکی ئیدیال بمخوێنێتەوە، دەبێت بڵێم خوێنەری ئیدیال لە بنەڕەتدا زاراوەیەکی ئەمبرتۆ ئیکۆ یە «هەڵبەت لای ئیکۆ خوێنەری ئیدیال مەرجی خۆی هەیە و هەروا لە ڕووتەندا دروست نابێت». گەر خوێنەرێکی ئیدیال نەبێت «کەتەواو پێچەوانەی بوکەشوشەکەی شۆپنهاوەرە» نائومێدی نوسەر دەبێتە دۆخێکی هەتاهەتایی. من لە هەندێ نمونەدا باوەڕم بەو بۆچوونەی ئەمبرتۆ ئیکۆ هەیە کە تێکست وەک «ماشێنێکی تەمەڵ» تەماشادەکات، کە دەبێت «خوێنەرێکی نمونەیی» هەبێت چالاکیبکات، بیخاتە سەر ڕۆحی سەردەم، ماناکانی ئەکتیفبکات، ئیکۆ بەم پرۆسەیە دەڵێت «هەنووکاندن ـ ئەکتوالیزیرن». تەنیا خوێنەرێکی زیرەک دەتوانێت ئەو ماشێنە تەمەڵەی کە ناوی تێکستی ئەدەبییە و خۆ بە خۆ هیچ بە ڕوونی ناڵێت و ڕاستەوخۆ هیچ نادات بەدەستەوە، بخاتە ناو جیهانی مەعریفی و عەقڵی ئەم ساتەوە و وای لێبکات ئەو کاریگەرییەی هەبێت کە دەبێت هەیبێت. لێرەدا وەک دەبینین کێشە بنەڕەتییەکە ڕوکارێکی تر وەردەگرێت، لای شۆپنهاوەر کێشەکە بەمجۆرەیە «مانایەکمان هەیە

کە ناگاتە ئەو بوکەشوشە گەمژەیەی کە ناوی خوێنەرە»، بەڵام لای ئەمبرتۆ ئیکۆ کێشەکە پێچەوانە دەبێتەوە «ماشێنێکی تەمەڵمان هەیە کە ناوی دەقی ئەدەبییە، خۆی مانایەکی وەهای نییە و پێویستمان بە خوێنەرە بۆ ئەوەی ئەو مانایەی تیا بچێنێت»... لە هەر دوو حاڵەتەکەشدا ترسی نوسەر لە خوێنەر، لە خوێندنەوەکان، لە تێگەیشتنی ئەوانی دی وەک خۆی دەمێنێتەوە، ترسێکی ئاڵۆز و گەورە، جارێکیان ترسی ئەوەیە خوێنەر هیچ تێنەگات، جارێکی تریش ئەوەیە کە تێگەیشتنێک بسازێنێت تەواو دووربێت لە «نیازی نوسەر» ەوە، واتە خوێنەر تێکستەکە بخاتە سەر مەیل و واتایەک کە خوێنەر خۆی دەیەوێت نەوەک نوسەر. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا بۆ منی نوسەر «تێنەگەیشتن» «دەرەنجامگیریی هەڵە» دوو مۆتەکەی ترسناکن کە بەدوای هەموو کردارێکی نوسینەوەن... ئەم ترسە قووڵە وادەکات بمەوێت سنووری پەیوەندی بە خوێنەرەوە بچوکبکەمەوە، تا بەو کارە مەودا و سنووری ئەو تێنەگەیشتنە کۆنترۆڵبکەم. پاز لە سەرەتای ئەو وتارەیدا کە لەسەرەوە ئاماژەم پێدا، قسەیەکی سەرنجڕاکێشی هێنری میشۆی شاعیر دەگێڕێتەوە . میشۆ لە گفتوگۆیەکدا بە پاز دەڵێت «من سەرەتا دوو سەد نوسخەم لە دیوانێکی بچوک چاپکرد، دواتر ئەو دوو سەد نوسخەیە بوو بە دوو هەزار، ئەمڕۆ نزیکی بیست هەزار چاپدەکەین. هەفتەی پێشوو بنکەیەکی بڵاوکردنەوە پێشنیاری بۆ کردم سەرجەمی کتێبەکانم لە زنجیرەیەکدا کە بۆ کۆ تیراژیان دەگاتە سەد هەزار دانە بڵاوبکەینەوە، من ڕەتمکردەوە، حەزم لێیە بگەڕێمەوە بۆ سەرەتا، بۆ دوو سەد نوسخەکە»، وەک پاز دەڵێت ئەم خولیایەی میشۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی مرۆڤ نەناسراو بێت باشترە لەوەی ناتەواو ناسراو بێت. کەم بخوێنرێیتەوە و تێتبگەن باشترە لەوەی زۆر بخوێنرێیتەوە و تێتنەگەن. لای میشۆ ترس لە ناوبانگێک کە لەسەر تێنەگەیشتن

دروستبوو‌بێت بازدەداتە پێشی پێشەوە، هیچ بەختەوەرییەک لەوەدا نییە بنوسین و بناسرێین و تێمان نەگەن... دواجار بەختەوەری نوسەر نە لەوەدایە بۆ بوکەشوشەکان قسەبکات، نە لەوەشدایە قسەی خۆی لە بەر لۆژیک و نیگا و تێگەیشتنی بوکەشوشەکان بگۆڕێت... چونکە لەم سەردەمەدا مەترسییەکە هەر ئەوە نییە کە بوکەشوشەکان تێمان ناگەن، بەڵکو لەوەدایە کە بوکەشوشەکان دەتوانن ئەو وەهمە لە هەزاران نوسەردا سەوزبکەن، کە ئەگەر هاتوو بەجۆرێکی دیاریکراو بنوسن و قسەبکەن، تێیاندەگەن... ئەوەی بوکەشوشەکان بیرنەکردنەوەی خۆیان بەسەر بیرکردنەوەی ئێمەدا بسەپێنن مەترسییەکی هەمیشەییە. دواجار ڕەنگە زۆر ترسناک نەبێت سەردەمەکانی تر بەجۆرێکی تر بمانخوێننەوە، بەڵام زۆر ترسناکە خواستی نوسەر لە هیچ سەردەمێکدا نەگاتە جێ و بەتەواوەتی ببێت بە ژێر خواستی خوێنەرەوە... نوسەر دواجار کەسێکە کە قسەیەکی هەیە، کێشە نییە لەو قسەیە مانای تر بدۆزینەوە، بەڵام کێشەیەکی گەورەیە نیازی نوسەر هەمیشە و هەمیشە وەک شتێکی پەراوێزیی و بێمانا و دوورەدەست سەیربکەین... بەبڕوای من کێشەی تێگەیشتن، ئەو مۆتەکەیەیە کە لەگەڵ مێژووی نوسیندا سەریهەڵداوە و تا ئەبەد دەمێنێتەوە، نازانم ئاخۆ ستراتیژەکەی هێنری میشۆ «گەڕانەوە بۆ دوو سەد خوێنەری باش» دەتوانێت کێشەکە چارەسەربکات؟... دواجار من وادەبینم کێشەکە نە بەوجۆرەی مالارمێ چارەسەر دەبێت، کە تێگەیشتن نەکەینە کێشەی خۆمان، نە بەوجۆرەی جەیمس جۆیس کە تێگەیشتن وەها فراوانبکەین بە جۆرێک خوێنەر هەر مانایەک وەربگرێت، ئەوە ببێتە مانای نوسەر و یەکێک لە مەبەستە شاردراوەکانی ئەو. خوێنەر مافی خۆیەتی لە مندا ئەوە ببینێت کە ئەو دەیەوێت، بەڵام مافی نوسەریشە بیەوێت هەموو ڕێگایەک بگرێتە بەر ئەو مانایە بگەێنێت کە ئەو دەیەوێت، بەڵام بێئەوەی خیانەت لە قووڵایی گووتە و شێوازی

گووتنەکەی بکات. نوسەر ئەو کەسەیە کە دەیەوێت بەو جۆرە تێیبگەین کە لە نوسینەکانیدا دەردەکەوێت، بەڵام ئەم داواکارییە مەحاڵە... بۆیە ترسی نوسەر لە خوێنەران ترسێکی ئەبەدییە، کە بەبڕوای من زۆر گەورەترە لەو ترسە دێرینەی کە خوێنەران لە نوسەرانیان هەیە. ئەوەی خوێنەر لە نوسەر تێنەگات، ئەو ئازارەی نییە کە نوسەرێک بزانێت، هەموو خوێنەرەکان و لە هەموو سەردەمەکاندا تێیناگەن. بۆیە گەر لە قووڵاییدا بڕوانین نوسین زۆر بە قووڵی بە نائومێدییەوە گرێدراوە... نائومێدییەک کە هەرگیز ناتوانین بیبەزێنین و بەبێ خیانەتکردن لە خود تێیپەڕێنین. خوێنەر گەر بوکەشوشەیەکی گەمژەیە یاخود بوونەوەرێکی نمونەیی و ئیدیال، هەمیشە کاری خۆی لەسەر یادکردن و فەرامۆشکردنی نوسەر بونیاد دەنێت، ئەویش دۆخێکە نوسەر تا سەر ئێسقان ئازار دەدات. ئازاری نوسین تەنیا لەو دوورییەوە نایەت کە لە خوێنەر یان لە ماناکانی جیادەکاتەوە، بەڵکو لە نامۆبوونێکی قووڵترەوە، لەو درزە ئەبەدییەوە دێت کە لە نێوان نوسەر و تێکستەکەیدا دروستدەبێت، نوسەر نەدەزانێت مانای تێکستەکانی لەسەردەمەکانی دیکەدا چییە و نە دەتوانێت بگاتە خوێنەری سەردەمی خۆشی، کارەساتی نوسەر ئەوەیە کە ئەویش دواجار تەنیا یەک خوێنەرە لە خوێنەرەکانی خۆی، یەک خوێنەر و هیچی تر.... نامۆبوونی ترسناکی نوسەر چەندە لە خود و خوێنەرە، هێندەش لە تێکستە کە تادێت لە نوسەر دووردەکەوێتەوە، بەجۆرێک ئیدی رۆژێک تەواو وەک تەنێکی نامۆی لێ دێت.